# رابەری رۆژنامەنووس
# لە جیهانی سێهەمدا


نووسینی

ئەلبرت ل. هستر

وای لان ج. تو



وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە

حەسەن عبدالکریم

## دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **رابەری رۆژنامەنووس لە جیهانی سێهەمدا**
- **نووسینی: ئەلبرت ل. هستر/ وای لان ج. تو**
- **وەرگێڕانی: حەسەن عبدالکریم**
- **نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی**
- **بەرگ: هۆگر سدیق**
- **سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات**
- **ژمارەی سپاردن: ٨٧٧**
- **نرخ: ٢٥٠٠**
- **چاپی یەکەم ٢٠٠٧**
- **تیراژ: ١٥٠٠**
- **چاپخانە: چاپخانەی دەزگای ئاراس (هەولێر)**

**زنجیرەی کتێب (٢٠٦)**





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com


## پێڕست

## پێشکەشکردن

رۆژنامەنووسان لە هەر کوێ کۆ بوونەوە، باس لە پیشەکەی خۆیان دەکەن، ئەوانە کەسانێکن دەیانەوێ پەیامێکی کۆمەڵایەتیی سوودمەند جێبەجێ بکەن، کەسانێکن شانازی دەکەن بەوەوە کە لێهاتوون لە بەکارهێنانی وشەو وێنەدا بۆ ئاگادارکردنەوەی خەڵك لە وڵاتەکەیاندا.

من چەندین رۆژنامەنووسم ناسیوە لە هەموو وڵاتانی جیهاندا پێشکەوتوو و تازەپێگەیشتوو، کە بتوانم بێمە سەر ئەو باوەڕەی ئەوانە کەسانێکی دڵسۆزو خۆبەختکەرن لە کارەکەیاندا. لە گواتیمالا چەندین رۆژنامەنووسم بینیوە، بە چاوی خۆیان بینیویانە هاوکارە رۆژنامەنووس‌و سەرنووسەری رۆژنامەکان لە هێرشی تیرۆریستەکاندا گیانیان لەدەست داوە، هەروەها چەندین رۆژنامەنووسم بینیوە لە ناوچەی کاریبی، یا لە کیشوەری ئاسیا کە لە دوو شوێن یا سیان کار بکەن بۆ ئەوەی بتوانن خۆیان‌و خێزانەکانیان بەخێو بکەن.

ئەم رۆژنامەنووسانە کە کۆ دەبنەوە باسی کێشەکانی خۆیان دەکەن. ئەم کتێبەش کە دانراوە، لەسەر داواکاریی ئەوان بووە کە کتێبێك دابنرێ تایبەت بێ بە رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەمەوە، کتێبێك بە شێوەیەکی راستەوخۆ رووبەڕووی کێشەکانی ئەوان ببێتەوەو زانیارییەکی سوودمەندی وای تێدابێ بتوانن بەکاری بێنن بۆ سەرکەوتن بەسەر ئەو کۆسپ‌و تەگەرانەدا کە رۆژانە رووبەڕوویان دەبنەوە.

ئەم کتێبە پێشکەش دەکەم بەو هەزاران رۆژنامەنووس‌و سەرنووسەرانەی کە خۆیان ماندوو دەکەن لەپێناوی بەدەستهێنانی پارەیەکی کەمدا لە دەیان وڵات لە جیهانی سێهەمدا، ئەوانەی کە ژیانی خۆیان دەخەنە مەترسییەوە هەندێ جارو لە هەندێ جاری تریشدا تووشی مەترسیی ئەوە دەبن کە ببن بە قوربانیی هیلاکی‌و ماندووبوون لە ئەنجامی مامەڵەو هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ چەند لایەنێکی بیروکراتی یا هەندێ رێکخراو کە ئامادە نین بەدەمیانەوە بچن. با ئەو رۆژنامەنووسانە رەوشتی بەرزی خۆیان بپارێزن، بۆ ئەوەی حەقیقەت‌و راستی وەك بە چاو دەیبینن بخەنە بەردەم کۆمەڵگەکەیان، لەگەڵ ئەو هەموو کۆسپ‌و تەگەرە زۆرانەو ئەو جۆرەها نائومێدییەی کە زۆرجار رووبەڕووی دەبنەوە.

**ئەلبرت ل. هستر**

**ئەسینا، جۆرجیا، ویلایەتە**

**یەکگرتووەکانی ئەمریکا — ١٩٨٧**



## پێشەکی

تۆ رۆژنامەنووسیت، کەواتە ئەم کتێبە بۆ تۆ دانراوە، تۆ، یا ئەو ئامانجەت هێناوەتە دی کە داتناوە بۆ خۆت بۆ ئەوەی ببی بە نووسەرێك، یاخود یەکێك داوای لێکردووی کە ببی بە رۆژنامەنووس، یا تەنانەت فەرمانی پێکردووی بۆ ئەو کارە. ئێمە چەند رێگەی جیاواز دەگرینەبەر بۆ ئەوەی بگەین بەو شوێنەو ببین بە رۆژنامەنووس. رەنگە نازناوەکانیشمان جیاواز بن، هەندێ کەس پێمان بڵێن نووسەری بواری رۆژنامە، یا پەیامنێر، یا ئامادەکاری هەواڵ، بەڵام ئامانجمان هەریەکە. ئێمە دوایین کەسانێکین لە ریزێکی دوورودرێژدا لەوانەی کە بووە بە ریشیانەوە هەواڵی رووداوەکان بگێڕنەوە، واتە ئەوەی کە روو دەدا لە جیهان‌و دەوروبەریاندا، لەسەر لاپەڕەی رۆژنامەکان یان لەسەر شەپۆلی هەوا، بیگوێزنەوە. کاری رۆژنامەنووسی ئەوەیە، ئەوەی کە روو دەداو ئەوەی رووی داوەو ئەوەی دواتر روو دەدا بیگێڕیتەوە بۆ خەڵك، کە ببی بە رۆژنامەنووس مانای ئەوەیە رووداوەکان بگێڕیتەوە بۆ خەڵك، رووداوی ئەزموونی دەوڵەمەندو جۆراوجۆری ژیانی مرۆڤ بە شێوەیەك سەرنج‌و سەرسامی مرۆڤ رابکێشی.

ئەگەر پێویست بوو لەسەرت باسی شتێك بکەیت لە کارەکەتدا، ئەوەت لە یاد بێ کە تۆ بەسەرهاتی خودی ژیان دەگێڕیتەوە. تۆ کارە سەرەکییەکانی ژیان تاووتوێ‌و چار دەکەیت بۆ ژن‌و بۆ پیاو، یا پێویستە ئەوە بکەیت. تۆ ئەو زانیارییانە دەخەیتە بەردەست کە بەشی زۆری خەڵك پێویستیان پێیەتی، بۆ ئەوەی سەربکەون لە بەڕێوەبردنی کاروباری رۆژانەیاندا. تۆ وایان لێدەکەیت ئاگاداری هەڵسوکەوتی کەسانی تر بن لە کۆمەڵگەو شارەکانیاندا. تۆ ئەوەیان بۆ دەگێڕیتەوە کە روو دەدا لە نێوان ئەوان‌و ئەو کەسانەی لە پلەی سەرکردایەتیدا، ئیتر بواری فەرمانڕەوایی‌و دەسەڵات بێ یا بازرگانی‌و خوێندن. ئەو پەیامەی تۆ دەیگەیەنیت‌و جێبەجێی دەکەیت وەك کەتیرەیەك وایە کۆمەڵگەی پێدەنووسێنیت بە یەکەوە.

ئەم سەرگوزەشتە سەرسامهێنەرەی تایبەتە بە باسی ئەزموونی مرۆڤایەتییەوەو درێژەدان بە لێکدانەوەی بە چەند شێوەی زۆر گێڕراوەتەوە، لەوانە: سەماکەرانی (تونگا) کە جوولەی لەش‌و مۆسیقاو وشەو ریتم بەکار دێنن بۆ بەیەکەوە بەستنی بەشەکانی کۆمەڵ بەیەکەوەو پتەوکردنیان، یا تەپڵ لێدەرەکانی ئەفریقیا کە لە توانایاندایە کۆمەڵێکی زۆر ماناو مەرامی خۆیان بگوێزنەوە بە

مەوداکاندا بە بێ بەکارهێنانی ئامێری بێتەل، یاخود رۆژنامەی چاپکراو کە هەندێ هێمای وردی لەسەر چاپکراوە بیروبۆچوونی نوێ دەگەینێ بە خەڵك‌و یارمەتییان دەدا لەسەر تێگەیشتنیان.

تۆ نزیکتری لە کۆچەرەکانی سەردەمانی کۆنەوە کە هەواڵ‌و دەنگوباسیان دەهێنا لە شارو وڵاتەکانی ترەوە. ئای خەڵك چەندە پەرۆش بوون بۆ ئەو کەشتییانەی کە دەگەیشتنە دورگەیەکی لە جیهان دابڕاو لە ساڵێکدا یەك جار، دەنگوباس‌و هەواڵ شتێك نەبوو کە مرۆڤ لێی بێزار بێ یا وەڕس ببێ لێی، یا تێر بێ لێی، بەڵکو شتێك بوو خەڵك بە ئارەزووەوە چاوەڕوانی بوو، تا دەستی بکەوێ‌و ئەنجا لەسەرخۆ شیبکاتەوە. مانای برسیەتیی بۆ زانیاری‌و پێویستیی بە زانین تەنیا ئەوانە دەیزانن کە لە ناوچەیەکی دابڕاوی دووردا دەژین، یا لە شوێنێکدا بژین کە سانسۆرو چاودێرییەکی توند خرابێتە سەر چاپەمەنی، ئارەزووی ئێمە بۆ زانینی ئەوەی کە روو دەدا لە دەوروبەرماندا و ئارەزوومان بۆ ئەوەی کە پەیوەندیمان هەبێ لەگەڵ هەموو تاکەکانی مرۆڤدا و هەوڵدانمان بۆ بەدەستهێنانی زانیاری بۆ رۆشنبیرکردنی خۆمان‌و دابینکردنی ژیانێکی باشتر بۆ خۆمان‌و منداڵەکانمان، هەموو ئەمانە، وا دەردەکەوێ لەو تایبەتمەندییانەن کە هەموو مرۆڤایەتی هاوبەشن تێیدا.

کۆمەڵگەکانی ئێمە، چاوەڕوانی ئەوە دەکەن لە رۆژنامەنووس کە هەواڵ‌و دەنگوباسی بۆ بێنێ‌و هەندێ جار دەنگوباسی خۆش‌و خەمڕەوێن، دەنگوباس‌و زانیارییەکی وا، وامان لێبکا بە توانایەکی زۆرترەوە لەگەڵ ژیاندا بڕۆین‌و خۆشییەکی وا تیماری برینەکانمان بکاو ئەگەر بۆ چەند چرکەیەکیش بێت ناخۆشیی ژیانمان لەبیر بەرێتەوە.

ئەوانەی سەرگوزەشتە دەگێڕنەوە بە خۆشحاڵییەوە پێشوازییان لێدەکرێ هەر لە سەردەمی جارچییەکانەوە کە هەر بەدەم هەواڵیان دەگەیاند بە خەڵك تا پەیدابوونی تەلەفزیۆن‌و رۆژنامەنووسیی تەلەفزیۆنی کە دەتوانێ چەند هەواڵ‌و سەرگوزەشتەی وات پێشکەش بکا کە لە ژیانەوە وەریگرتبێ‌و وشەو دەنگ‌و وێنەی تێکەڵ کردبێ تیایدا. تۆ توانای ئەوەت هەیە وا لە خەڵك بکەی بیر بکەنەوەو بگرین‌و پێبکەنن، بەڵام ئەو نامەو هەواڵانەی تۆ دەیخەیتە بەردەستیان هەندێ جار ئازاریان پێدەگەیەنێ‌و نارەحتیان دەکا بە رادەیەکی وا کە ناتوانن رابوەستن بیر بکەنەوە لەوەی پێیان دەڵێی یا بۆیان دەگێڕیتەوەو جامی رق‌و تووڕەیی‌و دوژمنایەتیی خۆیان قلپ دەکەنەوە بەسەرتا.



هەندێ جاریش تووشی چەند فەرمانێکی دژبەیەك دەبیتەوە، یاخود داوای ئەوەت لێدەکرێ کە لێکدانەوەیەکی تایبەت بکەی بۆ بابەتێك کە دەتەوێ بیگێڕیتەوە. ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەو رۆڵەی تۆ دەیبینی ئەوەندە گرنگە کە کارەبەدەستانی دەسەڵات یا بازرگانی، لێت ناگەڕێن بە تەنیا خۆت رووداوەکان بە تەواوی وەك خۆیان بگێڕیتەوەو زۆر جاران دەبێ بە شێوەیەك بیانگێڕیتەوە کە ئەگەر خۆت ئازادو سەربەست ببوویتایە بەو شێوەیە نەتدەگێڕایەوە.

بەڵام ئەگەر بەختەوەر بیت، ئەوە لە وڵاتێکدا کار دەکەیت تا رادەیەکی باش سەربەست‌و ئازادیت کە حەقیقەتەکە بڵێیت بەو جۆرەی خۆت بە راستی دەزانی‌و باس‌و لێکدانەوەیەکی ورد دەکەیت بۆ هەواڵ‌و رووداوەکانی کۆمەڵگە بەگوێرەی توانا، لەگەڵ ئەوەشدا، تەنانەت ئەگەر رادەیەکی باش ئازادیت بۆ دابین کرا لەلایەن ئەوانەوە کە کاریان بۆ دەکەیت هەر لەسەرتە هەڵسوکەوتێکی تایبەت بکەی لەگەڵ ئەو چاودێرو تێکدەرو سەرلێشێوێنەرانەی خۆیان مەڵاس داوە لە ناخ‌و عەقڵی خۆتداو وات لێدەکەن تێڕوانین‌و لێکدانەوەی خۆت بۆ ژیان بە شێوازێکی تایبەت دابڕێژی. سوودمەندە ئەگەر باسی ئەوە بکەیت، ئەو کۆت‌و بەندە دەرەکییانەی دەخرێنە سەر بڵاوکردنەوەی هەواڵ‌و زانیارییەکان بە وردی، تەنیا لایەکی مەسەلەکەیە، چونکە سیستمی بەها ناوخۆییەکانی تایبەت بە خۆت‌و ئەو خولیای لایەنگیرییەی کە هەیە تیاتدا، بەشێکی جیانەکراوەن لە پێکهاتەی رۆژنامەوانییەکەت.

وەك (بول فاتیسلاویك) لە کتێبی (رادەی راستی حەقیقەت)دا ئاگادارمان دەکاتەوە، مەترسیدارترین جۆری خەیاڵ ئەوەیە کە تۆ لات وابێ تەنیا یەك حەقیقەت هەیە، کەچی ئەوەی یەکێك بە حەقیقەتی دادەنێ بەلای یەکێکی ترەوە لە وەهم‌و خەیاڵ زیاتر هیچی تر نییە، تەنانەت لە کاتێکدا کە بیر دەکەینەوە لە هەندێ حەقیقەتی گومانلێنەکراو وەك توانای ئاگر لەسەر سووتاندن، دەبێ ئەوەمان لەیاد بێ کە لە باشووری (باسیفیك)دا کەسانێك هەن بە ئاسانی‌و بە ئاسایی دەڕۆن بەسەر بەردی گڕگرتوودا، ئەمەش ئینکاریکردنی حەقیقەتە بە حەقیقەتێکی زۆر جیاواز.

ئەرکی رۆژنامەوان ئەوەیە کە بەگوێرەی تواناو بە وردی ئەو بابەتە حەقیقی‌و راستانە بخاتە روو، کەسانی کۆمەڵگەو پابەندی کولتوورەکەی هاوبەش بن لەگەڵیدا لە باوەڕبوونیان بەو بابەتانە.

کاری رۆژنامەوانی هەر وەك کاری سیاسی، کارێکە لەو بابەتانەدا کە دەکرێن جێبەجێ بکرێن. ئیتر ئەوانەی کە نوقمی جیهانی خەیاڵات بوون ئەوە لە ئەنجام‌و کۆتاییدا دەبێ هەر سەری خۆیان

بکێشن بە بەردی ژیانی رۆژانەدا. رۆژنامەنووسانی قاڵبوو و لێهاتوو ئەوە دەزانن کە هەندێ جار باشتر وایە بە لەتە نانێك رازی بن لەوەی کە بمرن لە برساندا لە چاوەڕوانی نانێکی تەواوی بە زەحمەت دەسکەوتوودا کە بریتییە لە گوزارش‌و دەربڕینێکی تەواو لە خۆیان‌و سەربەستی لە نووسینی ئەو بابەتەی کە خۆیان دەیانەوێ، چونکە رۆژنامەنووسان لە شوێنێکی دابڕاودا کار ناکەن، بەڵکو بەشێکن لەو ئامێرەی هەواڵ‌و زانیاری دەگوێزێتەوە بۆ قوژبنێکی جیهان. گرانترین ئەرکیش، کە پێویستە لەسەر رۆژنامەنووسە گەنجەکان بیزانن، ئەوەیە کە (بەلای کەمەوە) هەندێ جار دەبێ لە نووسینی هەواڵ‌و بابەتەکانیاندا، پابەندی یاساو رێسای ئەوانە بن کە دەسەڵاتیان بەدەستەوەیە.

رۆژنامەنووسان، چ بۆ رۆژنامەیەکی رۆژانەی گەورە بنووسن کە تایبەت بێ بە تاقمێکی هەڵبژاردەی کۆمەڵگەوە لە لەندەن، یا بۆ رۆژنامەیەکی هەفتانەی دەوڵەتی کە لە (گیانا) دەردەچێ، ئەوە دەزانن کە سنوورێك هەیە ناتوانن بیبەزێنن، کاتێك کە دێنە سەر گێڕانەوەی هەواڵ‌و رووداوێك، بەلای سەرکردە یا وڵات یا کۆمەڵگەکەیانەوە پەسەند نییە.

یاساو رێسای کۆمەڵایەتی، یارمەتیی رۆژنامەنووس دەدا لە ئامادەکردنی ئەو بابەتەدا کە دەینووسێ، سیستمی سیاسی‌و بیروباوەڕی میتافیزیکی‌و ئەو لێکدانەوەو شیکردنەوانەی باوەڕمان پێیەتی دەربارەی حەقیقەت‌و راستی، ئەمانە هەموو یارمەتیدەرن لە داڕشتنی ئەو هەواڵانەی دەیانگێڕینەوە بۆ خەڵك. هەرچەندە ئەم هەواڵانە بە زۆری باسی هەندێ حەقیقەتی وشك دەکەن، بەڵام رەنگە یارمەتیش بدات بۆ جێگیرکردنی ململانێی تایبەت لە کۆمەڵگەدا. رۆژنامەنووس هەندێ جار ئەفسانە دەگێڕێتەوە وەك چۆن زانیاریی راست‌و ئاسایی دەگێڕێتەوە. کە دەڵێین ئەفسانە، مەبەستمان ئەوە نییە بڵێین بابەتێکی درۆو هەڵبەستراو، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە بابەتێکی کۆن‌و جێگیرو ریشەداکوتاو بە رادەیەك کە ناتوانین بە ئاشکرا دەریبڕین مەگەر بەهۆی نەست‌و بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆوە نەبێ کە بریتییە لە چۆنیەتیی رێکخستنی بەرنامەی مشتومڕو گفتوگۆ گشتییەکانمان. ئەو شێوازەی رۆژنامەنووس بەکاریدێنێ لە گێڕانەوەی هەواڵەکانیدا گوزارش لەو بیروبۆچوونەی خۆی دەکا کە هەیەتی بەرامبەر بە ژیان‌و بوون، بۆ نموونە زۆرێك لە رۆژنامەنووسە رۆژاواییەکان، باوەڕێکی تەواویان لا دروست بووە کە مرۆڤ دەگاتە پلەیەکی باڵا، ئێمە ئەگەر ئەم باوەڕەی ئەوان جێبەجێ بکەین بەسەر خۆماندا، ئەوە لە توانامانداا دەبێ کە سەرکەوتن بەسەر هەر کۆسپێکدا کە رێگەی ئەوەمان لێدەگرێ ژیانێکی باشترو تەواوتر دەستەبەر بکەین، بەڵام هەندێ رۆژنامەنووس پەروەردەی چەند کۆمەڵگەیەکی ترن کە ئەو کۆسپانەی دەبنە رێگر لە بەردەم



هێنانەدیی ژیانێکی باشتردا گەورەو گرانن، ئەو کۆمەڵگەیانەی رادەی تەمەنی مرۆڤ تیایاندا لە سی‌و حەوت ساڵ تێناپەڕێ‌و ناگاتە شەست‌و حەوت ساڵ‌و بەدخۆراکی بڵاوبووەتەوەو کەمینەیەك زۆرینەی خەڵك سەرکوت دەکەن.

رۆژنامەنووسانی ئەم جۆرە وڵاتانە لە نەستی خۆیانداو بە بێ ئارەزووی خۆیان بیرۆکەیەکیان پەسەند کردووە کە گوایا ناتوانرێ ژیان بگەیەنرێتە رادەی تەواوی‌و لایان وایە کە مرۆڤ توانایەکی سنوورداری هەیە لە دروستکردنی پاشەڕۆژی خۆیدا، هەندێ رۆژنامەنووسی تریش لایان وایە کە ژیان چاوتروکاندنێکە لەچاو ژیانی نەمری‌و هەمیشەییداو ئەو هەڵپەهەڵپەی مرۆڤ دەیکا لە پێناوی ژیاندا خێرا دەبڕێتەوەو لەناو دەچێ‌و تەنیا کاریگەرییەکی کەمی هەیە لە سووڕی گەورەی بوونی مرۆڤو گەردووندا.

لە کۆتاییدا ئەو ئامۆژگارییەی کە دەکرێ ئاراستەی رۆژنامەنووسی بکەین ئەوەیە کە دان بگرێ بەخۆیاو تێبگا لەوەی کە ئەو پیشەیەی ئەو پیشەیەکی زۆر گران‌و قورسە لە کۆمەڵگەداو رووبەڕووی بەربەرەکانێ‌و دژایەتیکردنەوە دەبێتەوە لەلایەن سیستمە سیاسییەکان‌و ئارەزووی سەرمایەدارەکانەوە بۆ هێنانەدیی زۆرترین قازانج. نەك هەر ئەوە بەڵکو هەندێ جار تووشی سووکایەتی‌و رێزلێنەگرتن دەبێت لەلایەن ئەوانەوە کە هەواڵەکانیان بۆ دەگێڕێتەوە. سەیریش لەوەدایە کە کۆمەڵگەی نوێ زۆرجار پاداشتی تەواوی نووسەرو رۆژنامەنووسەکان ناداتەوە نە پاداشتی ماددی‌و نە مەعنەوی. رەنگە حیکایەتخوانەکانی سەردەمانی پێشوو پلەوپایەیەکی باشتریان هەبووبێ لەمانەی ئەم سەردەمە.

بەڵام رۆژنامەنووس ئەڵقەیەکی گرنگە لەو زنجیرەی پەیوەندییەدا کە خەڵك پەیوەست دەکا بەیەکەوە، یا لە یەکیان دوور دەخاتەوە. من وا بۆی دەچم کە بەجێهێنانی ئەم ئەرکە لەناو کۆمەڵدا، یەکێکە لەو ئەرکانەی کە چێژێکی زۆر دەبەخشن بە مرۆڤ لە ژیاندا. ئەو کەرەستە خاوانەی کە ئێمە بەکاری دەهێنین لە ئەرکەکەماندا، پیاوو ژن‌و منداڵ‌و هەر شتێکی ترە کە هەیە لەم جیهانەدا کە ئێمەی تیا دەژین. ئەرکەکەش خراوەتە سەرشانی ئێمە، هەوڵبدەین ئەوەی کە زۆرجار خەڵك لێیتێناگەن‌و قورس‌و گرانە لایان، وای لێبکەین لێیتێبگەن. بە هیوای ئەوەشین ئەم کتێبە بەشداری بکا هەرچەندە بە رادەیەکی کەمیش بێ لەوەدا کە ئەو ئەرکە ئاسان بکا بۆ تۆ.

# بەشی یەکەم

## رۆڵی رۆژنامەنووس لە جیهانی سێهەمدا

**نووسینی: أ. ل. هستر**

تۆ لات وایە هۆیەك هەبێت پاڵ بنێ بە یەکێکەوە بۆ دانانی کتێبێك تایبەت بێ بە رۆژنامەنووسان یا نووسەرانی (جیهانی سێهەم)؟ یا تەنانەت شتێك هەیە پێی بگوترێ جیهانی سێهەم، یاخود ئەم وشەو زاراوەیە یەکێکە لەو دابەشکردنە گونجاوانەی بەکاری دەهێنین بۆ ئەوەی شتی تێبهاوین بە مەبەستی بەشبەشکردنو پۆلێنکردن؟

من هەستێکم لا پەیدا بووەو ئەو ماوە دوورودرێژەش پشتگیریم دەکا کە بردوومەتە سەر لەگەڵ رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەمدا، کە پێویستییەکی دیاریکراو هەیە بە کتێبێك هەوڵ بدا بۆ چارکردنی ئەو کێشەو تەنگوچەڵەمانەی رووبەڕووی زۆرێك لە هەواڵنووسو رۆژنامەنووسەکان دەبنەوە. هەروەها من لام وایە کە سوودێك لە کۆکردنەوەی چەند دەوڵەتێکی جیهان لەژێر ناوی دەوڵەتانی جیهانی سێهەم، رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم راهاتوون لەسەر ئەوەی کە بڵێن ئێمە هەندێ پێویستیی تایبەتیی خۆمان هەیە. ئەوانە کە بەشداری دەکەن لە راهێنانێکی رۆژنامەنووسیدا، زۆرجاران سوود لەو کتێبانە وەردەگرن کە دانراون بۆ راهێنانی رۆژنامەنووسە ئەمریکیو ئەوروپییەکان، ئەو نموونانەش کە هێنراونەتەوە لەو جۆرە کتێبانەدا، نموونە گەلێکن لە بیروبۆچوونی ئەمریکاوە وەرگیراون، یا چەند نموونەیەکن کە سیستمی سیاسی بەو سیستمە سیاسییە دادەنێن کە لە ئەمریکادایە.

وەك لەم دواییەدا، (دون ولفورد) لە رۆژنامەی (ئوسترالیان جورنالیزم ریفیو)دا نووسیویەتی، ئەو کتێبانەی خراونەتە بازاڕ کە لە ئەمریکا یا ئەوروپا دانراون، کەڵکی تەواویان



نییە بۆ ئەوەی لە شوێنێکی تردا بەکاربهێنرێن. لەگەڵ ئەوەدا کە زۆرجار بەکاردەهێنرێن لەبەر ئەوەی کە کتێبی تر نییە جگە لەوانە. هەروەها دەڵێ:

زۆربەی ئەو کتێبانەی پەیوەندییان هەیە بە رۆژنامەنووسییەوە بە زمانی ئینگلیزی — بە تایبەتی ئەو کتێبانەی تایبەتن بە پیشەی رۆژنامەوانییەوە — لە ئەمریکاوە دەگەن بە خەڵكو ئەوانە بە تایبەت دانراون بۆ بازاڕی گەورەو فراوانی ئەمریکا، هەروەها چەند وشەو زاراوەیەك بەکار دێنن کە بە تەواوی گونجاون لەگەڵ باری کۆمەڵایەتیی ئەمریکاداو زۆر کەس لە مامۆستایانی بواری رۆژنامەوانی لە وڵاتە تازەپێگەیشتووەکاندا لە باشترین حاڵەتدا، وایان دادەنێن کە تا رادەیەکی دوور پەیوەندییان نییە بەو وڵاتانەوە، ژمارەیەکی گاڵتەپێنەکراویش لایان وایە کە مەترسییەکی شاراوەیان تێدایە. (بۆل ئانساە) لە وڵاتی (گانا) دەڵێ: خوێندکارە تازەکانی بواری رۆژنامەوانی، هەندێ نموونە کە لەو کتێبە بیانیانەدا هاتوون وەریاندەگرن وەك نموونەیەك بۆ بەراوردکردن، بە بێ ئەوەی هەوڵبدەن دەسکارییەکیان بکەن بۆ ئەوەی لەگەڵ بارودۆخی ناوخۆدا بگونجێن. لەگەڵ ئەم هەموو بۆچوونە مەترسیدارانەشدا، ئەم کتێبانە بە زۆری بەکار دەهێنرێن.

ئێمە هیوامان ئەوەیە ئەم کتێبە هەندێ شێوازو رێگەی جۆراوجۆر بخاتە بەردەست کە باسی رۆڵی رۆژنامەنووسی جیهانی سێهەم دەکات لەگەڵ هەندێ حاڵەتی تایبەت کە زۆرجار رووبەڕوویان دەبێتەوە. جیاوازیی سەرەکی کە رۆڵی رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە ئەوانە بۆ وڵاتێك یا کۆمەڵگەیەك دەنووسن کە لە سەرەتای گەشەکردندایە وەك قەوارەیەکی سیاسیی سەربەخۆ، یا نزیکە لەوەوە ئەوەی بۆ بێتە دی، رۆژنامەنووس لە جیهانی سێهەمدا، رۆژانە هەڵسوکەوت دەکا لەگەڵ جیهانێکدا کە لە حاڵەتی گۆڕانێکی بەردەوامدایە، چونکە ئەو ناتوانێ بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی ئەوە مسۆگەر بکا کە بیروبۆچوونی سەرکردە سیاسییەکانی وڵاتەکەی وەك خۆی دەمێنێتەوەو بەردەوام دەبێ، یاخود ئەو بڕە پارەیەی لە سەری مانگدا وەریدەگرێ، ئەو بڕە خۆراکەی پێبکڕێ کە لە هەفتەکەدا پێویستییەتی (بەهۆی هەڵاوسانی پارەو بەرزبوونەوەی نرخەوە)، یا کارەبا بەردەوام هەیە بۆ کارپێکردنی چاپخانەکان، یا کارکردنی ئیستگەکان بۆ بڵاوکردنەوەی هەواڵ.

رۆژنامەوانی جیهانی سێهەم ناتوانێ — وەك رۆژنامەوانە هاوكارەكانی لە وڵاتانی ئەورووپاو ئەمریكاو گەلێك لە وڵاتە پێشكەوتووەكانی تر - ئەوە مسۆگەر بكا كە بە شێوەیەكی رێكوپێك گرنگی بدا بە بابەتە سەرەكییەكانی ژیان. لەبەر ئەوەی كە رۆژنامەنووس لە جیهانی سێهەمدا، لە جیهانێكدا دەژی كە هەموو رۆژێك گۆڕانی بەسەردا دێ، دەبێ زۆر وریاو ئاگادار بێ لەو مەسەلانەی روو دەدەن لە ناوچەو وڵاتەكەیدا.

رۆژنامەوانی جیهانی پێشكەوتوو، هەندێ ئەگەرو ئیحتیمالاتی ئۆتۆماتیكی دادەنێ كە هەندێ جار راست نین، بەڵام زۆرجار راست دەردەچن. بۆ نموونە خوێنەرانی رۆژنامەكە بە رادەیەكی وا خوێنەوارییان هەیە تێدەگەن لەوەی لە رۆژنامەكەدا بڵاو دەكرێتەوە، یاخود خوێنەر ئەوەندە پارەی هەیە بتوانێ ئابوونەی بەشداریكردن بدا لە یەكێك لە رۆژنامەكاندا، ئەمەش لە هەموو شوێنێكدا دەستەبەر ناكرێ.

رۆژنامەوانی جیهانی سێهەم دەبێ هەموو كات ئەوەی لە یاد بێ كە بەشێكی زۆری خوێنەرانی، تازە فێری نووسینو خوێندنەوە بوون، یا لەوانەن كە بە رێگەوەن شێوەی ژیانی گوندنشینیی خۆیان بگۆڕن بۆ ژیانی شارستانیەتی، رۆژنامەوانی جیهانی سێهەم وەك ئەو خاوەن پیشانەی تر كە كار دەكەن لە هۆكانی راگەیاندنی وڵاتە تازەگەشەكردووەكاندا، ناتوانێ ئەوە لەبیر خۆی بەرێتەوە كە كارمەندانی هۆكانی راگەیاندن خۆیان مامۆستاو خوێندەوارن، جگە لەوەی بەرنامەی زانیاری پێشكەش دەكەن بە جەماوەرێكی خوێنەوار. خەڵك لە هەموو قوژبنێكی جیهاندا چاویان بڕیوەتە هۆكانی راگەیاندن بۆ ئەوەی رێنومایییان بكا بۆ ئەو نموونانەی تایبەتن بۆ هەنگاونان بەرەو ژیانێكی باشتر.

كاتێك تاكەكانی كۆمەڵ پێویستیان بەوە دەبێ خۆیان بگونجێنن لەگەڵ بارودۆخێكی تازەدا، زۆرجار هەوڵ دەدەن بۆ بەدەستهێنانی ئەو زانیارییانەی یارمەتییان دەدا، ئیتر ئەو زانیارییانە پەیوەندییان هەبێ بە چۆنیەتیی هەڵسوكەوتكردن لەگەڵ خەڵكانی دانیشتووی یەكێك لە شارەكانی رۆژاوای ئەفریقیاوە، یا پەیوەندیی هەبێ بە فێربوونی تازەترین گۆرانیو سەماوە لە شارێكی ئەمریكای لاتیندا. لەم قۆناغو سەردەمەی ئێستاماندا هەموو دانیشتووانی جیهانی سێهەم، زانیارییەكانیان زۆرجار لە هۆكانی راگەیاندنی بیانییەكانەوە وەردەگرنو هەندێ جاریش چاو دەكەن لەو رەوشتو هەڵسوكەوتەی هۆكانی راگەیاندنی بیانی بڵاویان دەكەنەوە.



هەڵسوكەوتو رەوشتێك كە رەنگە نموونەی ئەو كۆمەڵگە بیانییە بێ، بەڵام بە شێوەیەكی كەم نەبێ جێبەجێ ناكرێ لە جیهانی سێهەمدا.

رۆژنامەوان پێویستە لەسەری ئەركی رۆشنبیركردنی ئەو كەسانە بگرێتە ئەستۆ كە رۆژنامەكەی دەخوێننەوە، دەربارەی حەقیقەتو چۆنیەتیی ژیان لە كۆمەڵگەیەكی دیاریكراوو لە شارستانییەتێكی دیاریكراودا. ئەمەش مانای ئەوە نییە كە دەبێ كولتوورو رۆشنبیریی بیانی بخرێتە پشتگوێ، بەڵكو بەلای كەمەوە مانای ئەوەیە كە رۆژنامەوان شتێك بخاتە بەردەست خەڵك سەرنجڕاكێش بێو پەیوەندیی تەواوی هەبێ بە خوێنەرەوەو ئەو بابەتە لە ژینگەی جیهانی سێهەمەوە هەڵقوڵابێ.

لەو باوەڕەدام كە رۆژنامەنووسی جیهانی سێهەم چەندە بە شێوەیەكی باشتر پیشەكەی خۆی فێربێ، ئەوەندە دەتوانێ خوێنەرەكانی باشتر رابكێشێ بەلای خۆیداو نووسینی رووداوی شێوە هەواڵ خەڵك زیاتر رادەكێشێ لەوەی بێت باسی دڵداریی ئەستێرەیەكی سینەمایی رۆژاواییان بۆ بنووسێ.

رۆژنامەنووس لە وڵاتێكی دواكەوتوودا كە تازە سەربەخۆیی بەدەست هێنابێ، لەسەریەتی رۆڵێك ببینێ زیاتر هەست بە بەرپرسیاریەتیكردنی تیابێ لەچاو هاوكارەكانی خۆیدا لەو وڵاتانەی كۆنترنو پێشكەوتووترن. ئەگەر كاری رۆژنامەنووسی بكەیت — وەك نموونە — لەو تاكە رۆژنامەیەی بڵاو دەكرێتەوە لە یەكێك لەو وڵاتانەدا، ئەوا ئەركی سەرشانت قورستر دەبێ لەوەی كە كار بكەیت لە وڵاتێكدا خوێنەر رۆژنامەیەكی زۆری لە بەردەستدا بێو بە ئارەزووی خۆی یەكێكیان هەڵبژێرێ بۆ خوێندنەوە. بە دەیان دەوڵەتیش هەن لە جیهانی سێهەمدا تەنیا یەك رۆژنامەی تیا دەردەچێ، بگرە تەنیا بڵاوكراوەیەكی هەفتانەی تیا دەردەچێ.

ئەو رۆژنامەنووسانەی كار دەكەن لە وڵاتگەلێكدا كە رادەی خوێنەواری نزمە تیایاندا، ئەركێكی قورستریان لەسەرشانە، چونكە بەلای زۆرەوە، ئەوانەی توانای رۆژنامە خوێندنەوەیان هەیە بریتین لە سەركردەكانو ئەوانەی بڕیاریان بەدەستە. ئەگەر رۆژنامەكەت، تاكە رۆژنامەیەك بوو لە وڵاتەكەتداو تەنیا پێنج هەزار خوێنەری هەبوو، وا خەیاڵ نەكەیت كە تۆ هیچ رۆڵێكی گرنگت نییە، چونكە ئەو پێنج هەزار خوێنەرە گرنگییان زیاترە لە ژمارەكەیان.

کاتێك باس لە رۆڵی رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم دەکەین دەبێ ئەوەمان لەیاد بێ کە ئەوانە پێشەنگن. واتە ئەوانە نەوەی یەکەمن لەو رۆژنامەنووسانەی پێشدەستی دەکەن لە رزگارکردنی خۆیان لە دەسەڵاتی هێزە ئیستیعمارییە بیانییەکان. هۆکانی راگەیاندن لە هەموو وڵاتانی جیهانی سێهەمدا بە شێوەیەکی گشتی کە پەیدا دەبن بۆ جێبەجێکردنی پێویستییەکانی هێزە بیانییەکانە نەك بۆ خزمەتکردنی پێویستییەکانی زۆرینەی دانیشتووانی وڵاتەکە. ئەم پێویستییانەش هەندێ جار یەك دەگرنەوە، بەڵام لە زۆر کاتدا هۆکانی راگەیاندن زیاتر گرنگییان دەدا بە باسی ئەو ئەوروپاییانەی کە لە چینە کۆمەڵایەتییە باڵاکان بوون یاخود پۆستێکی دەوڵەتییان هەبووو لایان نەدەکردەوە لە هاووڵاتییانی تر بە رادەیەکی کەم نەبێ. بەڵام ئەمڕۆ لە زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێهەمدا بارودۆخەکە گۆڕاوەو گرنگیدان بە رۆژنامەنووسی خراوەتە پشتگوێ کە لە بنەڕەتدا خزمەتی کولتوورێکی نامۆ دەکات. رۆژنامەوان لە جیهانی سێهەمدا سەرکردایەتیی پرۆسەی گۆڕینی بیروبۆچوونی خوێنەران دەکاو لە زۆر کاتدا ئەرکی بەرزکردنەوەی ئاوێنەی دەکەوێتە سەرشان بۆ ئەوەی ئەندامانی کۆمەڵگە یا شارەکەی خۆیان ببینن تیایدا لە کاتی پرۆسەی پێکهێنانی نوێی پێناسەی خۆیاندا.

چەند نموونەیەك شایانی ئەوەن چاویان لێبکرێ لە جیهانی سێهەمدا:

رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم، دەتوانن ببنە نموونەیەك چاویان لێبکرێ لە باری جێبەجێکردنی ئەرکەکانیانەوە بۆ ئەوانەی تەمەنیان کەمترە لەوان. کارێکی گرنگە بۆ گەنجەکان لە هەردوو رەگەزەکە، دەبینن رۆژنامەنووسانو پزیشكو مامۆستایانو خاوەن پیشەکانی تر، بە کارامەییو لێهاتوویی کارو ئەرکەکانی خۆیان جێبەجێ دەکەن بە بێ ئەوەی پشت ببەستن بە کەسانێکی بیانی رێنومایییان بکەن لە ئەنجامدانی کارەکانیاندا. لە راستیدا رۆژنامەیەك کە یەکێك لە ئەندامی گەلانی جیهانی سێهەم دەریدەکا بە تەنها خۆی، بەڵگەیەکی هەستپێکراوە لەسەر سەربەخۆییو پێویستنەبوون بە یارمەتیو رۆڵی لایەنە دەرەکییەکان، تەنانەت ئەگەر ئەو رۆژنامەیەش نەگەیشتبێتە رادەی پێویست لە یاساو رێسای رۆژنامەگەریداو تەنانەت ئەگەر هەندێ جار ئەو هەولانە پەرتوبڵاوو سەرکەوتوو نەبن، بەڵام رۆژنامەیەك دەر بچێ لەلایەن رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەمەوە، ئەوە شتێکی تایبەتە بە خۆیانو کەس هاوبەش نییە لەگەڵیاندا. رۆژنامەوانانی جیهانی سێهەم رۆڵێکی گەورە دەبینن لەو پرۆسە سەربەخۆیەی



دەرکردنی ئەو رۆژنامەیەدا کە خۆیو خوێنەرانی بەختەوەرن بەوەی بەرهەمێکیان هەیە هی خۆیانە.

جگە لەوەش رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم رۆڵێکی تر دەگێرن کە رۆژنامە رۆژاواییەکان زۆر بیری لێناکەنەوە، ئەو رۆڵەش بریتییە لە یارمەتیدان لە گواستنەوەو خستنەڕووی زانیارییەکان بۆ کەسانێك کە بڕیارگەلێك دەردەکەن کاریگەرییان هەیە لەسەر کۆمەڵگە یا میللەت.

وەك (جان دارسی) روونی کردووەتەوە زۆربەی پەیوەندیی جەماوەری لە سەدەی بیستەمدا، بریتییە لە (هەڵقوڵینو کۆبوونەوەیەکی ستوونی یەك لایەنەی زانیارییەکانە، ئەگەر بە وردی سەیر بکەینو وردببینەوە دەبێ هەست بەوە بکەین کە پەیوەندیی جەماوەری بریتییە لە پرۆسەی دابەشکردنی زانیارییەکان لە یەك لایەنەوە، ئەوەش پێی ناگوترێ پەیوەندیی راستەقینە، چونکە دیارە کە پەیوەندیکردن دەبێ کارلێککردنی دوو لایەنی تێدابێ).

ئێمە ئەگەر ئەم بۆچوونە شی بکەینەوە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەوانەی هۆکانی راگەیاندن بەکاردێنن، کەسانێکی بێکەڵكو سەلبین، ئەوانە زانیاریو هەواڵەکان وەردەگرن لە هۆکانی راگەیاندنەوە، بەڵام بە نۆرەی خۆیان ئەو زانیارییانە ناگەیەنن بە کەرتو بەشەکانی تری کۆمەڵ. رۆژنامەنوسی جیهانی سێهەم دەبێ ئەوە بزانێ کە یەکێك لەو ئەرکانەی خراوەتە ئەستۆی، ئەوەیە کە گرنگی بدا بە کاروباری خەڵك لە کۆمەڵگەدا، هەروەها گرنگی بدا بە پێداویستییەکانیانو هیواو ئاواتو ئەو شتانەی جێگەی مەترسین بۆ ئەوانو، لە رێگەی نووسین لەسەر ئەم بابەتانە ئەو رۆژنامەنووسانەی جیهانی سێهەم کێشەو ئاواتو داواکارییەکان دەخاتە بەرچاوی خەڵكو سەرکردە سیاسییەکان. ئەو تەنها زانیارییەکان ناخاتە بەردەست خوێنەران، بەڵکو پاڵیان پێوە دەنێ بۆ (لای سەروو) واتە بۆ سەرکردایەتی کۆمەڵو دەوڵەت. ئێمەیش بە هیوای ئەوەین سەرکردەکان گوێ راگرن لەو بابەتانەی کە رۆژنامەنووسەکان بەدەستی دەهێنن لەناو هاووڵاتییاندا. بەم جۆرە رۆژنامەوانانی جیهانی سێهەم تەنیا گرنگی بەوە نادەن زانیاریو هەواڵەکان بنێرن بۆ لای خوارەوە بۆ ئەوانەی هۆکانی راگەیاندن بەکاردێنن، بەڵکو گرنگیش دەدەن بە گەیاندنی زانیاریو هەواڵەکان بەلای سەروو، واتە ئەوانەی کە لە پۆستی بڕیاردانداـن. جگە لەوەی کە پەیوەندی دەبێ شێوەیەکی ستوونی وەربگرێ وەك لە سەرەوە بە کورتی باسمان

کرد، رۆژنامەنووس دەبێ ئەوەش بزانێ کە بڕێکی زۆری پەیوەندی دەبێ بە ئاسۆیی رووبدا، ئەمەش لە رێگەی ئاڵوگۆڕکردنی زانیاریو هەواڵ لەنێو هاووڵاتیان خۆیاندا ئەو زانیارییانەی کە پەیوەندیی هەیە بە کاروباری هاووڵاتییانو دراوسێکانیانەوە. بۆ نموونە ئەگەر یەکێك لە شارەکان هۆیەکی دۆزییەوە بۆ چارکردنی کێشەی کەم ئاوی، رەنگە ئەو رێگە چارەیە کەڵکی هەبێ بۆ شارو کۆمەڵگەکانی تر.

پێشتر ئاماژەمان کرد بەوەی چەند ئەرکێکی تایبەت کەوتوونەتە سەرشانی رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم، هەروەها ئاماژەمان کرد بەو رۆڵە گرنگانەی ئەوان جێبەجێی دەکەن، ئەو ئەرکو رۆڵانە پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان هەیە بە جۆری پێکهاتەی ئەو دەوڵەتەی جیهانی سێهەمەوە. لەم ماوانەی دواییدا بووە بە باو لای هەندێك تاقم کە وشەی جیهانی سێهەم پڕ بە پێستی مەبەستەکەی خۆی نییەو زاراوەیەکە ورد نییە، چونکە جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان ئەو دەوڵەتانەدا کە ئەم وشەیە دەیانگرێتەوە لە ئاسیاو رۆژهەڵاتی ناوەڕاستو ئەفریقیاو ئەمریکای لاتین. دەبێ چی بێ دەوڵەتێکی خاوەن نەوتی کەناری دورگەی عەرەب، کۆ بکاتەوە لەگەڵ دەوڵەتێکی وەك هاییتیدا کە کەوتووەتە لای دەریای کاریبییەوەو دەسکەوتی ساڵانەی هاووڵاتییەکانی یەکێکە لە دەستکەوتە کەمەکانی ساڵانەی دەوڵەتانی جیهان.

ئێمە یەکەمجار هەست بەوە دەکەین کە کۆکردنەوەی ئەم ژمارە زۆرەی دەوڵەتان لەژێر ناوی دەوڵەتانی جیهانی سێهەم، جۆرێکە لە ئاسانکارییەکی تێکدەرو، نە زیانی هەیەو نە سوود، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بێگومان وشەو زاراوەی جیهانی سێهەم سوودو کەڵکی خۆی هەیە.

ئیسماعیل سەبری، وەزیری پلاندانانی پێشووتری میسر بابەتێکی نووسیوە کە لە هەموو نووسینەکانی تر جوانتر گوزارشی کردووە لە مانای جیهانی سێهەم، ئەو بەدواچوونێکی گۆڕانی مێژوویی ئەو وشەیەی کردووەو دەڵێ: (ئەو زاراوەیە هەموو ئەو دەوڵەتانە دەگرێتەوە کە لە رێڕەوی پرۆسەی مێژوویی تایبەت بە دامەزراندنی سیستمی جیهانی ئێستادا هێشتا نەبوون بە دەوڵەتێکی پیشەسازیو دەوڵەمەند)، هەروەها لەسەر قسەکانی دەڕواو دەڵێ: پێویستە لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی بکرێ بۆ ئەم گۆی زەوییەی تێیدا دەژین بۆ ئەوەی لە مانای راستیی جیهانی سێهەم بگەینو بزانین چی دەگەیەنێ، چونکە لە دوا شیکردنەوەو لێکدانەوەدا بۆت دەردەکەوێ کە جیهانی سێهەم، ئەو سنوورە دەرەکییەیە بۆ ئەو سیستمەی هاتووەتە ئاراوە لە



ئەنجامی پەرەسەندنو فراوانبوونی سەرمایەداریی جیهانیداو کۆمەڵەی وڵاتە سۆشیالیستییە ئەوروپاییەکان ئەنجامی ئەو کەلێنو درزبردنەیە کەوتووەتە جەمسەری سیستەمە سەرمایەدارییەکەوە)، پاشتر ئیسماعیل سەبری دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە دەڵێ: پیاو بە دڵنیاییەوە دەتوانێ بڕیار بدا کە دواکەوتوویی‌و شوێنکەوتن بە هەموو ئەنجامەکانییەوە، خاڵی هاوبەشی گەورەی هەموو دەوڵەتەکانی جیهانی سێهەمەو بنبڕکردنی یەکجاری ئیمپریالیزم تاکە رێگەیە بۆ رزگاربوون لە کۆتو بەندی ئەو.

ئاشکرایە کە یەکێك لە ئەرکە گرنگەکانی رۆژنامەنووسی جیهانی سێهەم یەکخستنی هەوڵو تێکۆشانی وڵاتەکەیەتی بۆ گۆڕینی ئەو پەیوەندییە شوێنکەوتووانەو کلکایەتییە، تا وڵاتەکەی ببێ بە دەوڵەتێکی خاوەن سەروەریی تەواو. رۆڵێکی تر هەیە زۆر روون نییە کە دەبێ رۆژنامەنووس ئەنجامی بدا، ئەویش ئەوەیە بەرەنگاری ئەو بۆچوونانە ببێتەوە کە دەڵێن پێشکەوتنو گۆڕان هەر بەوە دەبێ کە دوای هەنگاوەکانی ئەوروپاو ئەمریکا بکەوین. رۆژنامەنووس لە جیهانی سێهەمو دەوروبەرەکەیدا دەتوانێ لە رێگەی گومان دروستکردنێکی زیرەکانەو رەخنەئامێزەوە لەو کارانەی ئەنجام دەدرێن بۆ گەشەکردنی وڵات، بەڵگە بێنێتەوە لەسەر ئەوەی چاولێکردنی شێوازی پێشکەوتنو گەشەکردنی ئەوروپاو ئەمریکا مەترسیی تێدایە. (ئیجناسی ساکس) کە ئەوروپاییە سەرنجی خەڵکی راکێشاوە بۆ ئەو مەترسییە، ئیجناسی ساکس، ئێستا پۆستی بەڕێوەبەری جەمسەری نێودەوڵەتییە بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر ژینگەو گەشەکردن لە زانکۆی سۆربون. ئیجناس لە ساڵی ١٩٧٧دا نووسیویەتیو دەڵێ:

لە وڵاتانی باکووردا دەبینین کە پێویستە لەسەر ئێمە دەست بکەین بە شارەزابوون لەو کێشەی نالەباری پێشکەوتنو گەشەکردنەی دەناڵێنین بە دەستییەوەو هەڵوێستمان جۆرە دووفاقیو جیاوازیی تێدایە. لە وڵاتی خۆماندا گفتوگۆ دەکەین لەسەر کێشەی بێکاریو گۆشەگیریو بێسەروبەریی بواری ژینگەو هەڵاوسانی دراو، بەڵام کاتێك لە بەردەم سیمینارو کۆبوونەوەیەکی نێودەوڵەتیدا قسە دەکەین، یەکێك لەو بابەتانەی دەبێ ملکەچی بین ئەوەیە کە بڕیار بدەین ئەوەی لە باکووردا روودەدا کارێکی باشە. دواتر تاکە پرسیارێك کە دەمێنێتەوە ئەوەیە کە بپرسین، کامانەیە ئەو رێگەو هۆیانەی دەبێ باشوور پەیڕەوی بکا بۆ ئەوەی تووشی هەمان کێشەو تەنگوچەڵەمە ببێ، ئەمەش پرسیارێکە بە تەواوی کەس لێی تێناگا.

هەروەها رۆژنامەنووسی جیهانی سێهەم پێویستە لەسەری زیرەکانە گومان پەیدا بکا لەو جۆرە گەشەکردنانەی کە لەسەر بنەمای چەند نموونەیەکی سۆشیالیستی یا کۆمۆنیستیی لە دەرەوە هێنراو ئەنجام دەدرێن. ئەگەر کۆمۆنیستە چینییەکان خۆیان بۆیان هەبێ گومان پەیدا بکەن لەوەی کە فەلسەفەو رێنوماییەکانی مارکس‌و لینین دەکرێ هەموو کاتێ بەسەر بارودۆخی ئێستای چیندا جێبەجێ بکرێ، ئەوە بۆ ئێمە رەواترە کە نابێ بەلامانەوە نموونەکانی گۆڕان‌و پێشکەوتنی سۆشیالیستی بە بێ رەخنە وەربگرین. ئەم گومان پەیداکردنەی چینییەکان لە پەسەندکردنی کوێرانەی بیروباوەڕی کۆمۆنیستی‌و جێبەجێکردنی لە چینی ئەمڕۆدا، بێگومان رووداوێکی زۆر دڵخۆشکەرە لەم ساڵانەی دواییدا.

لە دواییدا، رۆژنامەنووسی جیهانی سێهەم دەبێ رۆڵێك بگێڕێ لە راگەیاندنی وڵاتە پێشکەوتووەکاندا بە شێوەیەکی باشتر لە لە جیهانی سێهەمدا. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو رۆڵە رەنگە رۆڵێکی پلە دوو بێ‌و لە پلەی خوارەوە دابنرێ بۆ خوێنەران لە وڵاتەکەی خۆیدا. رۆژنامەنووسی جیهانی سێهەم رەنگە بتوانێ هاوکاری بکا لە پێشکەشکردن‌و خستنەڕووی وێنەیەکی تەواوی جۆری ژیان لە وڵاتەکەیدا. بەشێکی زۆری ئەو بەسەرکردنەوەو گێڕانەوەی هەواڵە کە رۆژنامەنووسە بیانییەکان دەیکەن لەسەر وڵاتانی جیهانی سێهەم لە سەرچاوەکانی وڵاتەکە خۆیەوە وەرگیراون، واتە پشت دەبەستێ بەو بابەتانەوە کە نووسراون یا بڵاو کراونەتەوە لە خودی وڵاتەکەدا. کاتێکیش کە رۆژنامەنووسی جیهانی زیاتر سەربەخۆ دەبێ‌و کەمتر حەز دەکا لە چاولێکردنی شێوازی بەسەرکردنەوەی هەواڵی رۆژنامەنووسە بیانییەکان، ئەوە دەبێتە هۆی جۆراوجۆرکردنی بەسەرکردنەوەی هەواڵ لە جیهانی سێهەمدا کە هۆکانی راگەیاندنی وڵاتەکانی تر ئەنجامی دەدەن.

ئەگەر دەوڵەتە ئەورووپییەکان‌و ئەمریکا لە توانایاندا بوو زانیاریی جۆراوجۆری زیاترو پڕماناتر بەدەست بهێنن، ئەوە شتێکە لەوپەڕی گرنگیدایە، بەڵکو دەکرێ بڵێین کە پێویستبوون بە زانیاریی پەیوەندیدار بە بارودۆخی جیهانی سێهەم، یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی ئەمریکاو ئەورووپا تووش بن‌و دەستبکەن بە هەندێ کاری سەرەڕۆیی‌و هێرشی سەربازیی نەگریس لە جیهانی سێهەمدا. رای گشتی لە ناوخۆی ئەمریکادا، رۆڵێکی گرنگی هەیە لە پێکهاتنی دوایین سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکادا. هەروەها تێگەیشتنی وردو تەواو لە جیهانی سێهەم،



رەنگە ببێتە هۆی کەمبوونەوەی ئەگەری جێبەجێکردنی ئەو سیاسەت‌و تێڕوانینانەی ئەورووپاو ئەمریکا کە بە شێوەیەکی ناتەواو داڕێژراون دەربارەی جیهانی سێهەم.

جگە لەمەش رۆژنامەنووسان لە جیهانی سێهەمدا، پێویستە لەسەریان رۆڵیان هەبێ لە گواستنەوەی دەنگوباس‌و زانیاری بۆ خوشك‌و براکانیان لە دەوڵەتانی تری جیهانی سێهەمدا. ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەوانەی چوونەتە بواری پێشخستن‌و گەشەکردنی وڵاتەکەیانەوە وەك دەوڵەتێکی تازەپێگەیشتوو زۆرجار دەتوانن کە ئەرکی سەرشانی ئەوانەی تر سوك بکەن کە خەریکی گەشەپێدانی وڵاتەکەیانن، لە رێگەی هاوبەشیکردنیان لە سەرکەوتن‌و شکستەکانیاندا.

## سەرچاوەکان

1. "Third World Journalism Training", 6:1 (January, 1984), p. 66.

2. Ibid.

3. "The 'Right to Communicate' and the Meaning of Words", Intermedia, 11:2 (March, 1983), p. 9.
4. "Heterogeneity and Differentiation – The End of the Third World?", Development Dialogue, 1978:2, p. 10.
5. Ibid.
6. Ibid, p. 18.
7. "Controlling Technology for Development", Development Dialogue, 1979:1, p. 24.

# بەشی دووەم

## کێشەو گرفتەکانی کاری رۆژنامەوانی لە جیهانی سێهەمدا

**نووسینی: أ. ل. هستر**

ئەو کێشەو گرفتانەی رووبەڕووی رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم دەبنــەوە لــە زۆر رووەوە، وەك ئەو کێشەو گیروگرفتانە وان کە رووبەڕووی ئەو کوڕو کچانە دەبنەوە کە دەست دەکەن بــە دانانی بناغەی ژیانیان، چونکە هەرکام لەو رۆژنامەنووسەی جیهانی سێهەمو ئەو کــوڕە گەنجــە تازە رزگاریان بووە لە دەسەلاّتی هێزە ئیمپریالییەکانو کەسوکارەکەیان. ئەو دەسەلاّتە دەکــرێ وا سەیربکرێ کە دەسەلاّتێکی باشە یا خراپە، لەگەلّ ئەوەشدا لە زۆر بواردا بووە بــە رێگــر لــە بەردەم پێشکەوتنی رۆژنامەنووسەکەی جیهانی سێهەمو ئەو کوڕە گەنجە تازەپێگەیشتووەی کــە پێ دەنێتە جیهانی گەورەکانەوە.

رۆژنامەنووسی جیهانی سێهەم یا ئەو کوڕە گەنجە، رووبەڕووی چەند کێشەو گرفتی چونیەك دەبنەوە. ئەم بەشەی کتێبەکە دادەنێین بۆ باسکردنێکی کورتی ئەو کێشانەو لە توانای هــەموو رۆژنامەنووسێکدایە کە ئەم کتێبە دەخوێنێتەوە شارەزای هەندێ لەو کێشانە ببێــت. بێگومــان ئەو رۆژنامەنووسە چەند کێشەیەکی تایبەتیی تری هەیەو دەتوانێ ئەم کێــشانەش بخاتــە ســەر لیستی کێشەکانی خۆی.

ئێمە ناتوانین بەرنامەیەکی رێکوپێك دابنێین بۆ ئەوەی بگەین بە مەبەســتەکەمان، مەگــەر کاتێــك نــەبێت بــچینە قــوولاّیی ئــەو شــتانەوە کــە دەبنــە کۆســپ لــە رێگــەی هێنانــەدیی مەبەستەکانمان، لەو کاتەدا دەتوانین بەرنامەی راهێنانی خۆمان باشــتر دابڕێــژینو روو بکەینــە کارێکی زۆر سوودمەندو بەکەڵك.



رۆژنامەنووسی جیهانی سێهەم، پێش هەرشتێك، بەگوێرەی توانا گرنگی دەدا بە باسکردنو گێڕانەوەی سەرگوزەشتەی ژیانی نەتەوەو کۆمەڵــگەکەی خۆی بە وردی. رۆژنامەنووس کاتێــك ئەم کارە ئەنجام دەدا، ویستو ئارەزووی پاڵی پێوەدەنێ بۆ گێڕانەوەو لێکدانەوەی زانیارییــەکان بە شێوەیەك هاوولاّتییەکانی سوودی لێوەرگرن.

لە پشت ئەم ویستو ئارەزووەوە بۆ گێڕانەوەو لێکدانەوەی زانیارییە پێویستەکان بیرۆکەیەك هەیە دەڵێ: هۆکانی راگەیاندن دەبێ کار بۆ ئەوە بکا کە کۆمەڵــگە یا کۆمەڵەکــە جــۆش بــدا بەیەکەوە، واتە زانیاری دەخاتە بەردەست هاوولاّتییان بۆ ئــەوەی بتــوانن لەســەر بناغــەی ئــەو زانیارییانە بگەن بە چەند ئەنجامو بڕیارێك بە شــێوەیەکی هۆشمەندانــەو کارئاســانی بکــات بــۆ بەرەوپێشبردنو گۆڕینی کۆمەڵــگەو کۆمەڵ. دیارە لە هەر شــوێنێك رۆژنامەیــەکی تایبــەتیش (بازرگانی) هــەبوو، مەبەســتی هــەرە گــەورەی بەدەســتهێنانی قــازانجو ســوودە بــۆ خــاوەنو کارمەندەکانی رۆژنامەکە یا هۆکانی تری راگەیاندن، ئەم مەبەســتەش رەنگــە بگونجــێ لەگــەڵ هەندێ مەبەستی تر کە خەڵك هەیەتی لــە کــڕینو بەدەســتهێنانی هۆکــانی تــری راگەیانــدنی گشتیدا.

کاتێك کە باسی بیروڕای رۆژنامەنووسی جیهانی سێهەم دەکــەین لەســەر کارەکــەی خــۆی، دەبێ ئەوەمان لەبیر نەچێ کــە رۆژنامــەنووس حــەز لــەوە دەکــا کــە هەســت بــە خۆشــییەكو رازیبوونێکی دەروونی بکا کە کارێکی بەکەڵك ئەنجام دەدا. کارکردن شتێکی گرنگە بۆ زۆربەی ئێمەو بەشێکی زۆری ئێمە کاتمان بەسەر دەبەین لە چالاکیی کاردا. ئەگەر لە تواناماندا نــەبوو کە رەزامەندییەکی خودی بەدەست بێنین لە کارەکانماندا و هەست بەوە نەکەین کــە کارەکــەمان گرنگیو مانایەکی هەیە، ئەوە ژیان لە لامان بێهــوودەو بێزارکــەر دەبــێ. بەشــێکی زۆر لــەو کێشانەی رووبەڕووی رۆژنامەنووسی جیهانی سێهەم دەبنەوە، دەسووڕێنەوە بە دەوری رازیبوونی ئەو رۆژنامەنووسە لە کارەکەی خۆیو پێویستیشە ئەوە لە بەرچاو بگیرێ.

رۆژنامەنووسێکی گەنجی جیهانی سێهەم هاوبەشم بوو لە هەندێ لە کێشەکانمدا لە ســەرتای کارکردنمدا. ئەمەش پاش ئــەوەی خوێنــدنی تــەواو کــرد لــە زانکــۆی ولاّتەکەیــدا. نــاوی ئــەم رۆژنامەنووسەش ناهێنم چونکە کەسێکی لەرادەبەدەر شەرمنە. ئەم رۆژنامەنووسە پاش ئەوەی هەستی کرد بەوەی دەتوانێ متمانەم پێبکا، باسێکی وردو دووردرێژی هەســتەکانی خــۆی بــۆ

کردم کە دەسبەکاربووە لە یەکەم کاریدا لە یەکێك لە ئاژانسی دەنگوباسە ناوخۆییەکانی وڵاتێکی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

ئەم رۆژنامەنووسە نوێیە (تازەکارە) بۆی باس کردم کە لەگەڵ ئەوەدا مووچەیەکی باش وەردەگرێ، بەڵام پاڵپێوەنەرێکی وەها نەبوو پاڵی پێوە بنێ بۆ ئەوەی کارەکەی بە شێوەیەکی جوانو باش ئەنجام بدا، یا وەك خۆی دەیگووت: بەهۆی ئەوەوە کە هەموومان وەك دەرچووانی کۆلیژی زانکۆ لە چەند پۆستێکی مسۆگەردا کارمان دەکرد، هاوکارەکانم دەچوون بۆ سەر کار تەنیا بۆ رۆژنامە خوێندنەوەو چا خواردنەوەو چەنەبازی، تەنانەت خۆشیان ماندوو نەدەکرد بەوەوە کە بچنە بارەگای کارەکە، ئەگەر بتویستایە بابەتێك بنووسی، ئەوە چەند کەسێکی زۆرت نەدەبینی کە گرنگی بدەن بەو مەسەلەیە، چونکە ئەوانە حەزیان دەکرد لە گاڵتەکردنو توانجگرتنە خەڵكو هەستیان نەدەکرد بەوەی ئەو کارەی دەیکەن هیچ کاریگەریو سوودێکی دەبێ لە داوڕۆژدا.

## پێویستیی خۆئامادەکردن

ئەو رۆژنامەنووسە گەنجەی باس کرا خۆی لە بارودۆخێکی (سوریالی)دا بینییەوە، ئەو جموجووڵو چالاکییانەی پێویستن بۆ پرۆسەی کۆکردنەوەی زانیاریو بڵاوکردنەوەی هەواڵ ئەنجامی دەدان بە بێ ئەوەی تێبگا چی لە پشتی کارەکەوەیە یا ناوەرۆكو مەبەستی کارەکە چییە. لەگەڵ ئەوەدا کە ئێمە ناتوانین بڵێین هەموو رۆژنامەنووسەکانی جیهانی سێهەم یا زۆربەیان وەك ئەم رۆژنامەنووسە وان، بەڵام ئەو کێشەیەمان بۆ دەخاتە روو کە هەموو رۆژنامەنووسەکانی جیهانی سێ هاوبەشن تێیدا لەگەڵ ئەو گەنجانەی کە ژیانیان دەستپێدەکەنو تەنیا پشت دەبەستن بە توانای خۆیانەوە. کێشەکەش بریتییە لەوەی ئەوانە کە دەچنە ئەو بوارەو رێگە دەگرنەبەر دەبێ برێکی کەم خۆئامادەکردنو ئەزموونیان هەبێ، تا بتوانن ئەو لایەنانەی ژیان بخەنە روو کە دەبنە هۆی فەراهەمکردنی خۆشیو رەزامەندی لە ژیاندا بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو بارودۆخانەی خەڵك تووشی نائومێدیو خەمۆکی دەکەن.

بەهەرحاڵ ئەو رۆژنامەنووسەی باسمان کرد لە دواتردا تووشی بەختەوەری بوو، لە ناوەڕاستی ژیانی کارکردنیدا لەو بوارەداو بە کردەوە ئەزموونو راهاتنێکی باشی بەدەست هێناو توانی لە



پۆستەکەیدا پلەی بەرز بەدەست بێنێت بە رادەیەك بتوانێ کاریگەریی هەبێ لەسەر شێوازی بەڕێوەبردنی ئاژانسەکەو ئێستا بەختەوەرترە لەو کاتانەی سەرەتای کارکردنی لە ئەرکەکەیدا کە دڵەڕاوکێو راڕایی پێوە دیار بوو.

دواتر، لە شوێنێکی تری ئەم کتێبەدا بە دووروودرێژی باسی ئەو کێشانە دەکەین کە تایبەتن بە راهێنانی تەواوو خوێندەوارییەوە. بەڵام لێرەدا دەبێ ئەوە باس بکەین کە یەکێك لەو کێشە گەورانەی رووبەڕووی رۆژنامەنووسانی جیهانی سێ دەبنەوە، پێویستیی ئەوانەیە بە راهێنانێکی تەواو لە پەیمانگەو زانکۆکاندا پێش ئەوەی روو بکەنە بواری پیشەی رۆژنامەنووسی، چونکە زۆرجار بەرنامەی خوێندنی ئەوانە تەنیا لەسەر قسەکردنەو مامۆستا وانەیەکی تیۆرییان پێدەڵێ کە دوورە لە واقیعەوە.

لە گەلێك لە زانکۆکانی جیهاندا، خودی مامۆستاکان لەسەر ئەوە راهێنراون کار بکەن لە پیشەیەکی ئەکادیمییانەداو ئەوانە گوێ نادەن بە نان پەیداکردن لە رێگەی کارکردنێکی راستەقینەوە لە دەرەوەی زانکۆکانداو هەندێکیان کار دەکەن لە دوو یا سێ پۆستو شوێنی جیاوازداو خەریکی وانەوتنەوە نابن چەند کاتژمێرێکی کەم نەبێ لە رۆژداو ئەویش پچڕپچڕ. دەبێ رووبەڕووی ئەو حاڵەتەش ببینەوە، چونکە ژمارەیەکی گاڵتە پێنەکراو لە ئەندامانی چینی خوێنەوار لە جیهانی سێهەمدا لەوانەی کە لایان وایە مەرج نییە کار بکەن لە بوارێکی کردەییدا، چونکە کارکردن لەو بوارەدا پلەوپایەیەکی بەرزیان بۆ دەستەبەر ناکا. مرۆڤ دەبێ سەیری ئەو هەزاران پارێزەرە بکات کە لە زانکۆکانی جیهانی سێ دەردەچن، یا ئەو ژمارە زۆرەی پزیشك کە رەنگە لە بوارەکەی خۆیاندا کار ناکەن، چونکە ژمارەیەکی زۆر لەوانە لە بواری پزیشکیدا کار ناکەنو بەلایانەوە خۆشترە لە پایتەختی وڵاتەکەیاندا بمێننەوە.

هۆیەکی شاراوەی تر هەیە بۆ کەمیی ئامادەکاریی رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم، ئەویش ئەوەیە کە خوێندکاری زانکۆکان بۆ ساڵانێکی دوورودرێژ لە قسەکردن زیاتر ناتوانن هیچی تر بکەن. لەژێر سایەی ئەو سیستەمە کۆلۆنیالییانەی بە میرات ماونەتەوە بۆ ئەو دەوڵەتانەی تازە سەربەخۆییان وەرگرتووە، زۆربەی خوێنکارانی کۆلێژەکانی زانکۆ، تەنیا چاویان لەوەیە پلەوپایەو پۆستی گەورەیان چنگ بکەوێ. ئەگەر مرۆڤ توانای نەبوو کاریگەریی هەبێ لەسەر سیستمی سیاسیو ئابووری، ئەوە کاتێکی درێژ دەباتە سەر لە چەنەبازیو

قسەکردندا، تا ئەو کاتەی نائومێدیی دەگاتە رادەیەك کە توندوتیژیو کاری تیرۆریستیی لێدەکەوێتەوە یا شۆڕش بەرپا دەبێ. هەندێ لە خوێندکارانی جیهانی سێهەم پێیان ناخۆشە، جیهانی پارێزراوی زانکۆ بەجێ بێڵنو خوێندکاریی دەکەن بە پیشەی خۆیانو لەسەر ئەو حاڵە دەمێننەوە لە گەشتێکی بێکۆتاییدا لە خۆدەرخستنو لافلێدانو چەنەبازی بە بێ کردەوە.

رۆژنامەنووسی گەنجی جیهانی سێ، جگە لەوەی پێویستی بە ئەزموونی سەرەتایی هەیە، چەند کێشەیەکی قورستری لە بەردەمدایە کاریگەریی هەیە لەسەر کاری رۆژانەی، رەنگە گرنگترینیان ئەوەبێ کە کۆمەڵگەکەی وەك هەر کۆمەڵگەیەکی تری تازەپێگەیشتوو، کێشەو گیروگرفت لە هەموو لایەکەوە ئابڵوقەی دابێو رۆژنامەنووسیش ناتوانێ کاری خۆی بەجێ بگەیەنێت دوور لە خەڵك، چونکە ئەنجامدانی ئەو کارە بەشێکە لەوەی روو دەدا لە کۆمەڵگە یا شارەکەیدا. دەوڵەتە تازەپێگەیشتووەکانیش بە زۆری سەرچاوەیەکی دارایی کەمیان هەیە بۆ راهێنانو پەیوەندیو چاودێریی تەندروستیو خوێندن، یا بۆ دەستەبەرکردنی هێمنیو ئارامییەکی وا کە بتوانرێ کارەکان بە رێکوپێکی ئەنجام بدرێن لە سایەیدا.

رۆژنامەنووسێکی ئەفریقیایی گەنج دەیگوت: وڵاتەکەم وەك شارە مێروولەیەکی لە لم دروستکراو دێتە پێش چاو کە یەکێك شەقێکی تێهەڵبداو مێروولەکان بە راکردنو جووڵان بە هەموو لایەکیدا هەوڵ دەدەن وەك جارانی لێبکەنەوەو بەچکەکانیان بپارێزنو رێگە لە دوژمنو داگیرکەر بگرن، ئێمە لە بارودۆخێکی لەو جۆرەدا بووین. کاتێك سەربەخۆییمان بەدەست هێنا هەموو شتێك ئاوەژوو بوو، بە تەواوی لە شێوەی ئەو ئاژاوەو بێ سەروبەرییەی تووشی ئەو شارە مێروولەیە هاتبوو کە شەقێکی لەناکاوی بەرکەوتبوو.

## پێویستی بە پارەو سەرمایە

پێویستی بە سەرمایە کۆسپێکی رێگری گەورەیە کە بەشی زۆری رۆژنامەنووسانی جیهانی سێ رووبەڕووی دەبنەوە، پێویستی بە داهاتێك بۆ دابینکردنی ژیانی خۆیانو پێویستی بە یارمەتییەکی دارایی تەواو بۆ رۆژنامەکە یا هۆکانی تری راگەیاندن کە کاردەکەن تێیدا. هەندێ جاریش ئەو مووچەیەی کە دەدرێت بە رۆژنامەنووس لە جیهانی سێهەمدا بەشی بژێویی خۆیو خێزانەکەی ناکات، ئەمە وەنەبێ هەر لە هۆکانی راگەیاندنی بازرگانیدا وابێت بەڵکو لە



زۆر جاریشدا پۆستە دەوڵەتییەکانیش هەروان. بودجەی ناتەواوو کەمیی دەسکەوتی ساڵانەی دەوڵەتانی جیهانی سێ کاربەدەستان ناچار دەکا ئەوەندە کرێو مووچە کەم بکەنەوە کە زۆرجار ئەو کرێیە ناتوانێ شانبەشانی هەڵاوسانی پارەی وڵاتەکە بڕواو ئەمەش کێشەیەکە لە دەوڵەتانی جیهانی سێهەمدا راهاتوون لەگەڵیدا.

رۆژنامەنووسی جیهانی سێ ناچارە پەنا بەرێتە بەر کارکردن لە شوێنی تردا تا بتوانێ رووبەڕووی پێداویستییەکانی ژیان ببێتەوە، لە کۆماری (دۆمۆنیکان)دا، پێش چەند ساڵێك چاوم بە زۆر رۆژنامەنووس کەوت کە لە یەك یا دوو شوێنی تردا کاریان دەکردو ئەنجا دەگەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان پاش ئەوەی کە لە رۆژێکدا نزیکەی شانزە یا هەژدە کاتژمێر کاریان دەکرد. ئەو بەهایەی ئەو رۆژنامەنووسانە دەیاندا لە باری تەندروستیی دەروونیو لەشیانەوە ئەوەندە گران بوو هەندێکیان وا هەستیان دەکرد بەستراونەتەوە بە رەوڕەوەیەکەوە بەردەوام لە سووڕانەوەدایەو ماندووبوونو هیلاکی بووە بە شتێکی ئاسایی.

ئەم نەبوونی مووچەو کرێی تەواوە لە کاری رۆژنامەگەریدا بووەتە هۆی پەیدابوونی کێشەیەکی تر کە بریتییە لەوەی هەندێ رۆژنامەنووس ناچار بن بۆ وەرگرتنی بەرتیلو پارەی پێشەکی لەو خاوەن دەسەڵاتانەی دەیانەوێ رۆژنامە بە جۆرێك باسی بابەتێك یا هەواڵێك بکا کە بەلای ئەوانەوە پەسەندە. زۆر ئاسانیشە بۆ ئەوانەی کە کرێو مووچەیەکی باش وەردەگرن، بەرتیل وەرگرتن بە کارێکی ناڕەوا دابنێن کە لە زۆر لای گۆی زەویدا وەك نەخۆشی بڵاو بووەتەوە. بەڵام ئەوەی کە رۆژنامەنووس بە کارێکی ناڕەوای دادەنێو رقی لێیەتی، دەبێتە شتێکی پێویست ئەگەر بیەوێ بژێویی خێزانەکەی دابین بکا، یا جووتێ پێڵاوی تازە بکڕێ کاتێك کە پێڵاوەکەی دەدڕێو کون کون دەبێ. لە راستیشدا زۆرێك لە رۆژنامەنووسو سەرنووسەرەکان لە چەند دەوڵەتێکی ئەمریکای لاتیندا، حەقدەست یا پێشەکی وەربگرن لە سەرکردە سیاسییەکان یا پیاوانی کاربەدەست، لەوانەی دەیانەوێ رۆژنامەیەکی دۆستو لایەنگریان هەبێ. گەندەڵی بووە بە شێوازێکی ژیان لە هەندێ وڵاتدا، نەك هەر تەنها بۆ رۆژنامەنووسان بەڵکو بۆ خاوەن پۆستو کارەکانی تریش، چونکە هەموو مرۆڤێك لەوە گەیشتووە کە ئەگەر بیەوێ کارێك ئەنجام بدات لەسەریەتی بڕێك پارەی زیادە بدات.

کێشەی تایبەت بە کەمیی کرێو مووچە نزیکە لە کێشەیەکی ئابووریی ترەوە کە بریتییە لە پرۆسەی یارمەتیدانی هۆکانی راگەیاندنەوە لە زۆرێك لە دەوڵەتانی جیهانی سێهەم، بەڵکو بەشێکی زۆر لە رۆژنامە بازرگانییەکانیش ئەو یارمەتییە وەردەگرن بە شێوەیەکی راستەوخۆو ئاشکرا، یاخود لە شێوەی کرێی بڵاوکردنەوەی ئاگادارییەکانی دەوڵەتو سیاسییەکان. هەندێ رۆژنامەی واش هەن ئەوەندە بنەمای ئابوورییان فشوفۆڵو لاوازە، بە بێ ئەو یارمەتییە داراییە ناتوانن بەردەوام بن لە دەرچووندا، لە هەندێ وڵاتیشدا حیزبە سیاسییەکان بەشێك لە خەرجی دەرکردنی رۆژنامەیەك دەدەن، لەم حاڵەتەشدا ملکەچبوون بۆ ئەو حیزبو لایەنە سیاسییە شتێکی پێویستە.

ئەو کەسانەیش کە سەرپەرشتیی دەرچوونی رۆژنامەیەکی دەوڵەتی دەکەن، زۆر باش دەزانن کە بودجەی رۆژنامەکەیان کەم دەکرێتەوە یا خۆیان لە کارەکە دەردەکرێن ئەگەر بە خراپە باسی سەرکردەکانیان کرد لە دەوڵەتدا.

## پێویستی بە راستگۆیی

رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم رووبەڕووی کێشەیەکی تر دەبنەوە کە پەیوەندیی هەیە بە راستگۆییەوە. تەنانەت ئەگەر ئەو رۆژنامەنووسانە لەو کەسانە بن کە پابەندی رەوشتو راستگۆیی بنو ئاواتو هیوایان ئەوەبێ کە راپۆرتی وردو راست بنووسن لەسەر ئەو شتانەی کە روو دەدەنو پەیدا دەبن، کارمەندە گشتییەکانو هاووڵاتیان رەنگە لایان وابێ کە رۆژنامەنووسەکە پێویستیی بە رۆشنبیریو ئەزموون هەیەو حەزی لە وەرگرتنی بەرتیلە، یاخود وەك دەڵێن ئەو شت دەفرۆشێ بەو کەسەی پارەی زیاتری دەداتێ، پاشان کێشەی راستگۆیی هۆکانی راگەیاندن دەگۆڕێو دەبێ بە کێشەیەك پەیوەندیی هەبێ بە راستگۆیی خودی رۆژنامەنووسەکەوە. ئەگەر مرۆڤ متمانەی نەبوو بە راستگۆییو سەنگینیی رۆژنامەیەك ئەو باوەڕ بە راستگۆیی ئەو رۆژنامەنووسە ناکات کە کار دەکات لەو رۆژنامە یا هۆی راگەیاندنەدا.

تۆ دەتوانی دڵنیا بیت لەوەی کە زۆربەی کێشەکان پەیوەندییان هەیە بەیەکەوە، ئەو کێشانە بەشێکن لە کۆمەڵێ گیروگرفت کە رۆژنامەنووسی جیهانی سێهەم دەبێ هەڵسوکەوت



بکا لەگەڵیاندا، ئەم حاڵەتەش هەیە لە ناو هاوکارەکانی لە رۆژنامەنووسانی جیهانی پێشکەوتوودا، ئەوەندە هەیە کێشەو گرفتەکانی رۆژنامەنووسی جیهانی سێهەم قورسترو توندترن لە زۆر کاتدا.

لە هەندێ دەوڵەت یا کۆمەڵگەکاندا سەرکردە سیاسییەکان یا سەرکردەکانی تر، سوود وەردەگرن لە دەسەڵاتی رۆژنامە بە شێوەیەك کە خۆپەرستیی پێوە دیارەو لەپێناوی بنیاتنانو بەدەستهێنانی پلەوپایە بۆ خۆیان. ئەگەر لە یەکێك لە کۆمەڵگەکاندا یا لە یەکێك لە وڵاتەکاندا، رۆژنامە ئەو ناوبانگە ناشیرینەی دواکەوت ئەوا ئەو رۆژنامەنووسانەش کە کاردەکەن تیایدا، تووشی کێشەو گرفتی لەدەستدانی راستگۆییو متمانە نەمانو پەسەندنەکردن دەبنەوە لەلایەن ئەو کەسانەوە کە مامەڵە دەکەن لەگەڵیاندا یا خوێنەرانی ئەو رۆژنامەیەی کە کار دەکەن تیایدا.

جگە لەمانەش رۆژنامەنووسی جیهانی سێ، بەهۆی ئەوەوە کە تازەیە لەو بوارەداو پێویستی بە ئەزموون هەیەو لە وڵاتێکی تازەپێگەیشتوودا کار دەکات، دەبێ لە زۆر حاڵەتدا بەهاو نرخی ئەو میراتە ترسناکە بدات کە لە رۆژگاری ئیمپریالیزمەوە بۆی ماوەتەوە. دیارە کە وڵاتە داگیرکراوەکان لە سەرەتادا بۆ بەرژەوەندیی دانیشتووانی دروست نەکراون بەڵکو بۆ هێنانەدیی بەرژەوەندیی وڵاتانی داگیرکەر بووە، ئەوەش بەرژەوەندییەکی ئابوورییە، بەڵام هەندێ جار دروست دەکرێن بە مەبەستی بەرگریکردن لە دواڕۆژدا، یا لەبەر چەند هۆیەك کە پەیوەندیی هەیە بە سەربەرزیی وڵاتەکەوە.

رۆژنامەنووسی جیهانی سێ، سەیری ئەو کێشەو گرفتانە ناکا کە بۆی ماوەتەوە، وەك بابەتێك لەو بابەتانەی لە کتێبەکانی زانستییە سیاسییەکاندا بە زۆری باس دەکرێن. ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە ئەو رۆژنامەنووسە دەبێ ئەو میراتە ئیمپریالییە پەسەند بکا وەك حەقیقەتێکی راست هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکا. لەگەڵ ئەوەشدا کە چەندین سەرکردەی جیهانی سێ توانیویانە هۆکانی راگەیاندنی جەماوەری بەکار بێنن بۆ دامەزراندنی چەند حیزبێکی نیشتمانیو یارمەتیدان بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی، بەڵام رۆژنامەگەری بە شێوەیەکی گشتی، پێش ئەم چەند ساڵە کەمەی دوایی، هۆی سەرەکی بوونو دەرچوونیان لە زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێهەمدا، خزمەتکردنی بەرژەوەندیی دەوڵەتە داگیرکەرەکان بووە. خوێنەرانی رۆژنامەش بە شێوەیەکی گشتی ئەو چینە خوێنەوارە بیانییە بوون کە هاتوونەتە وڵاتەکە، یا ئەو کەسانەی کە بۆ بەرژەوەندیی دەوڵەتی داگیرکەر کاریان کردووەو بەرژەوەندییان لەگەڵ ئەواندا رێك کەوتووە. ئەو بەرنامەی هەواڵو زانیارییانەش بە جۆرێك دادەڕێژرا کە ببێتە هۆی چەسپاندنی ئامانجەکانی داگیرکەر یا ئامانجی چەند

هێزێکی سیاسی‌و ئابووریی دەرەکی. جگە لەمەش رۆژنامەی ئەو سەردەمانە بە زمانی دەسرۆیشتووە گەورەکانی پایتەخت‌و ناوچە ئیدارییەکان دەردەچوو.

تەلەفون‌و ئامێرەکانی ناردنی بروسکە، رێگەکان، هێڵی شەمەندەفەر، رێگەکانی سەر ئاو، دروست دەکران بە شێوەیەکی گشتی بۆ جێبەجێکردنی پێداویستییەکانی وڵاتی داگیرکەر. بۆ نموونە، ئەو رێگەیەی دروست کرا بە ناو جەنگەڵەکانی دورگەی (سولومون)دا، بۆ ئەوەبوو کە داگیرکەر بە ئاسانی بتوانێ باج‌و سەرانە کۆ بکاتەوە لە گوندەکاندا، ئیتر بیر لەوە نەکراوەتەوە بە دەگمەن نەبێ کە ئەو رێگەیانە خزمەتی پێداویستیی دانیشتووانی وڵاتەکە دەکەن یا نا. راستە لە هەندێ حاڵەتدا ئەمە رووی داوە، بەڵام لە هەندێ حاڵەتی تردا، ئەو رێگەیانە چەند گوندێکیان بەستووەتەوە بەیەکەوە کە ساڵانێکی دوورودرێژ شەڕو کوشتار بووە لە نێوانیانداو ئەم رێگە تازانەش بوونەتە هۆی ئاسانکاری لە هێرشەکانیاندا بۆ سەر یەکتر.

لە زۆر کاتدا، قەوارەو بنەمای سەرەکیی تایبەت بە هاتوچۆو کەلوپەل گواستنەوە لە وڵاتە داگیرکراوەکەدا، دەسکاری دەکرێن‌و دەگۆڕدرێن — بە شێوەیەك باشتر سوودیان لێوەربگیرێ — بۆ گواستنەوەی کەلوپەل‌و بەرهەم لە ناوچە کشتوکاڵی‌و دارستان‌و کانگاکاندا، زۆرجاریش ئەم دەسکاریکردنە نەگونجاوو تەواو نییە، هەروەها گەلێك ناوچە دەخرێنە پشتگوێ، چونکە گرنگییەکی زۆر کەمیان هەیە بۆ ئەوانەی ئەو بەرهەمانە دەگوێزنەوە.

یەکێك لە لێکۆڵەرەوەکان (جیراردو ئوجیدا کاستانیدا) سەرنجی لەوە داوە کە دروستکردنی هێڵی شەمەندەفەر لە کیشوەری ئەفریقیادا لەبەر پێداویستیی سەربازی بووە بۆ ئارامکردنەوەی بارودۆخی چەند شوێنێ کە ئاژاوەیان تێدا بووە، هەروەها بۆ گواستنەوەی بەرهەمەکان لە ناوچە کشتوکاڵی‌و کانگاکانەوە بۆ کەنار دەریای وڵاتە داگیرکەرەکە.

ئەو گرفت‌و کێشانەی تایبەتن بەوەوە کە تەنها گرنگی دەدرێ بە گەشەکردنی پایتەخت‌و شارە گەورەکان:

پێکهاتەی سەرەکی لە دەوڵەتێکی نموونەیی لە دەوڵەتەکانی جیهانی سێهەم زۆرجار وا دەکا پەیوەندیکردنی نێوان ئەو وڵاتەو پایتەختی وڵاتی داگیرکەر زۆر ئاسانتر بێ لە پەیوەندیکردنی نێوان ناوچە جیاجیاکانی خودی وڵاتەکەدا. پێویستە لەسەر رۆژنامەنووسان ئەوە لە بەرچاو بگرن کە پەیوەندیکردن زەحمەتە بەهۆی کەمیی خزمەتگوزاریی تەلەفون‌و بێتەلەوە، ئەمە جگە لە نەبوونی رێگەی چاك‌و هێڵی شەمەندەفەرو هێڵی ئاسمانی لە وڵاتەکەیاندا.



حاڵەتێکی تایبەتیی تر هەیە لە کۆنەوە ماوەتەوە، بریتییە لە زیادەڕەویکردن لە گرنگیدان‌و گەشەپێکردنی پایتەخت بە تەنیا یا لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لە شارەکان لە جیهانی سێهەمدا. ئەم گرنگیپێدان‌و گەشەکردنە لە رادەبەدەرە لە ناوچەیەکی بچووکی وڵاتەکەداو، بە پێچەوانەوە ئەو پشتگوێخستنەی ناوچە دوورەکان قورساییەکی تر دەخاتە سەرشانی رۆژنامەنووسان لە جیهانی سێهەمدا. جگە لەوەش، چڕکردنەوەی چالاکی بە شێوەیەکی زیاد لە رادە لە پایتەخت یا چەند شارێکی گەورەدا، دەبێتە هۆی ئەوەی زیاتر گرنگی بدرێ بە هەواڵ‌و رووداوەکانی شارە گەورەکان‌و لە هەمان کاتدا گوێنەدان بەو رووداوانەی شارە بچووك‌و ناوچە گوندنشینەکان. هۆکانی پەیوەندیش زۆر کات تا رادەیەك پێشکەوتووە لە ژمارەیەکی کەم لە شارەکانداو لە دەرەوەی ئەوانەدا ئەوەندە دواکەوتووە گریانت بۆیان دێت.

رۆژنامەنووس لە جیهانی سێهەمدا — وەك هەر خاوەن پیشەیەکی تر — خۆی راناگرێت لە بەردەم ژیانی خۆشی شارە گەورەکانداو مانەوەی لەو شارەدا لەبری ئەوەی سوود زیاتر بگەیەنێ لە چەند ناوچەیەکی تری وڵاتەکەدا. لە هەندێ پایتەختی جیهانی سێهەمدا رۆژنامەیەکی زۆر دەردەچن‌و ئەوانە زۆربەیان بە قەبارە بچووکن‌و رکەبەرایەتی دەکەن لەناو خۆیاندا بۆ راکێشانی خوێنەران، لە کاتێکدا لە شارە بچووکەکاندا تەنیا چەند هۆیەکی راگەیاندنی کەم هەن، ئەوانەش تووشی نەخۆشیی کەمخوێنی بوون، لە هەندێ وڵاتیشدا (رکەبەرایەتیی زیاد لە رادە) روو دەدا لە نێوان هۆکانی راگەیاندندا لە پایتەخت، کەچی لە دەرەوەی پایتەختدا هیچ دەزگاو ئامێرێکی هەواڵ‌و زانیاری چنگ ناکەوێت. رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم دەبێ خۆیان بپارێزن لەو لایەنگرییەی لە نائاگاییەوە تووشی دەبن‌و پێیان وایە، کە کارکردن هەر لە پایتەختدایەو لە هیچ لایەکی تری وڵاتەکەدا شتێکی وا گرنگ روو نادا. ئەو رۆژنامەنووسانە ئەگەر ئاگایان لە خۆیان نەبێت، ئەوە ئەو بۆچوونەیان رەنگە رەنگ بداتەوە لەسەر شێوازی نووسینی هەواڵەکانیان‌و جۆری بەدواداچوونی رووداوەکان.

رۆژنامەنووسی جیهانی سێهەم جگە لەو گرفتانەی پەیوەندییان هەیە بە باری ئابوورییەوەو لە داگیرکەرەوە بۆیان ماونەتەوە، لەگەڵ کێشەو گرفتی پەیوەندیکرن، پێویستە لەسەریان ئەو زمانە بیانییە بەکار بێنن کە داگیرکەرە پێشووەکەیان بەکاری دەهێنا. لە جیهانی سێهەمدا زۆر رۆژنامە دەردەچن بە زمانی ئینگلیزی‌و فەرەنسی‌و ئیسپانی‌و پورتوگالی، چونکە ئەم زمانانە ئەوانە بوون کە دەسەڵاتدارانی پێشوو یا ئەوانەی هاوبەش بوون لە بەرهەمی دەسەڵاتی داگیرکەردا، قسەیان پێدەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا کە هێشتا بەگوێرەی پێویست لێکۆڵینەوە نەکراوە لەم بارەیەوە، بەڵام وا

دەردەکەوێ کە بەکارهێنانی زمانێکی بێگانە بە ناچاریو زۆرەملێ، ئەوە دەسەپێنی بەسەرتا لە هەمان کاتدا شێوازی بیرکردنەوەی تایبەت بەو زمانە بەکار بێنی، بە جۆرێك کە گوزارش ناکا لە کولتوری نیشتمانیی رەسەنی ولاتانی جیهانی سێ. لە راستیشدا ئێستا رۆژنامەنووسانو خاوەن پیشەکانی تریش بە تەواوی چوونەتە قوولایی زمانو کولتوری بیانییەوەو لەگەڵ کولتوری تایبەتی خۆیاندا تێکەڵیان کردووە.

لەم حاڵەتدا زمانی داگیرکەران لە دەوڵەتەکانی جیهانی سێهەمدا کە دانیشتووانیان بە چەندەها زمان گفتوگۆ دەکەن، بووەتە زمانێکی وا بەشێکی زۆری خەڵك لە هەموو لایەکی ناوچەکە لێیتێدەگەن. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو زمانە وای لێنەهاتووە کە زۆر پەسەند بێت بۆ ئەوانەی کە ناچارن وەك زمانێکی دووهەم بەکاری بێنن.

کێشەیەکی تر رووبەڕووی رۆژنامەنووس دەبێتەوە کە بریتییە لە بوونی دەها جۆر زمان لە هەندێ ولاتانی جیهانی سێهەمدا، ئەم ژمارە زۆرەی زمان وا لە رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم دەکا کە دەبێ بەردەوام ئەوە بزانێ کە بۆ جەماوەرێکی زۆر سنووردار شت دەنووسێ، ئەگەر نا دەبێ نووسینەکانی وەرگێڕێ بۆ زمانەکانی تر. تەنانەت لەو ناوچانەشدا کە خوێنەران دەتوانن لەو زمانە تێبگەن کە رۆژنامەنووس پێی دەنووسێ، دەبێ ئەوە بزانێ کە رەنگە خوێنەرەوەکانی رۆژنامەکە خوێندەواری تەواو نەبن. هەروەها رۆژنامەنووس دەبێ ئەوە بزانێ کە ناگا بە زۆر کەس لەوانەی کە حەز دەکەن لە زانینو تێگەیشتنی ئەوەی کە دەگوترێو دەنووسرێ. نووسینی چاپکراو رەنگە بگاتە نەخوێندەوارەکانیش بەهۆی کەسانی ترەوە لە چاخانەی گوند یا جێگەکانی تری بەیەکگەیشتن. بەڵام بلاوبوونەوە کە سنووردارترە لەو نووسینو وتانەی کە شەپۆلەکانی هەوا بلاوی دەکەنەوە لە رێگەی رادیۆو تەلەفزیۆنەوە.

## قورسیو گرانیی نووسینی سادە

هەموو کاتێك ئامۆژگاریی هەموو رۆژنامەنووسان دەکرێت کە دەبێ نووسینەکانیان بە ئاسانی وەربگیرێو خەڵك لێیتێبگەن، بەڵام ئەو رۆژنامەنووسانەی لە جیهانی سێهەمدا دەژین، دەبێ زیاتر ئەوەیان لە بەرچاو بێ کە زۆربەی خوێنەران بە زەحمەت ئەو بابەتانە دەخوێننەوە کە بە سادەیی نەنووسرابن. هەروەها رۆژنامەنووسانی جیهانی سێ دەبێ هەموو کاتێك ئەوە بزانن کە نووسینی سادەو ئاسان، زۆرجار قورسو زەحمەتترە لە داڕشتنی بابەتێك لە چەند رستەی ئالۆزدا کە خەڵك لێیتێناگەن.



لەلایەکی ترەوە فاکتەری هەڵنانو پاڵپێوەنان هەیە لەلایەن هاوکارەکانو سەرچاوەکانی هەواڵەوە، چونکە ئەوە بۆ رۆژنامەنووس شتێکی زۆرە. لە راستیشدا جەماوەر دەمیان داخراوەو دەنگێکی وایان نییە، رەنگە ئەو پیاهەڵدانو مەحکومکردنەی هەندێ بابەت لەلایەن کۆمەڵە کەسێکی کەمەوە بێت لە خاوەن پیشەو ئەوانەی بڕیار بەدەستن، نووسین بۆ رازیکردنی ئەوانە کارێکی هەڵخەڵەتێنەرەو چەواشەکارییە، بەلای زۆربەی رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەمەوە.

رەنگە خوێنەری ئەم کتێبە هەست بکا بەوەی ئەو کێشانەی رووبەڕووی رۆژنامەنووسانی جیهانی سێ دەبنەوە ئەوەندە زۆرو مەترسیدارن بەلایەوە باشتر بێ کە رۆژنامەنووس کارێکی تر بکا جگە لە کارەکەی خۆی. راستە کە کاری رۆژنامەنووسی، وەنەبێ هەر کەسێك لە هەر شوێنێکدا لە توانایدا بێ ئەنجامی بدا، چونکە کارێکی قورسو گرانە. بەڵام ئەو کەسانەی هەست دەکەن بەوەی کە پێویستە جەماوەر ئاگادار بکاتەوە لە رووداوە گرنگو کاریگەرەکان، ئەوا ئەو پاداشتەی وەریدەگرن بەرامبەر بە کارەکەیان رەنگە ئەو ئەرکو ناڕەحەتییەیان لەبیر بەرێتەوە. ئەو پیشەو کارەی کە مرۆڤ بکا بە بەشێك لە رەوتی مێژوو و بیکا بە یارمەتیدەرێك بۆ (بەئاگاهێنانەوەی ئەو تواناو بەهرانەی کوژاونەتەوەو ساردوسڕن لەناو میللەتەکەیدا) لەو پیشانەیە کە لە هەموو شتێ زیاتر دڵی مرۆڤ خۆش دەکات.

رەنگە رۆژنامەنووسانی ئەمریکاو ئەوروپا، ئەرکو ماندووبوونێکی کەم بێتە رێیان سەبارەت بە بنیاتنانی میللەتێکی نوێ، بەڵام بۆ ئەوان وا باشترە ئەوە بێننەوە یادی خۆیان کە ئەوانەش رۆژێ لە رۆژان بەشێك بوون لە سەردەمی شۆڕشەکانیاندا وەك براو خوشکەکانیان لە ولاتە تازەپێگەیشتووەکاندا. گاندی، نیکرۆما، جوموکینیاتا، لە ریزی ئەو رۆژنامەنووسانەدا بوون کە پەیدا بوون لە سەردەمێکی نزیکی پێش ئێستاداو رۆڵێکیان هەبوو لە پێکهێنانی ولاتانی جیهانی سێهەمدا. بەڵام رۆژنامەنووسانێکی وەك، ساموئیل ئادمز، جون لوك، توم پین، ئەمانە لە کاتێکدا دەرکەوتن کە کۆمەڵگە نوێکانیان پێکهاتبوو.

# بەشی سێهەم
# بەها و گرنگیی هەواڵ لە هەرسێ جیهانەکەدا

**نووسینی: جاك لول**

هەوڵدان بۆ ناساندنی هەواڵ بەلای زۆرێك لە رۆژنامەنووسانەوە کارێکی ئەکادیمییانەیەو، پەیوەندیی هەیە بە مامۆستایانی زانکۆی تایبەتمەند لەو بوارەدا. هەندێك رۆژنامەنووسانیش کە دێنە سەر باسی پێناسەکردنی هەواڵ، هەر ئەو پێناسەیە دادەرێژنەوە کە (جیرترو شتاین) دایناوە کە دەڵێ (هەواڵ یانی هەواڵ)، بەڵام بە چەند وشەیەکی تر لەگەڵ پاراستنی ماناکەدا، رەنگە هەندێ رۆژنامەنووسی تر، هەواڵیان وەك برسییەتی دانابێ چونکە توانایان نییە پێناسەیەکی بۆ دابنێن، بەڵام دەزانن چییە کاتێك کە هەستی پێدەکەن.

ئەو گفتوگۆو مشتومڕەی لەم دواییەدا بەرپا بووە پاڵ دەنێ بە مرۆڤەوە بۆ گفتوگۆیەکی درێژتر دەربارەی بەها و گرنگییەکانی هەواڵ، هەروەها ئەوەش دەسەلمێنێ کە ئەو پێناسەکردنانەی هەواڵ تەواو نین. بۆ نموونە دەوڵەتانی جیهانی سێهەم رازی نین لەو بەسەرکردنەوەیە کە لەلایەن رۆژنامەنووسانی جیهانی یەکەمەوە دەکرێ بۆ وڵاتەکەیان لەبارەی چەندییەتییەوە، نەك هەر ئەوە بەڵکو رازی نین لەو بەها و گرنگییانەی هەواڵەکانی لەسەر بنیات دەنرێ. جیهانی سێهەم بەها و هەڵسەنگاندنێکی جیاوازیان دەوێ بۆ هەواڵەکانیان. جیهانی دووهەمیش کۆمەڵە بەهایەکی تایبەتیی خۆیان دەخەنە روو، بەڵام ئەم بەهایانەی ئەمان پەسەند نییە لای جیهانی یەکەمو رەنگە بەسەر جیهانی سێهەمیشدا جێبەجێ نەکرێن، هەر کەسێك سەیری ئەم جیاوازییە توندو دوورلەیەکانە بکات، یەکسەر تێدەگا کە مەبەست ئەوەیە بگەن بە پێناسەیەك بۆ بەهاکانی هەواڵ.

جگە لەو کێشە نێودەوڵەتییانەی تایبەتن بە تەوژمی راگەیاندنەوە، ناساندنی بەهاکانی هەواڵ گرنگییەکی خودیی گەورەیان هەیە بۆ رۆژنامەنووسان، چونکە ئەوانە هەموو رۆژێك دەبێ بڕیار بدەن هەواڵ چییە، هەر لەو پێشنیارانەوە کە تایبەتن بە ئەرکی لێکۆڵینەوەی درێژخایەنەوە تا دەگاتە لێکۆڵینەوە زیندوو و گەرمەکان لە شوێنی رووداوەکاندا، چونکە ئەگەر رۆژنامەنووس تەنیا ئەوە بەس بوو بەلایەوە کە ئاگاداری هەواڵەکە ببێتو پەرچە کردارێکی لا دروست ببێ، ئەوە بێبەشی دەکا لە



بەهرەی روونبینی کە دەکرێ بەکار بهێنرێ لە گۆڕانو پێشخستنی بیروبۆچوونەکانی یا چەند گۆشەو لایەنێکی نوێی هەواڵەکان.

بوونی پێناسە بۆ بەهاکانی هەواڵ گرنگە بۆ رۆژنامەنووسان لەلایەنی ئابووریشەوە، چونکە لەگەڵ بوونی سەرچاوەیەکی دارایی کەمو ئەو کاتە سنووردارەی دانراوە بۆ بڵاوکردنەوەی هەواڵ لە تەلەفزیۆنو رادیۆکانو ئەو گۆشە کەمو بچووکەی رۆژنامەکاندا، پرسیارێك دێتە پێشەوە کە بریتییە لە: چ جۆرە بابەتێك پێویستە هەڵبژێرێ بۆ هەواڵەکانی ئەمڕۆو کام بابەت شایانی ئەوەیە رۆژنامەنووس گرنگیی پێبداو کاتی خۆی بۆ خەرج بکات.

لەپێناوی لێکۆڵینەوەیەکی ورددا، دەبێ بەها و گرنگیی هەواڵەکان بە ئاسانی بکەین بە سێ بەشەوە کە پەیوەندییان هەیە بە جیهانی یەکەمو دووهەمو سێهەمیشەوە، لە راستیدا مەترسیی ئەم جیاکردنەوەو کشتگیریکردنە گەلێك گەورەیە، بە تایبەت لەو مەسەلەیەدا کە پەیوەندیی هەیە بە بابەتێکی وەك هەواڵەوە، چونکە ئەو مەسەلەیە رێگە دەدا بە بوونی جیاوازییەکی گەورە نەك هەر لەنێو دەوڵەتانداو بەس، بەڵکو لە نێوان هۆ جیاوازەکانی راگەیاندندا لە یەك وڵاتدا، بەڵام نموونەی ئەو سێ جیهانە رێگە دەدا بە گفتوگۆکردنی بەربڵاو لەسەر ئەو جیاوازییانەی هەن لە هەڵسەنگاندنو بەهای هەواڵەکاندا.

ئێمە لەم بەشەدا، ئەو گرنگیو بەهایانەی هەواڵ شیدەکەینەوە لە جیهانی یەکەمو دووهەمو سێهەمیشداو بەراوردێك دەکەین لە نێوانیانداو بەڵگە دێنینەوە لەسەر ئەوەی ئەو جیاوازییە گەورەو زۆرەی ئێستا هەیە لە گرنگیو بەهای هەواڵەکاندا، شتێك نییە کە بەم دواییە پەیدا بووبێ، بەڵکو لە ئەنجامی گۆڕانی سیاسیو فەلسەفیو ئابووری، ئەم سێ سەدەی دواییە هاتووەتە ئاراوە.

بەها و گرنگییەکانی هەواڵ لە جیهانی یەکەمدا، پێکهێنراوە لەلایەن خاوەن پرۆژە ئابوورییەکانەوە لە سەدەی حەڤدەهەمی پاش عیساو تا ئێستا هۆ ئابوورییەکان سەرپەرشتیو ئاراستەیان دەکەن. ئەم هۆکارە ئابوورییانە ئەو کاتە نەبوون، بەڵکو بە شتێکی بێزراوو ناشیرین دانراوە لە جیهانی دووهەمداو لەوێ کۆمەڵێك هۆکاری فەلسەفیو ئابووری بەها و گرنگیی هەواڵەکانی پێکهێناوە. کاتێکیش جیهانی سێهەم لە دەسەڵاتی ئیمپریالیزم رزگاریان بوو، بەها و گرنگیی هەواڵ زیاتر جیاوازو جۆراوجۆر بووو دەوڵەتانی جیهانی سێهەم، خاوەن رابوردووی کۆتکراوو پاشەڕۆژی فشوفۆڵی نامسۆگەر، توانییان چەند سیستمێکی رۆژنامەوانیی تایبەت بە خۆیان دروست بکەن کە خاوەنی بەها و گرنگییەکی گونجاو بن لەگەڵ وڵاتو میللەتەکەیاندا.

لەگەڵ کۆتاییهاتنی ئەم بەشەدا، رەنگە رۆژنامەنووسان لەوە تێبگەن کە باشتر وایە، وشەکانی شکسپیر سەرلەنوێ دابڕێژنەوە لەبری وشەکانی شتاین، ئەوە بە دووبارەکردنەوەی ئەوەی کە دەڵێ (هەواڵ ئەوەیە لە چاوی بینەردا بێ).

## بەهاو گرنگییەکانی هەواڵ لە جیهانی یەکەمدا

**پێشینەیەك:**

لە سەرەتادا، وشەو رستە چاپ دەکران لەسەر لاپەڕەکان بەهۆی ئامێرە داهێنراوە سەیرەکەی (یوهان گۆتەنبرگ)ەوە، دواتر پیتی چاپی جوولاّوو ئامێری چاپکردنیش کە بە ماوەیەکی کەم بە دوای ئەودا دەرکەوتو شۆڕشێکیان بەرپا کرد لە ئەوروپادا لە سەدەی پازدەهەمی پاش پەیدابوونی عیسا. ئەم شۆڕشە وەك بەڵگەی لەدایکبوونی پەیوەندیی جەماوەریی راستەقینە وابوو. وشەی چاپخانەیش هێشتا هەر بەکاردەهێنرێ بۆ ئاماژەکردن بە هۆکانی راگەیاندنی تایبەت بە پەیوەندیی جەماوەر بەیەکەوە بە گشتی.

پاش داهێنانو دروستکردنی چاپخانە، سەرکەوتنی پرۆژەکە پێویستیی هەبوو بە هەنگاوێکی بچووکتر لەلایەن خاوەن پرۆژە ئابوورییەکانەوە بۆ برەودان بە شتێك کە ناوی هەواڵە. هەرچەندە هەر لە سەرەتای دروستبوونەوە هەواڵ ئەمسەرو ئەوسەری پێدەکرێ لەناو خەڵکدا، بەڵام داهێنانی چاپخانە شوێنی خۆش کرد بۆ بڵاوبوونەوەی هەواڵ لەناو خەڵکدا، پیاوانی سەرمایەدارو خاوەن کاریش، بۆیان دەرکەوت دەتوانن پارەیەك بدەن بۆ ئەوەی هەواڵیان دەسبکەوێ. بە هاتنی سەدەی شازدەهەم لە هەموو لایەکی ئەوروپادا، نموونەی سەرەتایی رۆژنامە بڵاو کرایەوەو دەفرۆشرا.

بەڵام چ جۆرە زانیارییەك دەگوێزرایەوە؟ جۆری هەواڵەکان چی بوون لەو کاتەدا؟ ئەو نموونانەی ماونەتەوە لە بەردەستماندا تا ئێستا پشتگیریی ئەو خاوەن بیروبۆچوونانە دەکەن کە بڕوایان وایە، بەهایەکی جیهانی هەیە بۆ هەواڵ. چونکە بابەتو ناوەرۆکی زۆر لە رۆژنامەکانی ئەو سەردەمە لە یەکچوونێکی سەرنجڕاکێشیان تیایە لەگەڵ بابەتو ناوەرۆکی رۆژنامەکانی سەردەمی ئەمڕۆماندا. ئەلبرت هستر دەڵێ: کاتێك کە لە چەند نموونەیەکی رۆژنامەکانی سەرەتای سەدەی یەکەمی چاپ دەکۆڵینەوە، توانای هیچمان نامێنێ ئەوە نەبێ دڵنیا بین لەوەی کە بابەتەکانیان بڕێکی زۆریان تێدایە لەوانەی کە ئێستاش لە رۆژئاوادا بە (هەواڵ) دادەنرێن، واتە هەڵسوکەوتو کردەوەی کەسە دەرکەوتووەکانو بەڕێوەبردنی جەنگو هەواڵی وورووژێنەرو سەیروسەمەرە.



هەندێ لە رۆژنامە سەرەتاییەکانی ئەو سەردەمە لە توانایاندا بوو کە رووداوە گرنگەکانی ئەو سەردەمە جیا بکەنەوەو تۆماریان بکەن. لە ساڵی (١٤٩٣)دا، یەکێك لە رۆژنامەکان نامەیەکی دەریاوانی گەڕیدە (کریستوفر کولومبس)ی بڵاو کردەوە، ئەوەی تیابوو کە ناوچەیەکی دۆزیوەتەوە، پێشتر نەبینراوو نەزانراو بووە. بەڵکو هەندێ رۆژنامە وا دەردەکەون کە هەوڵی ئەوەیان دابێ وەك رۆژنامەکانی ئەمڕۆ وابن کە هەموو ئەو هەواڵانە بڵاو بکەنەوە کە کەڵکی بڵاوکردنەوەیان هەبێ. بۆ نموونە مانشێتی یەکێك لە رۆژنامەکانی ئەڵمانیا کە لە ساڵی (١٦٠٩)دا دەرچووە بریتییە لە: (پەیوەندیی نێوان ئەوەی رووی دا لە ئەڵمانیاو ئیتالیاو ئیسپانیاو هۆڵەنداو ئینگلتەراو فەرەنساو مەجەرو نەمساو سویدو پۆڵەنداو لە هەموو هەرێمەکانو لە ئەندیزی رۆژهەڵاتو رۆژئاوا...... هتد).

دەسەڵاتی فاشستییەکان بەسەر ئەو رۆژنامانەدا کە ناوەرۆکێکی سنوورداریان هەبوو کارێکی پەسەندو ئاسایی بوو. لە سەدەی حەڤدەهەمدا رۆژنامەکان چاودێریو سانسۆرێکی توندوتیژیان خرابووە سەر لەلایەن فەرمانڕەوایانی ئەو سەردەمانەوە وەك بنەماڵەی تیودۆر لە بەریتانیا، بنەماڵەی بوربون لە فەرەنساو بنەماڵەی هابسبرگ لە ئیسپانیا.

بەڵام سەدەی هەژدەهەم سەردەمی شۆڕش بوو، سووربوونو پێداگرتنی بەخۆوە بینی لەسەر ئازادیی ئایینو مافی سیاسیو بازرگانیی ئازادو ئازادیی تاکەکەسەکان وەك (سەربەستیی بیروڕا). هەروەها ئەو سەدەیە دەرکەوتنێکی روو لە زیادبوونی بەخۆوە بینی سەبارەت بە رووکردنە عەقڵانییەتو بیرکردنەوەی زانستیو حەقیقەتی دامالڕاو لە جوانکاریو رازاندنەوە نرخێکی گەورەی پەیدا کرد، هەروەها زانیاریی راست رێزی پەیدا کرد لای خەڵك.

لە سەدەی نۆزدەهەمدا لایەنە فەلسەفییەکانی راستگۆیی بەهێز بوو بەهۆی ئایینو هۆی ئابوورییەوە، چونکە پاش دروستکردنی ئاژانسەکانی دەنگوباس، راستگۆیی بوو بە شتێکی پێویستو سەرەکیو لەبەر ئەوەی سوودمەندانی ئاژانسەکانی دەنگوباس بیروباوەڕی ئایینیو سیاسیی جیاوازیان هەبوو، ئەو هەواڵانەی دەشێوێنران بۆ بەرژەوەندیی یەکێك لە سوودمەندەکان زیانی دەگەیاند بە سوودمەندێکی تر. پاش ئەوە پابەندبوون بە راستگۆییەوە بەرامبەر بەو هەواڵانەی بە بێتەل بڵاو دەکرێنەوە بوو بە پێویستییەکی ئابووری.

رەنگە کارێکی زەحمەت بێ ئەگەر زیادەڕەوی بکەین لە دیاریکردنی گرنگیی ئاژانسەکانی دەنگوباس سەبارەت بە هەواڵەکانی جیهانی یەکەم. لە راستیدا وەك (هاشتین) دەڵێ (مێژووی سیستمی نێودەوڵەتیی ئێستا بۆ بڵاوکردنەوەی هەواڵ، لە بنەڕەتدا، سەرگوزەشتەی ئاژانسەکانی دەنگوباسی جیهانەو بەکارهێنانیانە بۆ داهێنراوە تەکنۆلۆژییە پێشکەوتووەکان).

لە ساڵی (١٨٣٥)دا، چارلز هافاس، دەنگوباسی پەیوەند بە کاروباری داراییو بازرگانییەوە بەهۆی کۆترە نامەبەرەکانەوە دەگەیاندە شوێنانی تر. لە ساڵی (١٨٥١)دا، بول یولیوس رویتر کە یەکێك بوو لە کارمەندەکانی هافاس، ئاژانسێکی دروست کرد بۆ گواستنەوەی نامە بەهۆی بروسکەوە. لە ساڵی (١٨٤٨)دا، ئاژانسی (ئەسوشیتدپریس) لە نیویۆرك دروست کرا، لە ساڵی (١٩٠٧)دا، ئاژانسی (یونایتدپرس) کەوتە رکەبەرایەتی لەگەڵ هەردوو ئاژانسەکەی دەستە خوشکیدا. هەروەها هاشتین دەڵێ: هەر کە تەلگرافو بێتەلو (دواتر رادیۆ)و مانگی دەستکرد خرانە کار، ئاژانسەکانی دەنگوباس یا خزمەتگوزاری بروسکە (وەك ئەو کاتە پێیان دەگوت)، دەستیان کرد بە بەکارهێنانی هەر ئامێرێکی نوێ بۆ گواستنەوەی هەواڵ لە پایتەختێکەوە بۆ پایتەختێکی تر بە شێوەیەکی خێرا.

پاش ئەوەی کە جیهان هەموو پەیوەست بوو بەیەکەوەو لەبەر ئەوەی توانای ئەوە پەیدابوو کە بتوانرێ پەخشێکی رادیۆ یا تەلەفزیۆن یەکسەر لە هەر شوێنێکی سەر زەوییەوە جێبەجێ بکرێو پاشتر لەسەر مانگ خۆیەوەو پاش ئەوەی کە پڕکردنەوەی رووبەری ستوونیی رۆژنامەکانو بەکارهێنانی کاتی بڵاوکردنەوەی هەواڵو فرۆشتنی زانیاری بوو بە شتێکی پێویستو دەبێ پابەند بن پێیەوە، توانای گەورەو قەبەی ئاژانسەکان لە جیهانی یەکەمدا کاریگەرییەکی راستەوخۆی پەیدا کرد لەسەر بەهاو گرنگیی هەواڵەکان، بە بێ چەنو چوونکردن.

## بەهاکانی هەواڵ

چەند لێکۆڵینەوەو نووسینێك دەرکەوتوون کە باس لە بابەتی بەهاکانی هەواڵ دەکەن لە جیهانی یەکەمدا، هەر کام لە جالتانج، روج، روبین، هستر، ئیبرهارد، لیستێکیان داناوە بۆ بەهاو تایبەتمەندییەکانی هەواڵ وەك خۆیان بۆی دەچن. ئەم سەرچاوانەو هیتریش جیاوازییەکی کەمیان هەیە لە بەرودواخستنی بەهاکاندا، بەڵام رێکەوتنێکی تەواو هەیە دەربارەی هەندێ لەوانە.



## خێرا بڵاوکردنەوەی هەواڵ

هەواڵ لە جیهانی یەکەمدا ئەوەیە کە ئێستا روو دەدا، هەواڵ بریتییە لە رووداوی نوێ، هەواڵ ئەو رووداوە نوێو گۆڕان بەسەرداهاتووەیە کە بە زۆری بەردەوامبوونی رووداوەکەی رۆژی پێشوو یا چرکەیەکی پێشترە، لەو لێکۆڵینەوەدا کە هسترو ئیبرهارد ئەنجامیان داوە لەسەر ئەو مەسەلانەی کە زۆر بڵاونو باسکراون لە بیستو پێنج کتێبی تایبەت بە رۆژنامەوانیی رۆژاواوە مەسەلەی خێرا بڵاوکردنەوە یا دانانی کاتی گونجاو، لە ریزی پێشەوەی لیستەکەدان.

گومان لەوەدا نییە کە هۆکانی راگەیاندن لە جیهانی یەکەمدا توانای ئەوەیان هەیە بە خێرایی هەواڵو رووداوەکانی بیستو چوار کاتژمێر لە شەوو رۆژدا بەسەر بکەنەوە. ئەو پرسیارەش کە لێرەدا دێتە پێشەوە ئەوەیە بۆ پێ دادەگیرێ لەسەر ئەوەی کە لە هەمان کاتژمێرو خولەکدا هەواڵ بڵاو بکرێتەوە؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا هەندێك دەڵێن زوو ئاگاداربوون لە هەواڵ دەکرێ دابنرێ بە تایبەتمەندییەکی گەورە لە سەردەمی نوێدا، چونکە دواکەوتن لە گۆمەڵگەیەکدا کە بە خێرایی لە جووڵەدایە، مانای دوورکەوتنەوەیە لە شێوەی رووداوەکە.

رەنگە هۆ دەروونییەکانیش لە پشتی ئەم بەهادانانەوە بن بۆ هەواڵەکان کە زاڵ بوون بەسەر خەڵکدا، چونکە هەواڵ هەستی گۆڕانو جووڵان دەبەخشێ بە خەڵك. کاتێك کە مرۆڤ بەیانی بەئاگا دێتو گوێی لە هەواڵێکی تازە دەبێت، هەستێکی لا دروست دەبێت کە ژیان هێشتا بەردەوامە.

## نزیکیی شوێنی رووداوو هەواڵ

هەواڵ لە جیهانی یەکەمدا گرنگ ئەوەیە لە نزیکەوە بێت. خوێنەران دەیانەوێ هەواڵێك بخوێننەوە لەسەر کیشوەرو شارو دەوڵەتو ناوچەو وڵاتو گەڕەکی دراوسێو ئەو شەقامەی تێیدا دەژین، بەڵکو باشتر ئەوەیە دەربارەی نزیکترین دراوسێیان بێ. دیاموند دەڵێ (هۆکانی راگەیاندنی ئەمریکا، دەچن بە دەنگی هەواڵەوە بە پشتبەستن بە چەند هاوکێشەیەکی جێگیرەوە کە پەیوەندیی هەبێ بە نزیکیی شوێنی رووداوەکەوە، بۆ نموونە هەواڵی مردنی دە هەزار کەس لە وڵاتی نیپاڵدا بەرامبەرە بە مردنی سەد کەس لە ویلزو دە کەس لە وێست فەرجینیاو یەك کەس لە خانووەکەی دراوسێدا).

## کەسیەتییە دەرکەوتووو ناودارەکان

هەواڵ بریتییە لە کەسیەتییە دەرکەوتووو گشتییەکان. لە هەموو لایەکی جیهانی یەکەمدا، دەنگوباسی پیاوانی سیاسیو ئەندامانی خێزانی شاهانە، پاڵەوانانی وەرزش/ کورو کچ، ئەستێرەکانی سینەما، ناودارەکان، بەدڕەوشتەکان، مانشێتی رۆژنامەکانیان داگیر کردووە. هەندێ لەو کەسایەتییانە ئەوەندە بەناوبانگو دەرکەوتوون هەرچۆنێك بجوولێنەوەو هەر هەنگاوێك هەڵنێنەوە دەبێ بە هەواڵێك، بۆ نموونە، سەرۆکی دەوڵەتێك پشوویەك وەرگرێ، کچە شازادەیەك لەسەر کەناری دەریایەك خۆی دابێتە بەر هەتاو، ئەمانە دەبنە هەواڵی لاپەڕەی یەك.

روبین دەڵێ: (کەسیەتی هەواڵ دروست دەکا)، هەروەها روبین، لە هوارد ك. سمێپ، کارمەندی بواری پێشووی تەلەفزیۆنەوە دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: (هەواڵی تەلەفزیۆن بریتییە لە وێنە لەگەڵ وشەیەك لەگەڵ کەسیەتییەکدا).

(جیرمی تانستول)یش دەڵێ: ئاشکرایە کە بەهاکانی هەواڵ شێوەیەکی قووچەکییان (هەرەمی) هەیە، واتە ئەو کەسانەی لە لووتکەی دەسەڵات یا رێکخراوەکان، یا سەندیکا کرێکارییەکان، یا گروپەکانی یاریی تۆپی پێدا بن دەبێ شتی زۆری سەرنجراکێشیان لابێ کە قسەیان لەسەر بکەنو بەو هۆیەوە زیاتر گرنگییان پێدەدرێ لەوەی کە دەدرێ بە دەنگدەرێك، کارمەندێکی ئاسایی، ئەندامانی سەندیکا کرێکارییەکان، یاریزانێکی یەدەك.

جگە لەوەی کە کەسیەتییە ناودارەکان، هەندێ مەسەلەی سەرنجراکێشیان لایە باسی لێوە بکەن، هەر شایانی ئەوەن، بە دوای هەواڵەکانیاندا بچین لەبەر چەند هۆیەکی هەستپێکراوو بەرچاو بە رادەیەکی کەمتر چونکە جەماوەر دەکەوێتە ژیانێکی ترەوە لە ئەنجامی ئاگاداربوون لە کردەوەی باشو سەرەڕۆییەکانی ئەم کەسییەتانەوە. بە هەزاران درەخت ژیانی خۆیان کرد بە قوربانی بۆ ئەوەی کاغەزی ئەو رۆژنامانەی لێدروست بکرێ کە بەکارهێنران بۆ بەدواداچوونو بەسەرکردنەوەی شووکردنەکانی ئەکتەری جیهانی (ئەلیزابیت تایلۆر)، ئەم نموونەیە رادەی کاریگەریی ئەو بەها هەواڵییەمان بۆ دەخاتە بەرچاو.



## ڕووداوە نائاساییەکان

هەواڵ بریتییە لە شتێکی سەیرو سەرنجراکێش یا نائاسایی. لە جیهانی یەکەمدا ڕووداوە ناوازەو تایبەتەکان بە هەواڵ دادەنێن. ئەم بەهایەی هەواڵ گوازراوەتەوە بۆ رۆژنامەنووسان لە رێگەی ئەو رستە کۆنەی هەواڵەوە کە دەڵێ: ئەگەر سەگێك پیاوێکی گەزی، ئەوە پێی ناگوترێ هەواڵ بەڵام ئەگەر پیاوێك قەپێکی گرت لە سەگێك ئەوە بابەتێکە دەشێ بۆ رۆژنامەو بەکەڵکی ئەوە دێت لە لاپەڕەی یەکدا بڵاو بکرێتەوە.

رەنگە ئەم بەهایەی هەواڵ لە هەموو بەهاکان زیاتر ڕووبەڕووی رخنە ببێتەوە. جیمس رستون، ئەم کێشەیەی بە کورتی خستووەتە روو و دەڵێ: ئێمە شەیدای خودی ڕووداوەکانین نەك ئەوانەی دەبنە هۆی ڕووداوەکان.

لەگەڵ ئەوەدا کە ئاسانە رەخنە بگیرێ لەم بەهایە، بەڵام چەند شەپۆلێکی بەهێز هەن خوێنەرو رۆژنامەنووسیش بەیەکەوە پاڵ پێوە دەنێ بۆ ئەوەی لە ڕووداوە نائاساییەکان ورد ببنەوە.

ئەگەر بگەڕێینەوە بەرەودواوە بۆ ساڵی ١٩٢٢، دەبینین (والتر لیبمان) ئەو فاکتەرانە بەو شێوەیە تێدەگاو دیارییان دەکا کە دەڵێ: مەسەلەکە ئەوەیە پێش ئەوەی زنجیرە ڕووداوێك ببن بە هەواڵ، دەبێ وا لە خۆیان بکەن کە شایانی ئەوە بن لە کردەیەکی شێوە ئاشکرادا، خەڵك لێیان ورد بێتەوەو گرنگییان بداتێو بە شێوەیەکی گشتی کردە کە بە رادەیەکی گەورە ئاشکرا بێ. لیبمان لێکدانەوەی خۆی بۆ ئەم جۆرە بەهایانەی هەواڵ دەخاتە روو و بیروبۆچوونەکانی روونیو رەوانبێژییان پێوە دیارە بە رادەیەك ناچارمان دەکا قسەکانی وەك خۆی لێوە بگێڕینەوە:

هەواڵ بریتییە لە باسکردنی ئەو دیاردانەی سەرنج رادەکێشن، گوشارکەوتنە سەر رۆژنامە بۆ ئەوەی پابەند بێ بەوەوە لە چەند لایەکی زۆرەوە دێن. یەکەم لە پەیڕەوکردنی ئەو سیستمەدا کە تایبەتە بە تەنیا گرنگیدان بەو لایەنە رۆتینییەوە کە راهاتوون لەسەری لە حاڵەتێکدا. دووهەم بەهۆی قورسیو گرانیی پەیداکردنی چەند رۆژنامەنووسێکەوە، بتوانن ئەو شتانە ببینن کە پێشتر فێر نەبوون بیانبینن. سێهەم، بەهۆی ئەو قورسیو گرانییەی کە ناکرێ خۆتی لێبپارێزیو تایبەتە بە دابینکردنی رووبەرێکی واوە کە رۆژنامەنووس بتوانێ بەکاری بێنێ بۆ ئەوەی بیروبۆچوونە نائاساییەکەی خۆی لای خەڵك وا لێبکا پەسەندبێو وەریبگرن. چوارەم، بە

مەبەستی ئابووری کە بریتییە لەوەی سەرنجی خوێنەر خێرا رابکێشێ بۆ مەسەلەکە، یاخود لە رێی خۆخستنە مەترسیی زیانی ئابوورییەوە کە بریتییە لە نەورووژاندنو سەرنجڕانەکێشانی خوێنەر بە هیچ جۆرێك یا خراپەکردن بەرامبەری بە چەند هەواڵێکی چاوەڕوان نەکراوو ئەنجا گێڕانەوەی بە شێوەیەکی ناتەواو.

## لایەنی گرنگیدان بە مرۆڤ

هەواڵ ئەوەیە پەیوەندیی هەبێ بە خەڵکی ئاساییەوە، لایەنی جیاوازییان، لەیەکچوونیان، باشیو مەردایەتیی زۆریان، لایەنی نەفس نزمییان. واتە هەر سەرچاوەیەکی گەورەییو نزمیو پەستیی مرۆڤ دەشێ بۆ ئەوەی ببێ بە هەواڵێك لە جیهانی یەکەمدا.

لە شاری نیویۆرکدا دوو حاڵەت رووی دا کە دەکرێن بە دوو نموونە بۆ ئەم جۆرە بەهایە لە هەواڵدا. ساڵی ١٩٨٤ پۆلیسێکی نهێنی پاش ئەوەی لە خواردن بوویەوە لەو چێشتخانەیەدا کە هەموو رۆژ نانی لێدەخوارد، بانگی ئەو کچەی کرد کە خواردنی بۆ خەڵك دادەنا پێی گوت: لەبری ئەوەی بە خششت بدەمێ، بلیتێکی یانەسیب بە یەکەوە پڕ دەکەینەوەو چیمان بۆ دەرچوو بە نیوەیی بەشی دەکەین. بە رێکەوت بلیتەکە خەڵاتی یەکەمی بۆ دەرچوو، پۆلیسەکە گفتەکەی خۆی هێنایە دیو ئەو چەند ملیۆن دۆلارەی لەگەڵ کچەکەدا کرد بە دوو بەشەوەو مەسەلەکە بۆ ماوەی هەفتەیەکی تەواو مانشێتی رۆژنامەکانی بۆ خۆی داگیر کرد.

هەر لە کۆتایی ساڵی (١٩٨٤)دا، پیاوێك لە شەمەنەفەرێکی ژێر زەویدا لە شاری نیویۆرك، تەقەی کرد لە چوار کەس کە دەیانویست رووتی بکەنەوە، یەکێك لەوانە بە خەستی بریندار بوو، ئەم رووداوە بۆ ماوەی چەند هەفتەیەك هەر بەسەر دەمی خەڵکەوە بوو، مشتومڕ پەیدا بوو لەناو رۆژنامەنووسانو هاووڵاتییاندا کە ئایا ئەو پیاوە پاڵەوانە خۆی پاراستووە یا دەسدرێژیی کردووەتە سەر خەڵكو سنووری یاسای بەزاندووە. تاکە وەڵامی راست لەسەر ئەو پرسیارە ئەوەیە کە ئەو رووداوە بەهایەکی گرنگی هەبوو وەك هەواڵێكو رووداوێکی ئاسایی نەبوو.

جارێکی تر لیبمان چەند هۆیەك دەخاتە بەردەست کە ئەو جۆرە رووداوانە شایانی ئەوەن ببن بە هەواڵو بگێڕرێنەوەو دەڵێ: خوێنەر دەیەوێ هەست بکا بەوەی بە تەواوی چووەتە ناو



هەواڵەکەوەو تێکەڵ بووە لە گەڵیدا، ئەو هەواڵانەی رێگەی ئەوە نادەن بە خەڵك لەگەڵ ئەو ململانێیەدا تێکەڵ بن کە باسیان دەکەن یا وێنەیان دەگرن، ئەوە بەلای جەماوەرێکی زۆری خوێنەرانەوە خۆش نییەو بەدڵیان نییە. جەماوەر دەبێ هاوبەشی بکەن لە هەواڵدا بەو رادەیەی هاوبەشی دەکەن لە شانۆگەرییەکدا لە رێگەی تێکەڵبوون لەگەڵیدا.

## ململانێ

هەواڵ لە جیهانی یەکەمدا بریتییە لە نەبەردو ململانێ، ئەگەر خەڵك لە کۆبوونەوەی ئەنجومەنی شار، یا پەرلەمان، یا لەسەر شەقام، یا لە گۆڕەپانەکانی نەبەردا، بەربوونە یەكو شەڕیان کرد ئەوە هەلێکی باش هەڵکەوتووە بۆ هەواڵ.

وەك جیهانی یەکەم بۆیان دەرکەوتووە، کاری ئاژاوەو شەڕوشۆڕ هەر بەردەوام دەبێو دەمێنێتەوە.. ئوتیس بایك، کە رۆژنامەنووسێکە، ستوونێکی تایبەتیی خۆی هەیە لە رۆژنامەی (نیوزدای) دەڵێ: رووداو ئەگەر تۆقێنەر نەبوو، یا ترسێکی نەخستە دڵەوە، ئەوە بەکەڵکی ئەوە نایەت ببێ بە هەواڵ. لەگەڵ ئەوەشدا کە دەبێ ناوچەیەکی ناوەڕاست هەبێ لە نێوان مرۆڤێکی لە رادەبەدەر گەشبینو عیزرائیلدا، بەڵام وا دەردەکەوێ هۆکانی راگەیاندن، ناچنە ژێر ئەوەی (هەواڵی خۆش) شایانی ئەوە بێ گرنگیی پێبدرێ.

هەندێکیش دەڵێن: خۆخەریککردنی هۆکانی راگەیاندن بە هەواڵی ململانێوە، رەنگدانەوەی خودی مرۆڤە بۆ ئەو بەزمە. شەیدابوونی مرۆڤ بە ململانێوە، بە سادەیی ئەنجامی ئەو وورووژاندنەیە کە پەیدا دەبێ لە تێکەڵبوونو چوونە پێستی ئەوانەوە کە خەریکی ململانێکەن وەك ئارامی بەخشینێك بە باری سۆزداریی لەلایەن خوێنەرانەوە.

## بەسەرکردنەوەیەکی تایبەت بە بەهاکانی هەواڵی جیهانی یەکەم

یەکێك لە پایە گرنگەکانی لێکۆڵینەوەی بەهاکانی هەواڵ، بریتییە لە چۆنیەتیی هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ ئەو بەهایانەدا کە لە بەسەرهاتو رووداوە تاکەکەسییەکاندایە. لە راستیدا گەلێك لەو رووداوانە پەیدا دەبن لە نێوان ئەو کاتەدا کە رۆژنامەنووس بڕیاری شایستەی یەکێك لەو رووداوانە دەدا بۆ ئەوەی بکرێ بە هەواڵێكو نووسینی ئەو هەواڵەو

دەرکەوتنی لەسەر لاپەڕەی رۆژنامەیەك یا لە هەواڵەکانی رادیۆو تەلەفزیۆندا، خستنەڕووی بەهاکانی هەواڵ لە کاتی بڵاوکردنەوەیدا ئەرکی ئەم بەشە کورتەی فەسڵی سێهەمە.

(جون هارتلی) لە کتێبەکەیدا بە ناوی (تێگەیشتن لە هەواڵ) دەڵێ: (لەگەڵ ئەوەدا کە بەهاکانی هەواڵ رۆڵێکی یەکلاکەرەوەیان هەیە لە پرۆسەی هەڵبژاردنێکی نموونەیی بۆ رووداوەکان، بەڵام تەنیا رۆڵێکی ئاسایی دەگێڕێ لە پرۆسەی کردنی ئەو رووداوانەدا بە هەواڵ). هەروەها هارتلی دەڵێ: (چوار حاڵەتی سەرەکی هەن، ئەو بناغەیە پێکدێنن کە رۆژنامەنووس پشتی پێدەبەستێ لە دابەشکردنی بەهاکانی هەواڵدا بۆ چەند جۆرێکی گونجاو بۆ بەشەکانی یەکێك لە رۆژنامەکانی رۆژانی یەك شەممە وەك: سیاسەتو کاروباری نێودەوڵەتی، وەرزش، کات بردنەسەرو رابواردن... هتد، ئەم حاڵەتانە بریتین لەوەی کۆمەڵگە پێکهاتووە لە کەسانێك لە توانایاندایە هەواڵو رووداو دروست بکەنو بە کارەکانیان گۆڕانکاری دروست بکەن، هەروەها کۆمەڵگە زنجیرەیەکی شێوە هەرەمیو قووچی رێکخراوە بە جۆرێکی لۆژیکیو رێکوپێكو، کۆمەڵگە خاوەنی کەسیەتییەکی هێمنو نەرمو نیانەو دان دەنێ بە بەرژەوەندییەکانماندا).

کاتێك رۆژنامەنووس، بەهاکانی هەواڵو ئەو حاڵەتە کۆمەڵایەتییانەی لە بەرچاو گرت کە بابەتی هەواڵەکەی بۆ رێکدەخات، ئیتر ئەو کاتە ئازادە لە بەکارهێنانی شێوازی تایبەتیی خۆیدا لە بنیاتنانی هەواڵەکەدا، ئاشکرایە کە راستگۆیی شێوازێکی تایبەتیی هەواڵەکانی جیهانی یەکەمە، بینیمان کە چۆن راستگۆیی لە هەواڵدا، چەند سەدەیە کە پەرەی سەندووە لەگەڵ پەیدابوونو دەرکەوتنی (خزمەتگوزاریی بروسکەو بێتەلدا) وەك بە دەنگەوەچوونێکی داواکاریی سوودمەندە جۆراوجۆرەکان بۆ ئەوەی کە زانیارییەکان دوور بن لە شێواندنو دەسکاریکردن. لەگەڵ ئەوەشدا کە بەسەرکردنەوەی هەواڵ لەگەڵ لێکدانەوەو شیکردنەوەدا وەك لە بەشی دووهەمدا دەیبینین، هێشتا پەسەندەو پشتگیریی لێدەکرێ، بەڵام راستگۆیی تا ئێستاش کلیلێکە بۆ شێوازی هەواڵ لە جیهانی یەکەمدا.



نیشانەکانی گۆڕان:

هەواڵ لە جیهانی یەکەمدا بە بەردەوامی دەگۆڕرێ، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە بەهاو پێکهاتەو جۆرەکانی، بە پێی گۆڕانی خوێنەرو پێداویستییەکانی کۆمەڵگەکە رۆژ دوای رۆژ ئاڵۆز دەبێو بە پێی ئەو گۆڕانەی کە هاتووە بەسەر سیستمی رۆژنامەگەریی جیهانی دووهەمو سێهەمدا، ئەمانە کاریگەرییان بووەو دەبێ لەسەری.

(جیمس ریستون) دەربارەی رۆژنامەی نوێ دەڵێ: رۆژنامەی نوێ بە دوای رۆڵێکی نوێدا دەگەڕێ، یاخود دەبێ ئەو کارە بکا، ئەو رۆڵەش پشت دەبەستێ بە لێکدانەوەو شیکردنەوەیەکی عاقڵانەو ژیرانەوە، ئێمە لەو قۆناغەدا نەماوین کە تەنیا هەواڵ بگوێزینەوە، بەڵکو چووینەتە قۆناغی فێرکردنو رۆشنبیرکردنی خەڵکەوە.

ئەم گۆڕانە کاریگەریی هەیە لەسەر بەهاکانی هەواڵو شێوازەکانی. رۆژنامەنووسانی جیهانی یەکەم ئەوە دەزانن کە رۆشنبیرکردن هەندێ جار جێبەجێ نابێ تەنیا لە رێگەی بەسەرکردنەوەی هەواڵەکانەوە بە شێوەیەکی راست، بەڵکو دەبێ ئەو هەواڵو رووداوانە شیبکرێنەوەو لێکبدرێنەوە.

لەلایەکی ترەوە، چەند دەنگێك بەرز بوونەتەوە داوای هێنانە کایەی چەند گۆڕانکارییەکی تر دەکەن لە بەهاکانی هەواڵ لە جیهانی یەکەمدا، یەکێك لەوانە، جیرمی تانستول، لە کتێبەکەیدا بە ناوی (هۆکانی راگەیاندن لە بەریتانیادا) دەڵێ: زۆربەی ئەوەی روو دەدا لە هۆکانی راگەیاندندا، ئاوێتەیە لە تێکەڵوپێکەڵیو شێواندنێکی زیاد لە رادە (سەبارەت بە جەماوەری خوێنەرو رەخنەگران، هەروەها بۆ رۆژنامەنووسانو بەرهەمهێنەرانیش)، چونکە لایەنگیریو نادیاری، بە شێوەیەکی روونو ئاشکرا دەردەکەون لە یەك بابەتدا (بەهاکانی هەواڵ بۆ نموونە)، تانستول، دەستەی رادیۆی (B.B.C)ی بەریتانی وەك نموونەیەك دەکا بە بەڵگە لەسەر قسەکەیو دەڵێ: ئامانجی ئاسایی دەستەی رادیۆی (B.B.C)، لە بواری رۆشنبیرکردنو رابوارنو راگەیاندندا، نادیار بوونو بابەتی دژ بە یەکی بە ئاشکرا پێوە دیارە.

لەلایەکی ترەوە هەندێ سەرنووسەرە ئەمریکییەکان داوا دەکەن دەستپێداهێنانو بەرگێکی مرۆڤایەتییانە بهێنرێ بەسەر بەهاکانی هەواڵدا، مایکل ج. ئونیل، سەرنووسەری رۆژنامەی (نیویۆرك دەیلی نیوز) پرسیار دەکاو دەڵێ: ئایا دەبێ ئەرکی ئێمە لە بواری راگەیاندنا دڵڕەقیو

وشکیی پێوە دیار بێ بە رادەیەك خۆمان دابڕین لە مرۆڤایەتییەکەمان؟، هەر خۆیشی وەڵام دەداتەوەو دەڵێ: ئێمە لەسەرمانە، دەستبکەین بە جۆرە نووسینێك کە زۆرتر راستگۆیانەو زۆرتر چاوپۆشی بکەین لەو پێ خواردنانو هەڵە بچووکانەی تووشی دەزگا مرۆڤایەتیو سەرکردەکانی دەبنو زۆرتر بەئاگا بین بەرامبەر بە هەستی تاکەکان، ئیتر کارمەندی گشتی بن یا هاوولاتیی ئاسایی.

وا دیارە ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە یەکبگرێتەوە لەگەڵ بیروبۆچوونی رەخنەگریی ئەوەڵو ئاخری بەهاکانی هەواڵ لە جیهانی یەکەمدا کە بریتییە لە جەماوەری خوێنەران. لێکۆڵینەوەیەك کە لە ساڵی (١٩٨٤)دا ئەنجام دراوە لەژێر چاودێریی (کۆمەڵەی سەرنووسەرانی رۆژنامەکانی ئەمریکا)، لەسەر ئەوانەی رۆژنامە دەخوێننەوە، دەریخستووە کە ئەو کەسانەی لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا کراوە، گلەییان هەیە لەوەی کە هەواڵەکان پێویستییان بە دادو ویژدان هەیەو ئەو هەواڵانە حەزیان لە وروژاندنو دەسکاریکردنەو زیاتر گرنگی دەدەن بە هەواڵە خراپەکان.

ئەم ژمارانەی خوارەوە، دەبێ ببنە هۆی سەرسوڕمانو نیگەرانیی رۆژنامەنووسانی جیهانی یەکەم: ئامارەکە دەڵێ لە (٥٢٪)ی ئەوانەی لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کراوە، رۆژنامەکان تاوانبار دەکەن بەوەی کە هەواڵەکان لە بەرگێکی وروژاندندا دەخرێنە بەردەست. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ژمارەیە بە ئاسایی دادەنرێ ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ ژمارەی دووهەمدا، کە لە (٨٠٪)ی ئەوانەی باسیان لەگەڵ کراوە، دەزگای تەلەفزیۆن تاوانبار دەکەن بەوەی کە بە مەبەست هەواڵی وروژێنەر بڵاو دەکەنەوە.

لەگەڵ ئەو حاڵەتانەشدا، هیوا هەیە کە ئەو باسو گفتوگۆو لێکۆڵینەوانەی ئەنجام دەدرێن لەسەر بەهاکانی هەواڵ لە جیهانی یەکەمدا ببنە هۆی درێژەپێدانی ئەو هەوڵانەی دەدرێن بۆ ناساندنی بەهاکانی هەواڵو تۆکمەکردنی. دیڤید شو، نووسەری رۆژنامەی (لۆس ئینجلیس تایمز) دەڵێ: رۆژنامەگەری ساڵانێکی دوورودرێژە خۆی تەرخان کردووە بۆ لێکۆڵینەوەیەکی رەخنەگرانە لە هەموو دەزگایەکی بەهێزی کۆمەڵگە جگە لە دەزگاکەی خۆی.



## بەهاکانی هەواڵ لە جیهانی دووهەمدا

پێشینەیەك:

هەواڵەکانی جیهانی دووهەم بە مانا فراوانەکەی وا پێناسە دەکرێن کە ئەو هەواڵانەن کە لە دەوڵەتانی بلۆکی رۆژهەڵاتدا روو دەدەن. هەندێك وای دەبینن کە ئەو هەواڵانە پاڵپشتێکی تەواوی پارتی کۆمۆنیستییە لەو وڵاتانەدا یاخود چەند پەیامێکن کە دەوڵەت ئاراستەی جەماوەریان دەکاو لەژێر کۆنترۆڵی ئەودانو پەیوەندییان نییە بە مانای هەواڵەوە. هەندێکی تریش لایان وایە کە ئەو هەواڵانە یەکەم جێگرێکی تەواوی ئەو سیستەمە بۆگەنو گەندەڵەی هەواڵەکانی جیهانی یەکەمن.

هەواڵ لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا لە جیهانی دووهەم لەسەر هەمان رێوشوێنی هەواڵی جیهانی یەکەم گەشەی دەکرد. لە وڵاتی روسیادا، رۆژنامە جەماوەرییەکان کەوتنە گەشەکردن لە ساڵانی شەستەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا پاش سەردەمی دەسەڵاتی قەیسەر نیکولای یەکەم کە سانسۆر خرابووە سەر چاپەمەنییەکانو رۆژنامە قەبارە بچووکەکان پڕ بوون لە دەنگوباسی شەڕو رسوایییە ناوخۆییەکان، بەڵام رۆژنامە رۆژانە گەورەکان، باسێکی کورتو راستگۆیانەی رووداوەکانی دەخستە بەردەست. تەنانەت هەندێ لەو رۆژنامانە لەسەر لاپەڕەکانیان رەخنەیەکی ژێر بە ژێریان ئاراستەی دەوڵەت دەکرد. رۆژنامەکانی پۆلۆنیاو ئەڵمانیاو وڵاتەکانی تری رۆژهەڵاتی ئەورووپاش هەواڵی لەو جۆرەیان بڵاو دەکردەوە.

لە ئەنجامدا، ئەو شۆڕشە سیاسییەی بەرپا بوو لەو وڵاتانەدا، شۆڕشێکی هاوشێوەی لە هەواڵەکانی جیهانی دووهەمدا هێنایە ئاراوە. لە روسیادا ئەو بزوتنەوە چاکخوازییەی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا دەرکەوت، شۆڕشێکی ئاشکراو دەنگ بەرز بوو، بووە هۆی سەپاندنی سانسۆر بەسەر چاپەمەنییەکاندا، لەگەڵ ئەوەشدا رۆژنامەکانی دەرەوەی وڵاتو رۆژنامە مارکسییەکانو رۆژنامە نهێنییەکانی تر لە گەشەکردندا بوون. لەگەڵ هاتنی ساڵی (١٩١٢)دا، رۆژنامەی پراڤدای زمانحاڵی بۆلشەویکەکان لە شاری (سانت پەترسبۆرگ) دەردەچوو لەگەڵ هەموو سانسۆرو تەنگەتاوکردنی بەردەوامیشدا.

بەهای ئەو هەواڵە شۆڕشگێڕییانە زۆر تایبەتمەند بوون، هەروەها هەواڵو رووداوەکان لە بازنەی کارو چینی کرێکاردا دەخولانەوە، مانگرتن، کۆبوونەوەکان، ئامادەکردنو کۆکردنەوەی

جەماوەرو تیۆریو بۆچوونی چینی کرێکار، بابەتی بەردەوامیی ئەو رۆژنامانە بوون. هەندێ لە کرێکارەکان وەك پەیامنێر کاریان دەکرد بۆ رۆژنامەکان، هەروەها ئەو رۆژنامانە گوتاری دووردرێژی کرێکارەکانیان بڵاو دەکردەوە. هەندێکیش لە بابەتەکان رۆشنبیری بوونو پەیوەندییان هەبوو بە چەند مەسەلەیەکی فەلسەفیی ئاڵۆزەوە، یا بە چەند مەسەلەیەکی وردی تایبەت بە رێکخستنی حیزبەوە. ئەو رۆژنامە شۆڕشگێڕانە وەنەبێ هەر کاریان کردبێ بۆ دامەزراندنی فەرمانڕەواییەکی نوێو بەس، بەڵکو واتاو تێگەیشتنێکی نوێشیان پێکهێنا بۆ بەهاکانی هەواڵو رووداوەکان.

پاش شۆڕشی ساڵی ١٩١٧، کە بۆلشەویکەکانی گەیاندە سەر کورسیی دەسەڵات، رۆژنامەی پراڤدا بووە زمانحاڵی رەسمیی حیزبی کۆمۆنیستو واتای شۆڕشگێڕانەی هەواڵیش بووە تیۆرییەکی خۆبەخۆ.

بەهۆی هێزو کاریگەریی رۆژنامەوە، لینین لە شۆڕشەکەیدا سەرکەوت، لەبەر ئەوە دەیزانی کە رۆژنامە تا چ رادەیەك بەهێزەو خۆی دەپاراست لە کاریگەریی رۆژنامەو، پاش تەنیا سێ رۆژ لە دەسەڵات گرتنەدەست چی رۆژنامەی ئۆپۆزسیۆن هەبوو هەمووی داخست، بەڵگەشی لەو بارەیەوە روونو ئاشکرا بوو و بێ پێچو پەنا دەریدەبڕیو دەیگوت: (بۆچی دەوڵەتێك لە دەوڵەتەکان رێگە دەدا بەوەی نەیارەکان رەخنەی لێبگرن مادام خۆی دڵنیایە لەوەی بە شێوەیەکی راست هەڵسوکەوت دەکات؟، هیچ دەوڵەتێك نابێ رێگە بدا بەوەی ئۆپۆزسیۆن چەکێکی کوشندەی لە دژ بەکار بێنێ، چەکی بیرو فیکر کوشندەترەو ترسناکترە لە تۆپ).

بەم شێوەیە، لەبری رۆژنامەی جیهانی یەکەم کە قسەی ناشیرینو ناوناتۆرەی تێدا بڵاو دەکرێتەوەو گفتوگۆ دەکرێ لەسەر کاروباری ئابووریو مانۆڕی سیاسی، لینین تاکە تیۆرییەکی دانا بۆ بەهاکانی هەواڵ، کە لە جیهانی دووهەمدا کراوە بە پەیڕەو، ئەویش بریتییە لە (رۆژنامە نابێ هەر تەنیا هۆیەك بێ بۆ پڕوپاگەندەی بە کۆمەڵو ئامرازێك بێ بۆ رێکخستنو بەس، بەڵکو دەبێ هۆیەکی گشتی بێ بۆ هەڵخراندنو رووژاندنی رای گشتی).

هەروەها ئەم جۆرە تێڕوانینە بۆ واتای رۆژنامەگەری جێگیر بوو وەك بەشێکی دانەبڕاوی فەلسەفەی لینینزم لە هەموو ئەو دەوڵەتانەدا کە حکومەتێکی مارکسی لینینی فەرمانڕەواییان دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێ جیاوازیی بەرچاو هەیە لە سیستەمی



رۆژنامەگەریی جیهانی دووهەمدا، هۆکانی راگەیاندن هەموویان هاوبەشن لە سوودوەرگرتن لەو سەرچاوەیەو بەکارهێنانی ئەو فەلسەفەیەی تایبەتە بە هەواڵو رۆژنامەوە.

**بەهاکانی هەواڵ:**

زۆرجار روو دەدا، گفتوگۆیەکی دووردرێژ بەرپا دەبێ لەناو هۆکانی راگەیاندنی جیهانی دووهەمدا دەربارەی بەهاکانی هەواڵ، هەروەها رۆژنامەو رۆڵی رۆژنامە — بەو سیفەتەی کە رەگەزێکی سەرەکییە لە رەگەزەکانی شەرعییەتو رەوایەتیی هەر دەوڵەتێك — لە کتێبو بڵاوکراوە ناوبەناوەکان، بەرنامەکانی رادیۆ، بابەتی سەرەکیی رۆژنامەکان، لاپەڕەی یەکەمی رۆژنامە حیزبییەکان، دەخوێنرێن. بە پشتبەستن بەم سەرچاوانەوە، دەتوانرێ شارەزاییەکی تەواو پەیدا بکرێ لەسەر نیشانە سەرەکییەکانی بەهای هەواڵ لە جیهانی دووهەمدا.

**ناوەرۆکی ئایدیۆلۆژیی هەواڵ**

هەواڵ لە جیهانی دووهەمدا، بریتییە لە ئایدیۆلۆژییەکی راستو تەواو. بە دڵنیاییەوە، ئایدیۆلۆژی فاکتەرێکی دەسەڵاتدارە لە دیاریکردنی هەواڵ لە جیهانی دووهەمدا، هەر بڕیارێك کە پەیوەندیی هەبێ بە پرۆسەی هەواڵەوە هەر لە هەڵبژاردنی هەواڵەکەوە تا دەگاتە سەر لاپەڕەی رۆژنامەکان، یا سەر شاشەی تەلەفزیۆن لەسەر بنەمایەکی ئایدیۆلۆژی وەردەگیرێ.

رۆژنامەی پراڤدای سۆڤێتی، هەموو ساڵێك چەند رووداوێکی هەواڵ ئاسا تەرخان دەکا لە لاپەڕەی یەکەمدا، بۆ گفتوگۆکردن لەسەر رۆڵی رۆژنامە لە کۆمەڵگەی سۆشیالیستیدا. رۆژنامەی پراڤدا لە لاپەڕەی یەکەمیدا رۆژی حەڤدەی سبتەمبەری ساڵی **١٩٨٣** دەنووسێو دەڵێ: (رۆژنامە بە راستی ناو براوە بە "ئامرازی پەیبردن بە ژیان"و توانای بەشداریکردنی چالاكو کارای رۆژنامە لە داڕشتنو گەڵاڵەکردنی مرۆڤی هاوچەرخو هەڵوێستی بەرامبەر بە ژیانو دووپاتکردنەوەو پێداگرتن لەسەر بەها ئەخلاقیو رۆحییەکانی شێوەی ژیانی سۆڤێتی، ئەمرۆ لە هەموو کاتێکی پێشوو زۆرترو گەورەترە. پابەندبوون بە ئایدیۆلۆژیاو لێهاتوویی ئەو دوو باڵەن کە رۆژنامەوانی بەرز دەکەنەوە بۆ ئەو پلەیەی کە ئەم چەرخە ئاڵۆزە سەپاندوویەتی بەسەرماندا).

ئاشکرایە کە ئەو ئایدیۆلۆژییەی مەبەستە لێرەدا ئایدیۆلۆژیای مارکسیزم — لینینیزمە، بەلاَم هەواڵ تەنیا ئەوە نییە، ئایدیۆلۆژیاکە یاخود بیروباوەڕەکە وەك خۆی بنووسێتەوە، بەڵکو لێکدانەوەی (شێوازی ژیانە) بە زاراوەیەکی ئایدیۆلۆژییانە. لە بۆنەیەکی تردا ڕۆژنامەی پراڤدا دەڵێ: (سەرکەوتنەکانو کێشەو ناتەواوییەکانی ژیان کە گەلو پارتی کۆمۆنیستی تیایدا دەژین، ناوەرۆکی سەرەکیی ڕۆژنامەوانیمان بەرجەستە دەکەن)، هەروەها دەڵێ: (پێویستە لەسەر ڕۆژنامەنووسان — کاتێك ئەم ژیانە دەخەنە روو — دەبێ لە رادەیەکی بەرزدا بن لە ئەنجامدانی چالاکیی کۆمەلاَیەتیو بەرپرسیاریەتیداو دەبێ ئەو چالاکییەی ئەنجامی دەدەن لەو بوارەدا لەژێر رووناکیی پرەنسیبە لینینییەکانو نەریتی ڕۆژنامەگەریی حیزبیدا بێت).

ناکرێ زیادەڕەوی بکەین لە باسی ڕۆڵی فاکتەری ئایدیۆلۆژیدا، کاتێك لە بەهاکانی هەواڵی جیهانی دووهەم دەکۆڵینەوە. لە راستیدا ئەم خالاَنەی خوارەوە کە تایبەتن بە هەواڵەوە، دەکرێ بکرێن بە چەند مانشێتێکی ناسەرەکی، لەو پۆلێنکردنە سەرەکییەی ناوەرۆکی ئایدیۆلۆژی.

* ئەوەی بەلای حیزبەوە مەبەستە: حیزبی کۆمۆنیست خۆی هەواڵە، واتە ئەوەی حیزبی کۆمۆنیست دەیڵێو ئەوەی دەیکاو ئەوەی بیری لێدەکاتەوەو ئەوەی بیری لێناکاتەوە، ئەمانە پێکهێنەری هەواڵن لە جیهانی دووهەمدا.

* دەستگرتنی حیزب بەسەر هەموو لایەکی ژیاندا لە جیهانی دووهەمدا، هۆی ئەو گرنگیدانەیە بەو بەهایەی هەواڵەکان. کۆمەڵگەی وا هەن زۆربەی چالاکییەکانی ژیان لەژێر کۆنترۆڵی حیزبدان. بەو پێیە بەهای ئەو هەوالاَنە گرنگییەکی گەورەیان هەیەو یاریدەدەرێکی تەواون بۆ هەموو هۆکانی راگەیاندن.

بێگومان، بەهاداریی ئەم هەوالاَنە یارمەتیی حیزبیش دەدەن، چونکە ئەم جۆرە بلاَوکردنەوەیەی هەواڵ رەوایەتییەك مسۆگەر دەکات بۆ دەسەلاَت. هەروەها یارمەتیی ئەو ڕۆژنامەنووسانەش دەدات کە لە پلەو پۆستێکی بەرزدان بەهۆی پۆستە حیزبییەکانیانەوە.

ئەم پەیوەندییە توندوتۆڵەی نێوان حیزبو هۆکانی راگەیاندن لە پەیڕەوو پرۆگرامی سەرەکیی یەکیەتیی ڕۆژنامەنووسانی ئەڵمانیای ڕۆژهەلاَت بە روونی دەردەکەوێ کە تیایدا هاتووە: (ڕۆژنامەنووسەکان بەهۆی ئەوەوە کە تێکۆشەرانێکی دڵسۆزنو ئەندامی حیزبی چینی کرێکارو دەوڵەتن بەشداری دەکەن لە کاری باوەڕ پەیداکردن لای خەڵكو پڕوپاگەندە بۆ



خستنەڕووی ژیانی راستەقینەی میللەت بە مەبەستی هێنانەدیی گەشەکردنو پێشکەوتنی زیاتر بۆ کۆمەڵگەی سۆشیالیستیی پێشکەوتوو).

## بەرپرسیاریەتیی کۆمەلاَیەتی

لە جیهانی دووهەمدا، هەواڵ بەرپرسیارە بەرامبەر کۆمەڵگە هەروەها هەواڵ دەبێ بنیاتنەرو کاراو چالاك بێ. بۆ نموونە لە ئەڵمانیای ڕۆژهەلاَتدا ڕۆژنامەنووسان دەبێ (بەشداری بکەن لە رێی کارەکەیانەوە لە پێکهێنانی بیروباوەڕی سۆشیالیستیو پتەوکردنی). بەلاَم بە پێچەوانەی بۆچوونی هەندێك لە جیهانی یەکەمدا، ڕۆژنامەنووسانی جیهانی دوو، هاوبەشی دەکەنو بگرە هانیش دەدرێن بۆ رەخنەگرتن لە هەڵەو ناتەواوییەکان. بەلاَم مەسەلەکە لەوەدایە کە رەخنە لە کێ بگرن؟، چ هەڵەو ناتەواوییەك دەبێ رەخنەیان لێبگیرێ؟، ئەو رەخنەیە لە چ ئاستێکدا بێتو تا کوێ بڕ بکات؟. ئاشکرایە کە ئایدیۆلۆژیای دەوڵەتو گەورە کاربەدەستانی حیزب نابێ بەر توانج بکەونو بریندار بکرێنو دەبێ لێکۆڵینەوە نەگاتە لایان، بەلاَم ئەگەر کێشەیەکی بیروکراتییانە رووی دا، یاخود کاربەدەستێکی بچووك گیرا بە دزییەوە، ئەوە هۆکانی راگەیاندن لەو بۆنەیەدا دەکەونە رەخنەو گاڵتەکردن بە رادەیەك سەرنجی خەڵك رادەکێشێو تووشی سەرەگێژەیان دەکا.

ڕۆژنامەی پراڤدا، ئەو جۆرە بەهاو تایبەتمەندییەی هەواڵی بەرز دەنرخاند چونکە لەو بارەیەوە دەنووسێ: (کارو ئەرکی ڕۆژنامە بریتییە لە خستنەڕووی ئەو بابەتو رووداوانەی نیگەرانی دروست دەکەن بۆ خەڵك، بۆ بیروڕای جەماوەرو بە بوێریو چاونەترسییەوە رەخنە بگرێ لە بەرەنگاربوونەوەی ئەو کۆسپانەی دەبنە رێگر لە بەردەم پێشکەوتنماندا).

## ڕۆشنبیرکردن

مەبەست لە هەواڵ لە جیهانی دووهەمدا ڕۆشنبیرکردنە، هەواڵ خەڵك فێر دەکاو ئامۆژگاریی دەکاو لەبەر ئەوەی هەواڵ لە جیهانی دووهەمدا، بەگوێرەی ئەرکەکەی پڕوپاگەندە لەخۆ دەگرێ، خۆی بۆ خۆی نییە، بەڵکو بۆ ئەوەیە ئامانجو مەبەستێك جێبەجێ بکا، ئەو ئامانجو مەبەستەش بە زۆری ڕۆشنبیرکردنی خەڵکە. بە پێچەوانەی جیهانی یەکەمەوە، مەبەست لە هەواڵ لە جیهانی

دووهەمدا تەنیا ڕاگەیاندنو ڕابواردنو کات بەسەربردن نییە، لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێ هەواڵ لە چوارچێوەی ئەرکی ڕۆشنبیرکردندا، بابەتی ڕاگەیاندنو ڕابواردن ببینێ.

یاسای ئەخلاقیی یەکیەتیی ڕۆژنامەنووسانی چیکۆسلۆفاکیا دەکرێ بهێنرێتەوە بە نموونەیەك لەسەر ئەو پێداگرتنو پابەندبوونە بە بابەتی ڕۆشنبیرکردنەوە. ماددەی یەکەمی یاساو پرۆگرامی ئەو یەکیەتیی ڕۆژنامەنووسانە دەڵێ: یەکیەتیی ڕۆژنامەنووسان ڕێکخراوێکی یەکگرتووی ئایدیۆلۆژیی ڕۆشنبیریی ئارەزوومەندانەی کۆمەڵایەتییە بۆ ڕۆژنامەنووسان. هەروەها لە ماددەی دووهەمی ئەو پرۆگرامەدا هاتووە: ئەرکی ئەو یەکیەتییە ڕێکخستنو ڕێنوماییکردنی ڕۆژنامەنووسانە بۆ ئەوەی بەشداری بکەن بە ئاگادارییەوەو بە گیانی دەسپێشخەرییەوە لە بنیاتنانی کۆمەڵگەیەکی سۆشیالیستیی پێشکەوتوودا، هەروەها بۆ ئەوەی بە تایبەت یارمەتی پێشکەش بکەن لە ڕۆشنبیرکردنو ئاگادارکردنەوەی میللەت لە واتاو ناوەرۆکی سۆشیالیستیو بەشداری بکەن لەوەدا کە هاوولاتییانی وڵاتی سۆشیالیستی لە باری سیاسیو ڕۆشنبیرییەوە زیاتر پێش بکەونو لە بواری بنیاتنانی وڵاتدا هەنگاوی گەورەتر بنێن.

ڕەنگە ئەم ڕۆشنبیرکردنە چەند شێوەیەك لەخۆی بگرێ، لە نێویاندا نووسینی چەند بابەتێك دەربارەی ئەو ڕێگە نوێیانەی گیراونەتەبەر لە بواری کشتوکاڵداو زانیاریی لەسەر چاودێریی تەندروستیو زمان فێرکردن بەهۆی تەلەفزیۆنو کتێبو نامیلکە لەسەر لینینو لێکدانەوەو ڕاڤەکردنو ڕەتکردنەوەی بەردەوامی هەڵسوکەوتی ئیمپریالیستیی ڕۆژئاوا. لە ڕاستیشدا زۆریی دەنگوباسو هەواڵی پەیوەست بە باری ڕۆشنبیرییەوە بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر گرنگیدان بەو بوارە لە سیستمی هەواڵی جیهانی دووهەمدا.

## گرنگیدان بە کاروباری مرۆڤو مرۆڤایەتی

گرنگیدان بەم بوارە ڕێك وەك گرنگیدانە بەم بەهایەی هەواڵ لە جیهانی یەکەمدا، کە دەبێ هەواڵ لە بنەمادا پەیوەندیی بە خەڵکەوە هەبێتو لە پێناوی خەڵکدا بێت. ئەوەندە هەیە لە جیهانی دووهەمدا بەرگێکی ئایدیۆلۆژییانەی بە بەردا دەکرێت، بەو مانایە کە هەواڵ نابێ باسی تاکەکەس بکا، بەڵکو دەبێ باسی میللەت بکا بە گشتی. لە کاتێکیشدا کە هۆکانی ڕاگەیاندن لە جیهانی دووهەمدا باسی کرێکاری ئاسایی دەکەن، وەك ئەوەی پراڤدا لە لاپەڕەی یەکەمدا وێنەیەکی گەورەی



کرێکارێك بڵاو بکاتەوە، ئەوە مەبەست گەورەیی ئەو کەسە نییە بە تەنیا خۆی، بەڵکو مەبەست بە گەورەدانانو ڕێزگرتنە لە هەموو کرێکاران بە ناوی ئەو کەسەوە.

ئەو نامانەی کە دەگەنە ڕۆژنامەی پراڤدا، بەڵگەن لەسەر گرنگیدان بە میللەت بە گشتی لە جیهانی دووهەمدا، چونکە ئەو نامانە ڕەنگە هەستێك لای ئەندامانی گەل دروست بکەن، بە ڕاستی یا بە خەیاڵ، کە ئەوانە هاوبەشن لە هۆکانی ڕاگەیاندنداو ئەوەش بەرجەستەکردنێکی یەکیەتیو پەیوەستبوونە بەیەکەوە کە حاڵەتێکی خوازراوە. ڕۆژنامەی پراڤدا بە قسەی خۆی لە هەر ساڵێکدا پێنجسەد هەزار نامە دەگاتە دەستی لە خوێنەرانییەوە. بەکارهێنانی کرێکارانیش وەك پەیامنێر بۆ ڕۆژنامەکان بەرجەستەکردنێکی تری ئەو گرنگیدانەیە بە هەواڵ لە بەرژەوەندیی گەلدا.

## هەندێ تایبەتمەندیی هەواڵ لە جیهانی یەکەمدا

هەڵبەیە ئەگەر وا دابنێین، تایبەتمەندیو بەها ئاساییەکانی هەواڵ لە جیهانی یەکەمدا، وەك خێرایی، نزیکیی شوێنی ڕووداو، دەرخستنی کەسیەتیی پەیوەندیدار بە هەواڵەکەوە، لە هەواڵەکانی جیهانی دووهەمدا نین. بۆ نموونە، لە ساڵی (١٩٨٢)دا کاتێك (پاپا پۆلس)ی دووهەم گەڕایەوە بۆ وڵاتو شوێنی لەدایکبوونی خۆی لە پۆلەندا، ئەم هەواڵە وەك ڕووداوێکی گەورە بڵاو کرایەوە، ئەمەش بەهۆی ئەو بەهادارییەی هەواڵەکەوە بوو کە خۆی دەبینێتەوە لە نزیکیی شوێنو دەرخستنی کەسیەتییەکەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، جیاوازی لە نێوان جیهانی یەکەمو دووهەمدا لەوەدا دەردەکەوێ کە ئەم جۆرە گرنگیدانە، لە جیهانی دووهەمدا هەموو کاتێك لە پلەی دووهەمدایە، بەرامبەر بە بابەتە ئایدیۆلۆژییە سەرەکییەکان.

## بەها تایبەتییەکانی بەسەرکردنەوەی هەواڵ لە جیهانی دووهەمدا

هۆ ئایدیۆلۆژییەکان پێکهێنەری پرۆسەی پێشکەشکردنی هەواڵن لە جیهانی دووهەمدا، هەر ئەو هۆیانە کە بناغەی بەهاکانی هەواڵ پێکدێنن کاریگەرییان هەیە لەسەر پێکهاتەو جۆری هەواڵ لە جیهانی دوودا، لەبەر ئەوە ناوەرۆكو واتای ئایدیۆلۆژیی هەواڵ بە شێوەیەکی لێهاتووانە ناشاررێتەوە لە هەواڵەکەدا، بەڵام هەواڵەکە بەکار دەهێنرێ بۆ پێداگرتنو دووپاتکردنەوە ئایدیۆلۆژییەکەو ڕاڤەکردنو لێکدانەوەی بۆ خوێنەران. ڕۆژنامەی پراڤدا لەم بارەیەوە دەڵێ: (ئەو

ئەرکە کۆمەڵایەتییەی خراوەتە ئەستۆی کارمەندانی بواری راگەیاندن لەمڕۆدا، بریتییە لە زانینی چۆنیەتیی چوونە قووڵاییو بنجو بناوانی هەر دیاردەیەکەوەو خستنە لاوەی هەر هەواڵێکی باوەڕ پێنەکراوو زیادەڕەوی لە پیاهەڵدانو لایەنگریی بەرژەوەندیی دەوڵەت، بە بوێریو چاونەترسییەوەو لە هەمان کاتدا، باسکردنی دەسکەوتو تایبەتمەندییە راستەکانی سیستمەکەمان بە هەستو سۆزەوەو خستنەڕووی سروشتو پێکهاتەی رۆڵەکانی گەلو پاڵەوانانی پلانە پێنجساڵییەکان).

هەواڵەکانی جیهانی دووهەم خودینو بابەتی نینو هەوڵ دەدەن هەستی بە سۆزو پابەندیو یەکگرتوویی و یەکبوون دروست بکەن. راپۆرتەکان زۆرجاران بەم رستانە دەست پێدەکەن وەك: (گەلی پۆلۆنیا نارەزایی خۆی دەردەبڕێ ...) یا (دەوڵەتانی جیهان بەختەوەرەن بە هیوای ...). ئیتر بەم شێوەیە هەڵبژاردنی شێوازی داڕشتنو نووسینی هەواڵ لە جیهانی دووهەمدا، گونجاوە لەگەڵ ئەو بەهایانەی هەواڵ کە باوە تیایاندا.

رەنگە سوودمەند بێ ئەگەر ئەو فاکتەرانە بخەینە بەرچاو کە لە شێوازی هەواڵی جیهانی دووهەمدا گومو لە بەرچاو نین. لەنێو ئەوانەدا وەك نموونە: هەواڵی ئەو جیهانە بابەتیو ورووژێنەر نییەو خۆی نادا لە قەرەی چەند رووداوێکی خراپو ناچێتە قووڵایی ژیانی تایبەتیی کەسییەتییە گشتییەکانەوە، لەبەر ئەوەی ئەم بابەتانە کە لە بنەڕەتدا شێوازی هەواڵی جیهانی یەکەمیان لەسەر بنیات نراوە، خزمەتێکی هیچ مەبەستێکی ئایدیۆلۆژی ناکەن بۆ جیهانی دووهەم، ئەوە بە بەشێك لە هەواڵ دانانرێ.

## نیشانەکانی گۆڕانکاری

بەهاو تایبەتمەندییەکانی هەواڵ لە جیهانی دووهەمدا، بەگوێرەی سروشتی خۆی، ئەوساو ئێستاش دژی گۆڕانکارینو بەربەرەکانێی دەکەن. ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە کە رۆژنامە لەو جیهانەدا کە دروستکراوە بۆ داکۆکیکردن لە رەوایەتیی حیزبی کۆمۆنیستو پاراستنیو پەرەپێدانی، هەر ئەوە بارودۆخی شۆڕشگێڕیی دەپارێزێ، لەبەر ئەوە هەر جۆرە گۆڕانکارییەك لە بارودۆخێکی وەهادا کارێکی گرانو قورسە.

لەگەڵ ئەوەشدا لەم ماوەی دواییەدا چەند گۆڕانکارییەك دەرکەوتووە، ئەم گۆڕانکارییانەش ئەوە دەگەیەنن کە ئەگەری ئەوە هەیە چەند مەفهومو مانایەکی جیهانی بۆ هەواڵ پەیدا ببێ، چونکە



چەند هێمایەك هەن ئاماژە بەوە دەکەن کە لە کاتێکدا هەواڵ لە جیهانی یەکەمدا بەرەو گۆڕان دەڕواو روو دەکاتە لایەنی شیکردنەوەو لێکدانەوە (کە لە نیشانەکانی هەواڵی جیهانی دووهەمن)، لە جیهانی دووهەمیشدا وەك دەردەکەوێ بەرەو گۆڕان دەڕوا رووەو بەکارهێنانی بابەتی زیاتر واقیعیو راپۆرتی زیاتر راستگۆیانە. (لە یەکیەتیی شورەوی لەم دواییەدا، دەست کراوە بە گرنگیدان بە مەسەلەی کرانەوەو بە ئاشکرا قسەکردن لەسەر رووداوەکانو ئەم حاڵەتەش رەنگی داوەتەوە لە وڵاتە سۆشیالیستییەکانی تردا).

دەتوانین ئەو گۆڕانکارییانەمان بەرچاو بکەوێ لەو سەروتارانەدا کە لە رۆژنامەی پراڤدا بڵاو دەبنەوە دەربارەی رۆڵی رۆژنامەنووسی. لە ساڵی (١٩٨٣)دا، سەروتارێك لەو رۆژنامەیەدا بڵاو کرایەوە، دەڵێ: (رۆژنامەکان داوای ئەوەیان لێدەکرێ کە حەقیقەتی هەست پێکراو بەکار بێنن بۆ خستنەڕووی ئەو پەیوەندییە نەپچڕاوەی نێوان پارتی کۆمۆنیستیی شورەویو بەرژەوەندیی سەرەکیو زیندووی میللەت).

لە بۆنەیەکی تردا هەر ئەو رۆژنامەیە دەنووسێو دەڵێ: (یەکێك لەو ئەرکە گرنگانەی پارتی کۆمۆنیست دەستنیشانی کردووە بۆ رۆژنامەنووسانی شورەوی گرنگیدانی بەردەوامە بە بەهێزکردنی چالاکیو کارایی هەواڵ. ئەمەش دەکرێ بهێنرێتە دی لە رێگەی خێراییو بەهێزیو تایبەتمەندیی هەواڵە بڵاوکراوەکەوە).

(ریلادین میلز) دوانزە ساڵ خەریکی لێکۆڵینەوەی رۆژنامەی (جورنالیست) بوو کە رۆژنامەیەکی مانگانەی زمانحاڵی یەکیەتیی رۆژنامەنووسانی شورەوی بوو، لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەدا گەیشتە ئەوەی کە بزافێك هەیە بەرامبەر بە رۆژنامەگەرییەکی بابەتی لە عەقڵییەتی رۆژنامەنووسانی شورەویدا، هەرچەند ئەو جووڵەو بزافە هێشتا نەگەیشتووەتە ئاستی کردار. (میلز) لە یەکێك لە سەرنووسەرە سۆڤێتییەکانەوە دەگێڕێتەوە کە گفتوگۆ دەکا لەسەر پێودانو سەنگو تەرازووی مانای بابەتییانە سەبارەت بە رۆژنامەنووسە پیشەوەرەکان بە جۆرێکی وا کە رۆژنامەنووسانی جیهانی یەکەم هەست بە شانازی دەکەن، ئەو دەڵێ: (یەکێك لەو پێوەرانە بریتییە لە بێلایەنیی تەواوو نەبوونی ماناو واتایەکی پێشتر ئامادەکراو، بە جۆرێك رۆژنامەنووس لە یەك گۆشەوە نەڕوانێتە خەڵكو رووداوەکان، ئەمەش پێوەرێکی زۆر توندوتیژە).

## بەهاکانی هەواڵ لە جیهانی سێیەمدا

**پێشینەیەك:**

بەهاکانی هەواڵی جیهانی سێیەم زۆرو جۆراوجۆرن، ئـەو جیاوازییــە گەورەیــەی هەیــە لــە نێوان دەوڵەتانی جیهـانی سـێیەمدا کـە لـە چـینەوە درێـژ دەبێتــەوە بـۆ چـیلی تـا لیبریـا، جۆراوجۆرییەکی گەورە دەگرێتەخۆ لە هەواڵەکاندا، بـەڵام دەتـوانین بگەینـە سەرچـاوەو بـەها هاوبەشەکانیان.

پێشکەوتنی جیهانی سێیەم لە بواری تەکنۆلۆژیاو ئابووریدا، لـە ماوەیــەکی تـا رادەیـەك نزیکەوە دەستی پێکردووە، گەلێك لە وڵاتانی جیهانی سێیەم، لە سەدەی بیـستەمدا دەسـتیان کـردووە بـە تێکۆشـان دژی ئیمپریـالیزم، بـەڵام سـەبارەت بـە سـەدەکانی پێـشووتر، چـەند سیستمێکی گرنگو تەواوی پەیوەندیکردنی هەبووە لە هــەموو گۆشــەیەکی وڵاتـانی جیهـانی سێیەمدا. لە وڵاتی هیندستاندا، تەنانەت پێش هـاتنی سـەدەی دەیــەمی عیـسایی، قەشــەو مژدەبەخشەکان هاتوچۆیان دەکرد لە نێوان گوندەکانداو چەندەها سەرگوزەشتەو باسی پەیوەنـد بە رەوشتو تۆماری وێنەداریان لەگەڵ خۆیاندا هەڵدەگرت. دەبـێ ئـەو هەواڵانــە چ نـاوەرۆكو مانایەکیان هەبووبێ بە لای ئەو پەیامنێرە پێشەنگانەوە؟، یـەکێك لـە مێژوونووسـان دەڵێـت ئەوانــە لــە گەرانەکەیانــدا مــژدەی یەکـسانییان دەدا بــە خــەڵكو داوای ئـاڵوگۆڕی کۆمــەڵو یارمەتیو خۆشەویستیو بەزەییو حەقیقەتو راستگۆییان دەکرد.

نەك هەر ئەوە بەڵکو هیندستان لە سەدەی هەشتی عیساییدا گفتوگۆو مشتومڕی کـراوەو بەربڵاوی بەخۆوە بینیوە. بۆ نموونە دەڵێن کە (هاریبا هادرا) کە لە شـاری (بینامــالا) دەژیـا، دەستی داوەتە نووسینی رەتکردنــەوەو پەرچـدانەوەیەکی دوورودرێــژ لەســەر کتێبێکـی بـواری فەلسەفە کە (راجا شیکارا) داینابوو لە شاری (ماجادا) کە زیاتر لە هەزار کیلۆمەتر دوور بووە لە شاری (بیناماڵا)وە.

لەگەڵ هاتنی سەدەی حەڤدەهەم، خزمەتگوزارییەکی هــەواڵی دەوڵــەتیی سـەرەتایی هاتــە ئاراوە لە هیندستاندا. ئەو رۆژنامانەی دەردەچوون بە قەوارە بچووك بـوون (٨ × ٤,٥ ئیــنج).



بە دەست دەنووسرانەوە. بازنەی هەواڵــەکانیش تەسـكو دیـاریکراو بـوون، ئیمپراتـۆر هــەموو شتێك بوو لە هەواڵدا. وا دیارە هەندێك لە رۆژنامەکانی جیهانی سێ کە دوای ئـەوە دەرچـوون لەسەر بنەمای چـەند بەهایـەکی هــەواڵ کـە رۆژاوا لــەمڕۆدا دانیـان پیادەنـێ. رۆژنامــەکانی (سیلان)و دواتر (سیریلانکا)، بەیاننامە دەوڵەتییەکانیان بڵاو دەکـردەوە لەگـەڵ چـەند بابــەتی ئەدەبیو سیاسیو باسی ئاهەنگی ژنهێنانو هەواڵی مردندا. تەنانەت هەندێ بابەتیــشیان بــڵاو دەکردەوە بۆ پێکەنینو گاڵتەوگەپ. جگە لەوەش هەندێ دیاردەی بێزاری لە بارودۆخی سیاســی کارێکی پەسەند بوو لەو کاتەدا. بۆ نموونە رۆژنامەی (لیبریا هیرالد) کە لـە سـاڵی (١٨٢٦)دا دامەزرا، دروشمێکی هەڵــگرتبوو تیایدا هاتبوو: (ئازادی بەخششێکی خوایی جوانە). (گراهــام میتون) دەڵێ: ئەوەندەی پێنەچوو مەسەلەی پرۆتستۆی سیاسیو گوزارشکردن لە بیروبۆچـوونی ئەفریقیاییانەی پێشکەوتوو، بوون بە دوو بابەت کە کۆنترۆڵی ئەو رۆژنامانەیان کردبوو کـە بــە زمانی ئینگلیزی لە رۆژاوای ئەفریقیا دەردەچوون.

لە سەدەی بیستەمدا، بابەتێکی هاوبەش کە بریتی بوو لە پێشکەوتنو گەشەکردن، هەموو کولتووورە زۆرو جیاجیاکانی جیهانی سێیەمی کرد بەیەكو لەژێر ئەو ناوەدا ژمارەیەکی زۆر لــە مەسەلەو بابەتەکان کۆبوونەوەو لــە نێوانیانــدا دروشمــی نەهێــشتنی کـۆتو بەنـدی سیاسـیو ئابووری کە جیهانی یەکەمو دووهەم سەپاندبوویان بەسەریاندا، هەروەها هــەوڵی سـوودوەرگرتن لــە تــەکنۆلۆژیاو ئــابووریی پێــشکەوتوو و دروســتکردنی سیــستمگەلێکی پەیوەنــدی کــە بەکارهێنانی گونجاوتر بێ بۆ دەوڵەتانی جیهانی سێیەم.

(ئۆرتێگا)و (رومیرۆ) بابەتیان تەنیا لەسەر (پـیرۆ) دەنووسـی بــەڵام وشـەکانیان جێبــەجێ دەکرا بەسەر هەموو وڵاتانی جیهانی سێیەمدا کاتێك کە باسیان دەکرد لە (رادەی تونـدوتۆڵیی پەیوەندی لە نێوان بنەمای سیاسیو ئابووریو بەکارهێنانی هۆکـانی راگەیانـدنی جـەماوەریو خاوەنداریەتیی ئەو هۆیانەی راگەیاندن).

### بەهاکانی هەواڵ

لە جیهانی سێیەمدا زۆر هەوڵ دراوەو ئێـستاش دەدرێ بـۆ گەیـشتن بــە چـەند بەهایــەکی هەواڵ، بۆ ئەوەی جێگەی بەهاکانی جیهانی یەكو دوو بگرنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێ لــە

رۆژنامەنووسان لایان وایە، هەندێ لەو پێشنیارانەی تایبەتن بە بەهاکانی هەواڵەوە لە جیهانی سێهەمدا، جۆرە هەڕەشەیەکن لە ئازادیی رۆژنامەنووسی. هەندێ پرسیارو بابەت ورووژێنراون لەسەریانو بە چڕی دەسکراوە بە گفتوگۆکردن لەسەر ئەو بەهایانە. وا لە خوارەوە لیستێك بەو بەهایانە دەخەینە بەردەست کە ئێستا باون لە جیهانی سێهەمدا.

* **بواری گەشەکردن:** لەگەڵ ئەوەدا کە ئێمە بەشێکی تری ئەم کتێبەمان تەرخان کردووە بۆ باسکردنی رۆڵی رۆژنامە لە بواری گەشەکردنی وڵاتدا بە دوورودرێژی، بەڵام هەر پێویستە باسێکی ئەم مەسەلەیە بکەین لەم بەشەدا. بواری گەشەکردن بەهایەکی سەرەکیی هەیە لە هەواڵی جیهانی سێهەمدا. هەواڵ بریتییە لە گەشەکردنو پێگەیشتن، بەربەستی ئاوو ساختمانو تەلاری نوێو رێگەی نوێو وڵاتانی تازە.

بەشێکی زۆری ئەو راپۆرتەی لیژنەی (ماك براید)ی سەر بە رێکخراوی پەروەردەو زانستو رۆشنبیریی نەتەوەیەکگرتووەکان (یونسکۆ)، دایناوە، باسی رۆڵی رۆژنامە دەکا لە بواری گەشەکردندا، لە راپۆرتەکەدا هاتووە کە پەیوەندی بە خەڵکەوە، لە توانایدایە ببێ بە هۆیەك بۆ بەهێزیو چەکێکی شۆڕشگێڕیو ئامرازێك بۆ فێرکردنو رۆشنبیرکردن، هەروەها دەکرێ کە خزمەتی رزگاربوون یا سەرکوتکردن بکا، خزمەتی گەشەکردنی کەسیەتیی تاك یا راهێنانی لەسەر گوێڕایەڵیو ملکەچبوون. هەموو کۆمەڵگەیەك پێویستە لەسەری باشترین شێوازو رێگە هەڵبژێرێ بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئەرکەی رووبەڕووی هەموومان دەبێتەوەو دۆزینەوەی رێگەچارە بۆ وەلاخستنی ئەو کۆتە مادديو کۆمەڵایەتیو سیاسییانەی بوونەتە کۆسپ لە رێگەی پێشکەوتنندا.

* **بەرپرسیاریەتیی کۆمەڵایەتی:** هەواڵو راگەیاندن بەرپرسیاریەتییە، لەگەڵ ئەوەدا کە ئەم بەهای بەرپرسیاریەتییە سەنگو قورسایی خۆی هەیە لە هەرسێ جیهانەکەدا، بەڵام لە جیهانی سێهەمداو لەو وڵاتانەدا کە پێکهاتەیان فشوفۆڵە، بە شتێکی پێویست دادەنرێو ناخرێتە پشتگوێ. بۆ نموونە ئەو یاسایانەی دانراون بۆ رەوشتی رۆژنامەنووسی لە ئەنجومەنی رۆژنامەنووسی هیندستان، تیایدا هاتووە: (پێویستە لەسەر رۆژنامەنووسان هەوڵ بدەن بۆ خستنەڕوو و بەهێزکردنی چالاکییەکانی حکومەتو جەماوەر لەپێناوی هێنانەدیی یەکیەتیی نیشتمانیو هاوکاریو یەکیەتیی خاکی هیندستانو پێشکەوتنی ئابووریو کۆمەڵایەتیدا.



کۆنگرەی وەزیرانی راگەیاندنی دەوڵەتانی بێلایەن کە لە (جاکارتا)ی پایتەختی ئەندەنوسیا بەسترا لە ساڵی (١٩٨٤)دا، یەکێك لەو داواکارییانەی ئاراستەی هۆکانی راگەیاندنی جەماوەریی کردبوو، ئەوەبوو کە بانگی کردبوون بۆ خۆپاراستن لە بڵاوکردنەوەی هەواڵی لایەنگرانەو هەموو دیاردەکانیو، خۆیان دوور بخەنەوە لە بڵاوکردنەوەی ئەو هەواڵانەی کە راستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ زیان دەگەیەنن بە بەرژەوەندیی یەکێك لەو دەوڵەتانەی ئەندامن لە بزوتنەوەی وڵاتانی بێلایەندا یا لە دژیان.

لە راستیدا ئەمە لایەنێکی خراپە لە بواری رۆژنامەوانیی وڵاتانی تازەپێگەیشتوودا، چونکە رۆژنامەنووسان، تەنیا داوای ئەوەیان لێناکرێ کە تەنها گرنگی بدەن بە هەواڵی چاکو بنیاتنەر، بەڵکو داوای ئەوەشیان لێدەکرێ کە هەواڵە خراپو ناخۆشەکان یا ئەو بوارانەی دەوڵەت سەرکەوتوو نییە تیایاندا بخرێنە پشتگوێ یا گرنگییەکی کەمیان بدرێتێ.

رەنگە هەندێ کەس ئەم داواکارییەی کۆنگرەیان بەلاوە سەیربێو بە جۆرە هەڕەشەکردنێکی دابنێن بۆ ئازادیی رۆژنامەوانی. بەڵام (هیلاری نجوینو) سەرنووسەری یەکێك لە رۆژنامەکانی کینیا، رەتکردنەوەیەکی هەیە لەسەر ئەم بۆچوونەو دەڵێ: (ئەو بەرەنگاربوونەوەیەی رووبەڕووی رۆژنامەوانی دەبێتەوە لە وڵاتانی تازەپێگەیشتوودا، هەمان کۆسپە کە رووبەڕوویان دەبێتەوە لە مەسەلەی دانانی بناغەیەك کە سەربەستیو ئازادیی پاشەڕۆژی لەسەر بنیات دەنرێو گەشە دەکا). هەروەها (نجوینو) لەسەر قسەکانی دەڕواو دەڵێ: (لەژێر بارودۆخێکی وەك ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لە میللەتانی ئاسیاو ئەفریقیاو ئەمریکای لاتیندا تێیدا دەژین، باسکردن لە ئازادیی رۆژنامەگەری، جۆرێکە لە قسەکردن لەسەر تێری، چونکە سەربەستی هیچ مانایەکی نامێنێت لە کاتێکدا کە مانەوەی مرۆڤ تەنیا کاریگەرو هیوایەك بێ کە یەکێك لەو میللەتانە لەسەری دەژی.

## یەکیەتیی نیشتمانی

ئەم بەهایە درێژەپێدەرو تەواوکەری ئەرکەکانی ئەو رۆژنامانەن کە کار دەکەن لە بواری گەشەکردنی وڵاتداو هەست بە لێپرسراویەتی دەکەن لە باری کۆمەڵایەتییەوە. هەواڵ رەنگە پاڵ پێوەنەر بێ بۆ هەستکردن بە سەربەرزیی نەتەوەییو یەکیەتیی نیشتمانو وڵات، ئەمەش لە

ڕێگەی سووربوونو پێداگرتن لەسەر دەسکەوتە بەسوودەکانی میللەت. ئەم هەستکردن بە سەربەرزیی نەتەوەییو یەکیەتیی نیشتمانە بە هیچ نرخێك بەراورد ناکرێ بۆ دەوڵەتە تازەپێکهاتووەکانو ئەو حکومەتو دەسەڵاتدارە نوێیانەی کە مەبەستیانە دەست لە فەرمانڕەوایی بەرنەدەن.

(نجوینو) سەبارەت بە دووبەرەکیو تیرەگەری کە تا ئێستاش لە وڵاتانی ئەفریقیادا بەردەوامن، دەڵێ: (لەم جۆرە وڵاتانەدا، ئەرکی یەکەمی ڕۆژنامە — وەك هەر دەزگاو کەسێکی تر — هاندانە بۆ بەدەستهێنانی ئەوپەڕی یەکیەتیی نیشتمانی، چونکە بە نەبوونی ئەو یەکیەتییە هەموو بەها مرۆڤایەتییەکانی کۆمەڵ، دەبنە بابەتگەلێکی دەست پێنەگەیشتوو و مەحاڵو لەو حاڵەتەشدا مەسەلەی ئازادیو دادپەروەری هیچ مانایەکیان نابێو ژیانیش ئارامو هێمن نابێ. من لام وایە لە هەر وڵاتێك بڕێکی باش یەکیەتیی نیشتمانیی تێدا نەبێ، ڕۆژنامەگەری دەبێت بچێتە ژێر باری ئەرکی هەوڵو یارمەتیدان بۆ یەکخستنی میللەتو لەناوبردنی ئەو بێ متمانەییەی هەیە لەناو کۆمەڵگە یا تیرەو تایفەکاندا).

ئەم بیروبۆچوونە وەنەبێ هەر تایبەت بێ بە تەنیا ئەفریقیاوە، ئەوەتا (هان بیەهو) دەربارەی کۆریا — کە ئەویش دەناڵێنێ بە دەست دووبەرەکیو پەرتەوازەییەوە — دەڵێ: (لەبەر ئەوەی یەکیەتیی نیشتمانی ئامانجی سەرەکیو یەکەمی کۆماری کۆریایە، دەبێ سەربەستیی ڕۆژنامەگەری لە چوارچێوەی ئەم ئامانجەدا لێکبدەینەوەو پێناسەی بکەین.

هەروەها زانایەکی تری کوریایی کە (ئو ئینوان)ە ڕاپرسییەکی ئەنجام داوە لەناو (٣٧٠) ڕۆژنامەنووسی وڵاتەکەیدا، لەو ڕاپرسییەدا بۆی دەرکەوتووە کە ڕێژەی (٩٠٪) کۆکن لەسەر ئەوەی کە ڕۆژنامە دەبێ بەشداری بکا لە یەکخستنی میللەتدا.

## ڕۆشنبیرکردن

لە جیهانی سێهەمدا هەواڵو ڕۆژنامە، خەڵك فێر دەکاو ڕۆشنبیری دەکا. هەواڵ دەکرێ بەکار بهێنرێ بۆ گەیاندنی زانیاری لەسەر چاودێریی تەندروستی، یا زانیارییەك بێت یارمەتیدەر بێت لە بواری کشتوکاڵ یا کاری ڕۆشنبیریدا. لە دێهاتەکاندا کە ئامێری ڕادیۆ تاکە سەرچاوەیە بۆ پەیوەندی بە هەموو لایەکی وڵاتەکەوە، ئەم ئامانجی ڕۆشنبیرکردنە زۆر کارێکی پێویستە.



ئەم بەهای ڕۆشنبیرکردنەی هەواڵ لایەکی تری هەیە کە کەمتر ڕوونە، ئەویش بریتییە لەوەی هەواڵ بەهۆی ئەوەوە کە ئامێرێکە بۆ ڕۆشنبیرکردن، دەکرێ بەکار بهێنرێ لە دانانی بەرنامەیەك بۆ میللەت. (مەهاتما گاندی) ئەم بەهایەی هەواڵی بەم شێوەیە بۆ ئێمە ڕوون کردووەتەوەو دەڵێ: (یەکێك لە ئامانجەکانی ڕۆژنامەوانی ئەوەیە کە لە هەستی میللەت تێبگاو بیخاتە ڕوو. ئامانجێکی تر بریتییە لە وروژاندنی چەند هەستێکی تایبەتیی باشو پەسەند لای ئەندامانی میللەت. ئامانجی سێهەمیش ئەوەیە ئەو ناتەواوییە بەربڵاوانەی کە هەن بخاتە ڕوو و ڕسوایان بکا بە بوێریو ئازایەتییەوە).

(ئەندیرا گاندی)ش چەند بیروبۆچوونێکی وەك ئەوەی مەهاتما گاندیی دەربڕیوەو دەڵێ: (ئەگەر زانیاری بریتی بێ لە بەهێزی، ئەوە مانای ئەوە نییە تەنیا بەهێزی لە سەپاندندا بەڵکو بەهێزی لە بەرگریکردنیشدا)، هەروەها دەڵێ: (وڵاتە بێلایەنەکان دەبێ لەم ڕوانگەیەوە بڕواننە مانای پەیوەندیکردن بە خەڵکەوە. سەبارەت بە ئێمەیش بواری ڕاگەیاندنو پەیوەندی هۆیەکی سەرەکییە بۆ بەرزکردنەوەی هەستو زانیاریی میللەتەکەمانو مسۆگەرکردنی بەشداریکردنی لە کاروباری وڵاتو نێودەوڵەتیدا).

## چەند بەهایەکی تری هەواڵ

هەندێ بەهای تری هەواڵ هەن کە ڕۆڵێکی لاوەکی دەگێڕن لە جیهانی سێهەمدا، لەگەڵ ئەوەدا کە لەیەکچوونێکی تەواویان هەیە لەگەڵ ئەو بەهایانەی هەواڵی جیهانی یەکەمدا. وەك (ماتا) دەڵێ: (تازەییو گەرموگوڕیی هەواڵ، نزیکی شوێنی هەواڵو ڕووداوەکە، گرنگیدان بە کەسیەتیی خاوەن هەواڵ بە چەند سیفەتێکی سەرەکی دادەنرێن لە جیهانی سێهەمدا).

## خستنەڕووی هەواڵ لە جیهانی سێهەمدا

وەك چۆن ڕوو دەدا لە جیهانی یەکەمو دووەمدا، خستنەڕووی هەواڵ لە جیهانی سێهەمدا، یەکێکە لە ئەرکە سەرەکییە گرنگەکانی بەهاکانی هەواڵ. پێکەوەنانو ڕێکخستنی هەواڵو شێوازەکەی دەبێ گونجاو بێ لەگەڵ بەهاکانی ئەو ڕۆژنامانەی گرنگی دەدەن بە بواری گەشەپێدانو ڕۆشنبیرکردن کە بەرپرسیاریەتییەکی کۆمەڵایەتی دەکەوێتە ئەستۆیان.

هەواڵو دەنگوباسی خۆشو باش دەخرێنە رووو بڵاو دەکرێنەوە لە زۆر کاتدا، هەواڵی ناخۆشو خراپیش بە شتێکی بێبایەخ سەیر دەکرێن ئەمە ئەگەر هەر باسیش بکرێن. ئەم شێوازانە خودیو نابابەتییانەنو لە شێوازەکانی جیهانی دووهەم دەچن لەو لایەنەوە کە هەوڵ دەدرێ تیایاندا بۆ ورووژاندنی هەستو سۆزی پابەندبوونو یەکیەتی لای خوێنەران. بەرنامەو پرۆگرامی یەکیەتیی رۆژنامەنووسانی (سلفادۆر) ئەم پابەندییە دەخاتە رووو ئەوە دووپات دەکاتەوە کە (یەکیەتیی نیشتمانیی رۆژنامەنووسانی سلفادۆر، رێکخراوێکی دیموکراتیی میللییەو دژی ئیمپریالیزمەو، چەندەها شێوازی تێکۆشان دەگرێتە بەر کە بگونجێ لەگەڵ ئەو پرۆسە شۆڕشگێڕییەدا کە میللەتی سلفادۆر گرتوویەتە بەر بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکان).

بەڵام چەند بەڵگەیەك هەن ئاماژە دەدەن بەوەی کە هەندێ لە رۆژنامەنووسانی جیهانی سێ، دان دەنێن بە گرنگیی هەواڵی رۆشنبیریو رابواردندا لە باری ئابوورییەوە. (دایو دویل) سەبارەت بە هۆکانی راگەیاندن لە نیجیریا دەڵێ: (ئامانجی سەرەکیی بەرپرسیاریەتیی کۆمەڵایەتی، راگەیاندنو کات بەسەربردنو بەرزکردنەوەی رادەی ناکۆکی بۆ ئاستی گفتوگۆکردنە. رۆژنامەکانی نیجیریا لە هەموو ئەم کارانەدا خۆی کردووە بە هاوبەش).

## نیشانەکانی گۆڕان

گۆڕان تاکە شتێکی جێگیرە لە بەهاکانی هەواڵی جیهانی سێهەمدا، گۆڕانێك لەناو جیهانی سێهەمدا بە گشتیو گۆڕانێك لە هەر وڵاتێکدا بە تەنیا. دەکرێ بگوترێ بە شێوەیەکی گشتی کە زۆربەی سیستەمو پرۆگرامی رۆژنامەوانی وڵاتانی جیهانی سێهەم جۆرە لەیەکچوونێکیان هەیە لەگەڵ ئەو سیستەمانەی وڵاتەکانی جیهانی دووهەم، حکومەتەکان دەسکاریی هەواڵ دەکەن، هەواڵ بەکار دەهێنرێ بۆ بەدیهێنانی ئامانجە نیشتمانییەکان. ئەو هەڵوێستی پەسەندنەکردنو رەتکردنەوەیەی لایەنی جیهانی یەکەم پیشانی دەدا بەرامبەر بەو بانگەوازەی دەکرێ بۆ بنیاتنانی سیستەمێکی راگەیاندنی نێودەوڵەتیی نوێ، هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەم جۆرە بەهایانەی هەواڵ کە پەیڕەوی دەکرێ لە جیهانی سێهەمدا.

لەگەڵ ئەوەشدا، بەڵگە هەیە لەسەر ئەوەی کە هەندێ واتاو تایبەتمەندیی هەواڵ لە جیهانی یەکەمدا، وەك راستگۆییو بابەتیبوونی هەواڵ، کاریگەریی خۆی کردووە لەسەر



بەهاکانی هەواڵ لە جیهانی سێهەمدا. بەیاننامەیەك کە لەلایەن یەکیەتیی رۆژنامەنووسانی (نیکاراگوا)وە دەرچووە دەڵێ: پێویستە لەسەر هۆکانی راگەیاندنی جەماوەر، کە هەواڵەکانی ئاراستە بکا بەرەو شیکردنەوەی کێشەکانی وڵات لە دیدگەو بۆچوونێکی بابەتییانەوە بە جۆرێك لەگەڵ واقیعدا هاوشان بێ.

لە هیندستاندا (ئەندێرا گاندی) سکاڵا لەوە دەکات کە (گەلێك لە رۆژنامەنووسان لەو وڵاتەدا لایان وایە زیرەکییە ئەگەر لاسایی پێناسەی باوی رۆژاواییەکان بکەنەوە کە دەڵێن: "هەواڵی چاك بریتییە لە هەواڵی خراپو ناخۆش" وەك چۆن هەواڵی تایبەت بە چالاکیی بنیاتنانو گەشەپێدانی وڵات بێزاریان دەکات).

لەگەڵ ئەوەشدا دوور نییە بەهای راستەقینەی هەواڵ لە جیهانی سێهەمەوە دەربچێو لەبەر ئەوەی کە رەگەزەکانی بەهای هەواڵ لە جیهانی یەکەمو دووهەمدا بەرەبەرە لەیەك نزیك دەبنەوەو هەروەها لەبەر ئەوەی کە رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم بەردەوامن لە هەوڵدا بۆ ئەوەی لەنێو ئەو بەهایانەدا بەهاگەلێکی تایبەت بە خۆیان دروست بکەن بۆ هەواڵ، ئەوە ئاشکرایە کە بنەمایەکی هاوبەش هەیە لە بەهاکانی هەواڵی هەر سێ جیهانەکەداو، ئەو جیاوازییانە هەر دەمێننەوە تا جیاوازی هەبێ لەنێو دەوڵەتەکان خۆیاندا، بەڵام رەنگە لە یەکچوونی زیاتر دەربکەوێو ئەو لەیەکچوونانە رەنگە بەهایەکی جیهانیی لێبکەوێتەوە بۆ هەواڵو رووداوەکان.

## سەرچاوەکان

1. For a short discussion of early communication systems, see Robert W. Desmond, The Information Process: World News Reporting to the Twentieth Century (Iowa City: University of Iowa Press, 1978), pp. 1-28.
2. From his UNESCO paper, “Synthesis of Western Viewpoints”, (Paris: UNESCO, 1980), p. 8.
3. Desmond, p. 21.
4. Heinz-Dietrich Fischer and John C. Merrill, eds. International and Intercultural Communication (New York: Hastings House Publishers, 1976), p. xii.
5. In his The World News Prism (Ames, Iowa: The Iowa State University Press, 1981), p. 18.
6. Ibid.
7. Johan Galtung and Mari Ruge, “Structuring and Selecting News”, in Stanley Cohen and Jock Young, eds. The manufacture of News: Deviance, Social Problems and the Mass Media (London: Constable Publications, 1973), pp. 62-73.
8. Barry Rubin, “International News and the American Media”, in Dante B. Fascell, ed. International News (London: SAGE Publications, 1979), pp. 181-243.
9. Hester, p. 11.
10. Ibid.
11. Rubin, p. 213.
12. E. Diamond, The Tin Kazoo (Cambridge: MIT Press, 1975), p. 94.
13. Rubin, p. 213.
14. Ibid.
15. Jeremy Tunstall, The Media in Britain (New York: Columbia University Press, 1983), p. 142.



16. James Reston, Sketches in the Sand (New York: Knopf, 1967), p. 195.
17. Walter Lippmann, “The Nature of News”, in Charles S. Steinberg, ed. Mass Media and Communication (New York: Hastings House Publishers, 1972), p. 143.
18. Ibid., p. 148.
19. Ibid., p. 150.
20. Newsday, Long Island, New York, December 30, 1984, p. 9.
21. John Hartley, Understanding News (London: Methuen and Company, Ltd., 1982), p. 81.
22. Ibid.
23. Reston, p. 194.
24. Tunstall, p. 153.
25. Ibid.
26. Wall Street Journal, May 6, 1982, p. 28.
27. Ibid.
28. Christian Science Monitor, May 21, 1984, p. 3.
29. Ibid.
30. Christian Science Monitor, April 12, 1984, p. 22.
31. James Markham, Voices of the Red Giants (Ames, Iowa: The Iowa State University Press, 1967), p. 37. This classic still is a most valuable reference for discussions of Russian and Soviet communications.
32. Ibid., p. 104.
33. As cited by V. Glukhov in “Mass Communication Media in the USSR”, Democratic Journalist, July-September, 1981, p. 17.
34. Pravda, September 17, 1983, p. 1, as translated by the Foreign Broadcast Information Servece, Washington D.C., (hereinafter cited as FBIS).
35. Pravda, January 27, 1983, p. 1, FBIS.
36. Ibid.

37. Sepp Horlamus, Mass Media in CMEA Countries (International Organization of Journalists, 1976), p. 59.
38. Ibid.
39. Pravda, January 27, 1983, p. 1, FBIS.
40. Horlamus, p. 27.
41. Ibid.
42. “Some Facts About Pravda”, Democratic Journalist, July-August, 1982, p. 37.
43. Pravda, July 2, 1983, p. 1, FBIS.
44. Ibid.
45. Pravda, January 27, 1983, p. 1, FBIS.
46. Rilla Dean Mills, “The New Soviet Journalism: More Facts?”, Newspaper Research Journal, Fall, 1982, p. 28.
47. Ibid., p. 30.
48. M. V. Desai, Communication Policies in India (Paris: UNESCO, 1977), p. 14.
49. Ibid.
50. Ibid., p. 22.
51. M. A. de Silva, Communication Policies in Sri Lanka (Paris: UNESCO, 1977), p. 23.
52. Graham Mytoon, Mass Communication in Africa (London: Edward Arnold Publisher Ltd., 1983), p. 38.
53. Ibid.
54. Carlos Ortega and Carlos Romero, Communication Poicies in Peru (Paris: UNESCO, 1977), p. 19.
55. As cited in Oswald H. Ganley and Gladys D. Ganley, To Inform or To Control? The New Communications Network (New Delhi: Hindustan Publishing Corporation, 1982), p. xvii.
56. Desai, p. 32.



57. “Jakarta Appeal to the Mass Media”, Democratic Journalist, February, 1984, supplement.
58. Mytoon, p. 59.
59. Ibid., p. 60.
60. Hahn, Gae-ho, Communication Policies in the Republic of Korea (Paris: UNESCO, 1978), p. 14.
61. Ibid., pp. 27-28.
62. Desai, p. 25.
63. Indira Gandhi, “Communication for International Cooperation and Mutual Understanding”, Democratic Journalist, February, 1984, p. 7.
64. F. R. Matta, “Concept of News in Latin America”, Democratic Journalist, Aplil, 1979, pp. 4-8.
65. “Declaration of Principles”, Democratic Journalist, January, 1982, p. 10.
66. Dayo, Duyile, Media and Mass Communication in Nigeria (Ibadan, Nigeria: Sketch Publishing Company, 1979), p. 24.
67. “Statement of the Nicaraguan Journalists’ Union”, Democratic Journalist, Aplil, 1984, p. 19.
68. Indira Gandhi, p. 6.

# بەشی چوارەم

# لێشاوی هەواڵی نێودەوڵەتی

**نووسینی: جیم ریچستاد**

زیاتر لە دە ساڵ مەسەلەی لێشاوی هەواڵو رادەی لە بەرچاوگرتنی مەسەلەی راستگۆییو ویژدانو قازانجو سوودی هەواڵ بووبوو بە تەوەری ئەو گفتوگۆ نێودەوڵەتییانەی دەکرا دەربارەی پەیوەندیو راگەیاندنی نێو دەوڵەتان. بزوتنەوەی دەوڵەتانی بێلایەن، ئەم مەسەلەیەی دانابوو لە لیستی کارە سیاسییە نێودەوڵەتییەکانداو لە سەرەتای ساڵانی حەفتادا، داوای پێکهاتنی سیستمێکی راگەیاندنی نوێی جیهانی دەکرد. ئەو بەیاننامەیەی کۆنگرەی لوتکەی وڵاتانی بێلایەن کە ساڵی ١٩٧٣ لە جەزائیر بەسترا، داوای ئەوەی دەکرد سەرلەنوێ کەناڵەکانی پەیوەندیو راگەیاندن رێك بخرێنەوە کە لە سەردەمی ئیمپریالیزمەوە بە میرات ماوەتەوەو بووەتە کۆسپ لە رێگەی پەیوەندیی سەربەخۆو راستەوخۆو خێرا لە نێوان دەوڵەتانی بێلایەندا.

هەروەها ئەو کۆنگرەیە داوای لە دەوڵەتانی بێلایەن دەکرد کە ئەو زانیارییانەی پەیوەندییان هەیە بە سەرکەوتنو دەسکەوتە هاوبەشەکانیانەوە ئاڵوگۆڕی پێبکەنو بڵاویان بکەنەوە لە رێگەی هۆکانی راگەیاندنەوە کە هەیە لەو وڵاتانەداو هەموو دەوڵەتێك لەوانە سوود وەرگرن لە ئەزموونەکانی ئەوانیتر لە بواری راگەیاندندا.

جگە لەو ناهاوسەنگییەی هەیە لە لێشاوی راگەیاندندا، ناهاوسەنگیش هەیە لە هۆکانی پەیوەندیو ئامێرەکانی ئەو راگەیاندنەدا، ریچارد بەتلەر، سکرتێری گشتیی یەکیەتیی نێودەوڵەتی بۆ پەیوەندییەکان بەهۆی ئامێرە تەلدارو بێتەلەکانەوە ئەم مەسەلەیەمان بۆ روون دەکاتەوەو دەڵێ: (لە ساڵی "١٩٨٢"دا بۆ نموونە، ٥٥٠ ملیۆن ئامێری تەلەفونو ٦٠٠ ملیۆن ئامێری تەلەفزیۆنو ١٠٤ ملیۆن ئامێری تەلکسو چەند هەزار تۆڕی زانیاریو چەندەها ئامێری بڵاوکردنەوە بۆ مەبەستی تایبەت هەبوون لە جیهاندا). بەڵام (٩٠٪)ی ئەم هۆو ئامێرانە تەنیا



لای (١٥٪)ی وڵاتاندا بوو، ئیتر ئەو رێژەی (٨٥٪)ەکەی تر لە دەوڵەتانی جیهان، ئەو رێژەی (١٠٪)ەی کە ماوەتەوە بەکاریانهێناوە، ئەمریکا بە تەنیا خۆی خاوەنی نیوەی ئامێری تەلەفونە لە جیهاندا.

لە ساڵی (١٩٧٤)دا کۆنگرەی گشتیی رێکخراوی پەروەردەو زانستو رۆشنبیریی سەر بە نەتەوەیەکگرتووەکان (یونسکۆ) کە لە شاری (نیرۆبی) بەسترا، گفتوگۆی کرد لەسەر ئەم مەسەلەی لێشاوی هەواڵە لە چوارچێوەی بەیانێکدا بە ناوی (بڵاوکردنەوەی هۆکانی راگەیاندنی جەماوەری)و مەسەلەکەی پاڵ پێوە نا بۆ ئەوەی گرنگییەکی جیهانی وەربگرێ، هەروەها دەرکردنی ئەم بەیاننامەیە سەرنجی حکومەتانو رێکخراوەکانی راگەیاندنی رۆژاوای راکێشا بۆ مەسەلەی بڵاوکردنەوەی هەواڵ لە جیهانداو لەو کاتەوە لە جیهاندا گرنگییەکی زۆری پێدەدرێ.

هەروەها بەشداربووانی سیمیناری نێودەوڵەتیی هەمەر شۆڵد بۆ رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم کە لە ساڵی (١٩٧٥)دا لە نیویۆرك ساز کرا گفتوگۆیان کرد لەسەر ئەوەی کە جیهانی سێهەم پێویستیی بە بڵاوکردنەوەیەکی باشتر هەیە بۆ هەواڵ، بۆ ئەوەی میللەتانی جیهانی پێشکەوتوو بتوانن بە شێوەیەکی باشتر لە بارودۆخی ژیانیان تێبگەنو سیستمی ئابووریی نوێی نێودەوڵەتی یارمەتییان بدەن.

ئەو بەیاننامەیەی کە پاش سیمینارەکە بڵاو کرایەوە دەڵێ: بزوتنەوەی رزگاریخوازی سیاسی تەواو، هەروەها بە کۆتو بەندکراوی دەمێنێتەوە تا ئەو کاتەی چەند هەنگاوێك دەنرێ بۆ پچڕاندنی تەوقی ئاژانسەکانی دەنگوباس کە هیچ رەنگدانەوەیەکی بەرژەوەندییەکانی جیهانی سێهەم دەرناکەوێ لەو زانیارییانەدا کە دەنێررێن بۆ ئەو جیهانە یا لەوانەوە دێت.

ناوەڕاستی ساڵانی حەفتای سەدەی بیستەم دەرکەوتنی مەسەلەی بە لێشاو بڵاوبوونەوەی هەواڵی بەخۆوە بینی لە چوارچێوەی هەردوو سیستمی نوێی (راگەیاندنی نێودەوڵەتی)و (ئابووریی نێودەوڵەتی)دا. لە ئەنجامی ئەو مشتومڕو گفتوگۆ گەرمەی زۆرجار رووی دەدا لە رێکخراوی (یونسکۆ)و سیمینارە نێودەوڵەتییەکانی تردا، دوژمنایەتیو لەیەکڕەنجان پەیدا دەبوو لە نێوان نوێنەرانی جیهانی سێهەمو جیهانی یەکەمدا. لەو سیمینارانەدا ئاڵوگۆڕکردنی تۆمەتو یەکدی تاوانبارکردن بووبوو بە کارێکی ئاساییو باو، ئەم ئەوی تاوانبار دەکرد بەوەی

دەیانەوێ باری رۆشنبیریی وڵاتانی جیهانی سێهەم بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوەو ئەمان ئەوان تاوانبار دەکەن بەوەی کە باری رۆشنبیری لەژێر کۆنترۆڵو دەسەڵاتی دەوڵەتدایە.

ئەو تۆمەتانەی دەوڵەتانی جیهانی سێهەمو چەند لایەنێکی تر ئاراستەی جیهانی یەکەمیان دەکرد ئاشکراو لەڕوو بوو، ئەویش بریتی بوو لەوەی کە سیستمی بڵاوکردنەوەی هەواڵەکانی جیهان، جیهانی پێشکەوتوو دەیبا بەڕێوە بەهۆی ئاژانسە گەورەکانی جیهانەوە کە بریتین لە (ئەسۆشیتد برس)و (یونایتد برس ئینتەرناشیۆنال)و (ئاژانسی دەنگوباسی فەرەنسا)و لە ئەنجامدا — بە مەبەست بێ یا بە رێکەوت — هەواڵەکانی جیهان هەر لە یەك لاوە بڵاو دەکرێتەوە، واتە لەلایەن دەوڵەتە پێشکەوتووەکانەوە بۆ دەوڵەتە تازەپێگەیشتووەکان، شێواندنی ئەو برە کەمەی هەواڵ کە پەیوەندیی هەیە بە دەوڵەتە تازەپێگەیشتووەکانەوەو کەمیو ناتەواویی ئەو هەواڵانەی پەیوەندییان هەیە بە دەوڵەتانی جیهانی سێهەمەوەو چۆنیەتیی چارکردنی کێشەو گرفتەکانیان.

رەخنەگرانی جیهانی سێهەم دەڵێن، ئەو هەواڵانەی لە هەموو لایەکدا بڵاو دەکرێنەوە لە دیدگەیەکی رۆژاواییەوەیەو بە چاوی رۆژاواوە سەیریان دەکرێو بەگوێرەی سیستمی هەواڵیی رۆژاوا تاووتوێ دەکرێن.

### ئایا ئەم دەسکاریکردنو یاری پێکردنە بە مەبەستە؟

ئەوانەی بە ناوی جیهانی سێهەمەوە قسە دەکەنو بێلایەنن وەك دوکتۆر (مصطفی المصمودي) لە تونسو زانای رەخنەگری ئەمریکی (هربرت شیلر)، سوورن لەسەر ئەوە کە سیستمەکانی بڵاوکردنەوەی هەواڵ و حکومەتەکان و، دەزگا سەربازیو بازرگانییەکانی رۆژاوا، بە مەبەست دەسکاریی هەواڵە جیهانییەکان دەکەن بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بۆ ئەوەی جیهانی سێهەم لە حاڵەتی پاشکۆیەتیدا بهێڵنەوە.

تا مانگی دوانزەی ساڵی (١٩٨٤)یش، مصمودي هەر بەردەوام بوو لە هێرشبردندا بۆ سەر ئاژانسەکانی دەنگوباسی جیهان بە شێوەیەکی توندوتیژو رەق، لەگەڵ ئەوەدا کە پێشکەوتنێکی گەورە رووی دابوو لە بواری هێوربوونەوەی گفتوگۆی نێوان ئەو دوو جیهانەو دەرکەوتنی چەند بەڵگەیەك لەسەر ئەوەی کە بڵاوکردنەوەی هەواڵەکان هیچ کاتێك ناهاوسەنگیو لایەنگریو



ناپەیوەندیی تێدا نەبوو، وەك رەخنەگرە پێشووەکان دەیانگوت، لەو وتەیەدا کە (مصمودي) پێشکەشی کرد لە بەردەم کۆبوونەوەی دەوڵەتانی بێلایەندا لە (نیودەلهی)، دەڵێ: ئێمە ئێستا، حاڵەتێکی بێ بەزەییانەی بازرگانیو قازانج دەبینین تێکەڵ بە هێرشێکی بەردەوام بۆ سەر لایەنی رۆشنبیری، ئابووریمانی خستووەتە مەترسییەوەو دابونەریتی کۆمەڵایەتیمانی وێران کردووەو منداڵەکانمانی کردوون بە رۆژاوایی، بەڵێ بەهێزەکان هەموو کاتێك لەسەر حەقن، بەڵام کاتی ئەوە هاتووە کە جیهان گوێ راگرێ بۆ دەنگی بێدەسەڵاتەکان.

بەڵگەکانی رۆژاواش توندوتیژییان پێوە دیار بوو بەرامبەر گەلێك لە دەوڵەتانی جیهانی سێهەم کە داوای بڵاوکردنەوەیەکی ئازادو هاوسەنگ دەکەن لە بڵاوکردنەوەی هەواڵە جیهانییەکاندا، کەچی لە راستیدا خۆیان کۆتوبەند دادەنێن لەسەر ئەو رۆژنامانەی کە لای خۆیان دەردەچێو چەندەها کۆسپ دادەنێن لە بەردەم رۆژنامەنووسە بیانییەکاندا. نوێنەرانی دەزگا رۆژاواییەکان بە دەنگی بەرز پرسیار دەکەن، چۆن دەکرێ حاڵەتێکی دادپەروەرانەو هاوسەنگ هەبێ لە جیهانی سێهەمدا، لە کاتێکدا خودی ئەم دەوڵەتانە رێگە نادەن بە رۆژنامەنووسەکانی خۆیان ئازادییەکی تەواویان هەبێ لە داڕشتنی هەواڵەکانداو رێگە دەگرن لە رۆژنامەنووسە جیهانییەکان راپۆرت ئامادە بکەن لەسەر هەواڵو رووداوەکان. رۆژاواییەکان زۆر حاڵەت بە بەڵگە دێننەوە کە پشتگیریی ئەم بۆچوونەیان دەکەن، وەك چەند حاڵەتی گرتنی هەندێ رۆژنامەنووسو لێدانو سەرکوتکردنیانو رێگە لێگرتنیان لە ئەنجامدانی ئەرکەکانیاندا.

لە ساڵی (١٩٧٦)دا ئەم مەسەلانە بە ئاشکرا خرانە روو، لە یەکێك لە کۆبوونەوەکانی رێکخراوی (یونسکۆ) کە لە شاری نیرۆبی بەسترا، لەم کۆبوونەوەیەدا بۆ یەکەم جار رۆژنامەنووسو دەوڵەتە رۆژاواییەکان خۆیان ئامادە کرد بۆ رووبەڕووبوونەوەی رەخنەو بەڵگەکانی جیهانی سێهەم. لە لە سەرەتادا رۆژنامەنووسە رۆژاواییەکان بە توندی نارەزایی خۆیان پیشان دا بەرامبەر بەیاننامەی ئامادەکراو بە ناوی (بەیاننامەی هۆکانی راگەیاندنی جەماوەری) بەو شێوەیەی گەڵاڵە کرابوو، چونکە ئەو راگەیەنراوە رێگەی دەدا بەدەستبەسەراگرتنو کۆنترۆڵکردنی حکومەتەکان بەسەر پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا. چارەی مامناوەندی بۆ ئەو کێشەیە کە هەردوولا رێکەوتن لەسەری، دامەزراندنی لیژنەیەك بوو بە ناوی (لیژنەی نێودەوڵەتی بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەکانی پەیوەندیکردنەوە)، یاخود لیژنەی

ماکبراید وەك دواتر بەو ناوەوە ناسرا. لیژنەکە چاوێکی گێڕا بەو کێشانەدا لەسەر ئاستی جیهانو بەیاننامەیەکی وردو گشتگیری دەرکرد لەو بارەیەوە. لە ئەنجامدا بۆی دەرکەوت کە کێشەی بڵاوکردنەوەی هەواڵ یەکێکە لە کێشە سەرەکییەکانو بە مەسەلەیەکی گرنگو مەترسیداری دانا چ لەناو دەوڵەتەکاندا یا لە نێوان هەندێ دەوڵەتو هەندێکی تریاندا.

ئەو ناتەواوییەی کە بە ئاشکراو بە شێوەیەکی هەستپێکراو دەردەکەوت لەو گفتوگۆیانەدا لەسەر بڵاوبوونەوەی هەواڵو پەیوەندییەوە ئەو بەڵگانە بوون کە دەخرانە روو بۆ تۆمەتبارکردنی هەردوولا دەربارەی (دەستبەسەراگرتنی بواری رۆشنبیری) یا (هاوسەنگ نەبوون) یاخود (شێواندنو لایەنگیری) لە بڵاوکردنەوەی هەواڵەکاندا. لە گفتوگۆکاندا برێکی زۆر زانیاریو رووداو باس کرا بۆ پشتگیریکردنی تۆمەتەکان یا رەتکردنەوەیان. دیاربوو ئەو ژمارانەی لە گفتوگۆکاندا باس دەکران بێ بناغە بوون یاخود بەدەستهێنرابوون لە ئەنجامی خوێندنەوەیەکی سەرپێیی یا بینینی هۆکانی راگەیاندنەوە.

لە سەرەتای ساڵانی حەفتاکانەوە، تا رادەیەکی زۆر، ئەو حاڵەتە کە بریتی بوو لە کەمیو ناتەواویی زانیاریی تایبەت، گۆڕاو بوو بە کێشەی بڵاوبوونەوەی هەواڵ. ئێستا چەند باسێکی چڕوپڕ لە ئارادایە دەربارەی ئەو کێشانەو ئەنجامی ئەو باسو لێکۆڵینەوانە دەبن بە بناغەیەکی پتەو بۆ گفتوگۆکردن لەسەر ئەو مەسەلەیە.

نیگەرانییەکانی جیهانی سێهەم سەبارەت بە بڵاوبوونەوەی هەواڵ تەواو گونجاو بوو بۆ لێکدانەوەو شیکردنەوەی ئەزموونی لە رێگەی بەکارهێنانی شێوازەکانی شیکردنەوەی ناوەرۆکەوە. لە ناوەڕاستی حەفتاکانیشدا دەست کرا بە گەلێك لێکۆڵینەوەی بەنرخو گەورە، ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوانە کە لێرەدا دەیانخەینە روو، شێوەیەکی بڵاوکردنەوەی هەواڵمان بۆ روون دەکاتەوە کە زۆر ئاڵۆزترو جیاوازە لەوەی کە رەخنەگران دایان نابوو. لێکۆڵینەوەکان ئەو لایەنی ناتەواوییانەمان بۆ روون دەکەنەوە کە هەن لە شێوازی شیکردنەوەی چەندایەتیدا لە کاتی تاووتوێکردنی بڵاوبوونەوەی هەواڵی نێودەوڵەتیدا، چونکە پێویستیی هەیە بۆ گرنگیدانێکی زیاتر بە ناوەرۆکی رووداوو هەواڵەکان لە کاتی هەڵسەنگاندنیاندا لە باری چۆنیەتییەوە. لێکۆڵینەوەکانی کۆتایی حەفتاکانو سەرەتای هەشتاکان، ئەم بابەتەیان روون



کردووەتەوە، ئەوەش پاش لە بەرچاوگرتنی ئەو مەسەلانەی کە رەخنەگرانی جیهانی سێهەم وروژاندبوویان.

رەنگە سەدان لێکۆڵینەوە هەبن لەسەر بڵاوبوونەوەی هەواڵی نێودەوڵەتی. زۆربەی ئەم لێکۆڵینەوانەش سنووردارنو لە بنەڕەتدا مەبەست لێیان ئەوە نەبووە ئەو بابەتانە بخرێنە ژێر تاقیکردنەوەوە کە خراونەتە روو دەربارەی سیستمی راگەیاندنو پەیوەندیی جیهانیی نوێوە کە یونسکۆ دایناوە. هەروەها چەند لێکۆڵینەوەیەکی تر هەن لەسەر بڵاوکردنەوەی هەواڵ لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر یا لە چەند وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تایبەت، ئەوانەش گرنگیی تایبەتیی خۆیان هەیە.

## سیستمی راگەیاندنی نێودەوڵەتی

لە کۆنگرەی نێودەوڵەتی بۆ لێکۆڵینەوەو باسەکانی پەیوەندییو راگەیاندنی جەماوەرییەوە کە لە ساڵی (١٩٨٤)دا لە براگ بەسترا، (حامد مولانا) لەمیانەی باسەکاندا ئەوەی دووپات کردەوە کە (بەهۆی ئەوەوە روو کراوەتە گرنگیدان بە ژمارەیەکی کەم لە فاکتەرەکانو بەهۆی کەمیو دەگمەنیی توێژینەوەی رێکوپێك ئەو زانیارییەی ئێستا هەیە لەسەر بڵاوبوونەوەی هەواڵی نێودەوڵەتی بەگوێرەی پێویست نییە). بەڵام ئەوەش بەرچاو دەکەوێ کە (ئێمە ئەمڕۆ لە بارودۆخێکی زۆر باشتردایـن لەچاو بارودۆخی دە ساڵ پێش ئێستا بە جۆرێك توانای ئەوەمان لا پەیدا بووە کە نەخشەیەکی تا رادەیەك نزیکی پەیکەری بڵاوبوونەوەی هەواڵی نێودەوڵەتی بکێشین).

حامد مولانا، کە هاتە سەر باسی مەسەلەی بڵاوبوونەوەی زانیاری لە جیهاندا، گوتی: باسو گفتوگۆکان ئەوەیان روون کردەوە زۆرکات رەوتێکی وا گیراوەتە بەر کە بڵاوبوونەوەی هەواڵ لە باکوورەوە بێ بۆ باشوور. هەروەها ئەوەشیان روون کردەوە کە پێویستیو دەسکورتییەکی بەرچاو هەیە، لە (ئاڵوگۆڕکردنی زانیاریو هەواڵو بەرنامەی رۆشنبیریو کارمەندانی بواری راگەیاندن لە نێوان دەوڵەتە تازەپێگەیشتووەکاندا)، باسو لێکۆڵینەوەکان هەروا روونیان کردەوە کە بەرەوپێشچوونێك هەیە لە بواری بڵاوکردنەوەی هەواڵدا لە باری چەندایەتییەوە، بەڵام ئەوەشیان دەرخست کە شێواندنی رۆشنبیریو ئایدیۆلۆژیو لایەنگری، هەروا ماوەتەوە لە ماوەی ساڵانی رابوردوودا.. .

یەکێکی تر لەو خاڵانەی کە باس کران لەو لێکۆڵینەوانەی تایبەتن بە بڵاوبوونەوەی هەواڵ ئەوەبوو کە (پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا، مەرج نییە بووبێتە هۆی زیادبوونی زانیاریی هەموو میللەتان چ لەسەر ئاستی ناوخۆ یا دەرەوە، لەگەڵ بوونی ناهاوسەنگییەك لەو باسانەدا کە تایبەت بوون بە بڵاوکردنەوەی هەواڵەوە ئەمەش لەبەر کەمیەتیی ژمارەی لێکۆڵەرەوانی باشوور لە کۆنگرەکەدا).

ئەم خستنەڕووو باسکردنەی خوارەوە لە بناغەدا پشتی بەستووە بە سێ هەوڵی سەرەکییەوە کە لە کۆتایی حەفتاکانی ئەم سەدەیەدا دراونو بریتین لە: لێکۆڵینەوەی تایبەت بە بڵاوبوونەوەی هەواڵ لە وڵاتانی دەریای باسیفیك، کە نووسەری ئەم بابەتەو (تۆمی نامیکا) لە نیجیریا بەشدارییان کردووە لە بەڕێوەبردنو سەرپەرشتیکردنیدا. دووهەم لێکۆڵینەوەی بڵاوبوونەوەی هەواڵ لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا کە (ویلبر سکرام)و (ل. ئیرفین ئاتود) بەڕێوەیان دەبرد، سێهەم: ئەو لێکۆڵینەوە گەورەیەی یەکیەتیی نێودەوڵەتی بۆ باسو توێژینەوەکانی پەیوەندییە جەماوەرییەکانو یونسکۆ کە گەلێك لە لێکۆڵەرەوەکان لە هەموو لایەکی جیهانەوە بەشدارییان تێیدا کردو (جیمس هالوران)ی نوێنەری ئەو یەکیەتییە بەڕێوەی دەبرد. ئەم لێکۆڵینەوانە ناوچەیەکی جوگرافیی بەربڵاویان لەخۆ گرتبوو کە چەند دەوڵەتێکی زۆری تێدایەو هەموو لەسەر مەسەلەکانی سیستمی راگەیاندنی نێودەوڵەتیی نوێ بوون.

ئەو بەشەی لێکۆڵینەوەکان کە تایبەت بوون بە دەوڵەتانی دەریای باسیفیك، زیاتر لە سی دەوڵەتو رۆژنامەیان لەخۆ گرتبوو. لێکۆڵینەوەکە بۆ ماوەی یەك هەفتە لە کۆتایی ساڵی (١٩٧٦)دا، تەرخان کرابوو بۆ باسی ناوەرۆکی هەواڵ لەو رۆژنامانەدا کە نوێنەرایتیی دورگەکانی باسیفیكو ئاسیاو ئەمریکای باکووریان دەکرد. هەروەها لێکۆڵینەوەکان چوار حاڵەتیان خستە ژێر تاقیکردنەوەوە، کە وەرگیرابوون لە کتێبەکەی (یوهان جالتونج)و، ئەنجامەکە پشتیگیریی هەر چوار حاڵەتەکەی کردو هەروەها ئەوەیان بۆ دەرکەوت کە شێوازێکی کلاسیکیو کۆنی بڵاوکردنەوەی هەواڵ هەیە کە پێکهاتەیەکی ئیمپریالیزمییان هەیە.

* بڵاوکردنەوەیەکی یەکلایەنەی هەواڵ هەیە لە دەوڵەتە جەمسەرەکانەوە وەك بەریتانیا، ئوستralیا، نیوزیلاند، فەرەنسا، ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ دەوڵەتەکانی دورگەی باسیفیك.



* لەباری ژمارەوە هەواڵی دەوڵەتە ناوەندییەکان زۆرترن لە رۆژنامەکانی لەو دەوڵەتانەدا کە دوورن لێیانەوە.
* هەواڵو دەنگوباسی دەوڵەتانی باسیفیك لە رۆژنامەکانی دەوڵەتە گەورەکاندا، یا هەر نییە، یا ئەگەر هەبێ بڕێکی کەمە.
* لە نێوان خودی دەوڵەتانی باسیفیکدا بڵاوکردنەوەی هەواڵ زۆر کەمو لاوازە.
* بە رادەیەکی کەمتر بڵاوکردنەوەی هەواڵ هەیە لە نێوان دەوڵەتەکانی باسیفیکدا، کە سەر بە گرووپی ئیمپریالیزمیی جیاوازن، وەك ئەو ناوچانەی سەر بە ئەمریکا یا بەریتانیا یا فەرەنسان.

لەگەڵ ئەمەشدا چەند بەڵگەو نیشانەیەك هەن ئاماژە بەوە دەکەن ئەو شێوازە کۆنەی هەواڵ کە پێکهاتەیەکی ئیمپریالیزمییان هەبوو بەرەو نەمان دەچن، ئەمەش بەهۆی پەیدابوونو بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیای مانگی دەسکردو بەهۆی ئاڵوگۆڕکردنی هەواڵ لە رێگەی ئەو مانگانەوە. هەروەها بەڵگەو دیاردەی ئەوە هەیە کە گرنگیدان بە هەواڵ لە دەوڵەتانی دەریای باسیفیکدا، گۆڕانی بەسەردا هاتووە پاش سەربەخۆبوونیانو ئێستا هەرکام لەو دەوڵەتانە، شوێنێکی جیاوازیان بۆ خۆیان پەیدا کردووە لە شێوازەکانی بڵاوکردنەوەی هەواڵدا. بۆ نموونە دەوڵەتێکی وەك (ساموای رۆژاوا)، کە لە ساڵی (١٩٦٢)دا سەربەخۆیی وەرگرت، دەستی کردووە بە پەیوەندیکردنێکی رۆژ لە دوای رۆژ زیاترەوە لەگەڵ دەوڵەتەکانی تری جیهانی سێهەمدا، کەچی دەوڵەتێکی وەك (فیجی) کە لە ساڵی (١٩٧٠)دا سەربەخۆیی وەرگرتووە، یاخود (بابوا کینیای نوێ)، پاش سەربەخۆبوونیان زیاتر گرنگییان دا بە دەوڵەتە ناوەندییە گەورەکان.

هەروەها ئەو لێکۆڵینەوەیە واتاو مانای (هەواڵە سەرچاوە شاراوەو نەزانراوەکان)ی روون کردەوە کە لە لێکۆڵینەوەکانی تریشدا باسی لێوەدەکرێ، بەو مانایەی کە سەرچاوەی هەواڵ لە رۆژنامەکانی وڵاتانی تازەپێگەیشتوودا زۆرجار بەلای خوێنەرانەوە نەزانراون — لەم لێکۆڵینەوەیەدا، ئەوە بووە سەرچاوەی گەورەو تەنیا بۆ هەواڵە نێودەوڵەتییەکان — .

لێکۆڵینەوەکەی سکرامو ئاتود، کە بە ناوی (ئاڵوگۆڕکردنی هەواڵ لە جیهانی سێهەمدا — لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی ئاسیا)و، نۆزدە رۆژنامەی رۆژانەی گەورە لە رۆژنامەکانی ئاسیاو چوار ئاژانسەکانی هەواڵی رۆژاوای لەخۆ گرتبوو، ئەوە چەندەها رووداوی هەواڵی سەرەکیی

خستبووە بەر باسو لێکۆڵینەوە بە جۆرێك کە پێشتر شتی وا نەکرابوو، تەنانەت سەرژمێریو ڕووپێوییەکی خوێنەرانی ڕۆژنامەکانی ئەنجام دابوو. ئەنجامەکەشی وێنەیەکی گشتگیریی بڵاوبوونەوەی هەواڵ لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیاو بڵاوبوونەوەی هەواڵ لە نێوان دەوڵەتەکانی جیهانی سێهەمدا خستبووە ڕوو. ئەو دوو لێکۆڵەرەوە بۆیان دەرکەوت کە دەوڵەت لە جیهانی سێهەمدا، بڕێکی زۆرتر هەواڵی دەست دەکەوێ دەربارەی دەوڵەتانی تری جیهانی سێهەم لەباری چەندایەتییەوە، ئەو دوو لێکۆڵەرەوەیە ئەوەشیان بۆ دەرکەوتبوو کە ئەمە مانای ئەوە نییە بڵاوبوونەوەی هەواڵ لەباری چۆنیەتییەوە بەگوێرەی پێویست بووبێ، ئاماژەشیان بەوە کرد کە ئەم بابەتە زیاتر دەکەوێتە بەرباسکردن.

هەروەها ئەو لێکۆڵینەوەیە واتاو مانای (شێوەکانی هەواڵە ناوچەییەکان)ی ڕوون کردووەتەوەو هەندێ زانیاریی خستووەتە بەردەستو ئەوە دەردەخەن کە زۆربەی ئەو هەواڵە جیهانییانەی لە وڵاتێکی دیاریکراودا بڵاو دەکرێنەوە پەیوەندییان هەیە بە وڵاتانی دراوسێوە، بۆ نموونە هەواڵەکانی جیهانی سێهەم لە ڕۆژنامەکانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا پەیوەندییان هەبوو بە خودی وڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیاوە. جگە لەوەش ئەو لێکۆڵینەوانەی دواتر ئەنجام دراون ئەو واتاو مانایەیان دووبارە کردووەتەوە، ئەو مانایەش وەك یەکێك لە مانا گەورەکانی بڵاوبوونەوەی هەواڵی نێودەوڵەتی پەسەند کراوە. نووسەری ئەم بابەتە، لەگەڵ (نامیکا)دا لەو لێکۆڵینەوەیەدا کە ئەنجامیان داوە، گەیشتوون بە واتاو مانایەکی تایبەت بە (ناوچەیەتیی ڕاگەیاندن) کە لە بنەڕەتدا پشت دەبەستێ بە بڵاوبوونەوەی هەواڵی هەرێمایەتیو جوگرافییەوە.

سەبارەت بە پرۆژەی (جیهانی هەواڵ)، یەکیەتیی نێودەوڵەتی بۆ باسکردنو لێکۆڵینەوە لەسەر پەیوەندیو ڕاگەیاندنی جەماوەری لەسەر داوای ڕێکخراوی یونسکۆ جێبەجێی کرد. ئەو یەکیەتییە سیانزە گروپی لێکۆڵینەوەی ئامادە کردووە لە هەموو لایەکی جیهانەوە بۆ لێکۆڵینەوە لە سیستمەکانی هۆکانی ڕاگەیاندنی نێودەوڵەتیو بەوە ئەو سیستمانە ژمارەیان گەیشتووەتە بیستو نۆ سیستم لە هەموو ناوچەیەکی جیهاندا، ئەو لێکۆڵینەوەیە ڕۆژنامەو ڕادیۆکانیشی گرتووەتەوە. ئەو زانیارییانەش کۆ دەکرانەوە بۆ تاووتوێکردنی هەفتەیەکی (کرۆنۆلۆجی) لە ساڵی (١٩٧٩)دا. ئەو ئەنجامانەش کە لێرەدا پوخت کراونەتەوە لە نووسینێکی (ئەنابیل سری برنی محمدی) وەرگیراوە کە لە زستانی ساڵی (١٩٨٤)دا لە



ڕۆژنامەی (جورنال ئۆف کۆمیونیکەیشن) بڵاو کرایەوەو لە چەند ڕاپۆرتێکی ئەمریکی کە لە کتێبی (هەواڵەکانی دەرەوەو سیستمی ڕاگەیاندنی نێودەوڵەتیی نوێ)دا باسیان کراوەو ڕۆبرت ل. ستیفنسونو دوناڵد لویس شو نووسیویانە.

مەبەست لە ئەنجامدانی ئەو لێکۆڵینەوەیەش، وەڵامدانەوەی هەندێ پرسیار بوو، کە ورووژێنران لەو گفتوگۆیانەدا کە تایبەت بوون بە سیستمی ڕاگەیاندنی نێودەوڵەتی نوێوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو لێکۆڵینەوەیە شیکردنەوەیەکی تا ڕادەیەك سادەی پێوە دیار بوو، بەڵام بوو بە لێکۆڵینەوەیەکی ئاڵۆز، چونکە بیستو نۆ سیستمی ڕاگەیاندنی لەخۆ گرتبوو.

## ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە

یەکێك لە ئەنجامە گرنگەکانی ئەو لێکۆڵینەوەیە ئەوە بوو کە لەگەڵ ئەوەدا کە وڵاتەکان لە پلەی جیاوازدا بوون لە ڕووی گۆڕانو پێشکەوتنەوەو، لەگەڵ ئەوەدا کە بیروبۆچوونە سیاسیەکان جیاواز بوون (بە شێوەیەکی گشتی ئەو گرنگیدانەی کە دەدرا بە جۆرە هەواڵو ڕووداوی دیاریکراو) لە هەموو وڵاتەکاندا بە ڕادەیەکی بەرچاو چونیەك بوون. هەروەها لێکۆڵینەوەکە ئەوەشی بۆ دەرکەوت کە سیاسەت، ئیتر جیهانی بێ یا ناوخۆیی، لە هەموو شوێنێکدا دەستی گرتووە بەسەر جۆری بڵاوکردنەوەی هەواڵە جیهانییەکاندا. هەروەها لێکۆڵینەوەکە — وەك لێکۆڵینەوەکانی پێشتر — ئەوەی دەرخست کە پێداگرتنو سووربوونێك هەیە لەسەر ڕەگەزی ناوچەو هەرێمایەتی لە باسکردنی هەواڵە جیهانییەکاندا. هەروەها ڕادەیەکی بەرزی ئەو حاڵەتانە هەبوو کە ئاماژە نەدەکرا بۆ سەرچاوەکانی هەواڵ بە جۆرێك کە زەحمەت بوو بتوانرێ کاریگەریی ئاژانسەکانی هەواڵی ڕۆژاوایی هەڵسەنگێنرێ بە شێوەیەکی ورد.

لە کاتێکدا کە ئەو هەواڵانەی تایبەتن بە ناوچەو هەرێمەکەوە بە ژمارە زۆرترن، کەچی ئەو هەواڵانەی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانو ئەورووپای ڕۆژاواوە دێن لە پلەی دووهەمدان لەباری گرنگیی هەواڵەوە. (ستیفنسون) لە نووسینێکی تریدا باسی ئەوەی کردووە کە لێکۆڵینەوەکە ئەوەی بۆ ساغ نەبووەتەوە هۆکانی ڕاگەیاندنو ئاژانسەکانی هەواڵی ڕۆژاوایی جیهانی سێهەمیان خستبێتە پشتگوێ، یاخود ئەو ئاژانسانەی هەواڵ لە بڵاوکردنەوەی هەواڵەکاندا، هەواڵی پەیوەندیدار بە جیهانی سێهەمەوە بە شێوەیەکی خراپو بێویژدانانە بەسەرکردبێتەوە.

هەروەها ستیفنسون ئاماژەشی بەوە داوە کە هۆکانی راگەیاندنی رۆژاوا، جیهانی سێهەمیان پشتگوێ نەخستووە، چونکە سێیەکی هەواڵەکان لە سیستمی هۆکانی رۆژاوادا پەیوەندییان هەیە بە دەوڵەتانی جیهانی سێهەمەوە، هەروەها زیاتر لە دوو لەسەر سێی هەواڵەکان لە سیستمی رۆژنامەوانیی جیهانی سێهەم پەیوەندییان بە دەوڵەتانی جیهانی سێهەمەوە هەیە.

دەربارەی ئەوەیش کە هەواڵی خراپو نارەوا بڵاو دەکرێنەوە ستیفنسون سەرنجی ئەوەی داوە کە هەواڵی لەو جۆرە بەشێکی کەم پێکدێنێ لەو هەواڵانەدا کە بڵاو دەکرێنەوەو زۆربەی هەواڵەکان پەیوەندییان هەیە بە کاروباری سیاسییەوە. سەبارەت بەوەش کە هەواڵەکان لایەنگیرییان تێدایە، لێکۆڵینەوەکە ئەوەی دەرخستووە کە زۆربەی هەواڵەکان بێلایەنن واتە پشتگیری یا دژایەتی بۆ رووداوێکی تایبەت ناکەن.

هەندێك لەوانەی بەشدارییان کردبوو لەو لێکۆڵینەوەیەدا وەك (کارل نورد نسترنج)ی فەنلەندا، خۆیان کێشایەوە لە لێکۆڵینەوەکەو پرۆژەکەیان بەوە تاوانبار کرد کە (کەوتووەتە ژێر کاریگەریی پۆلبەندییە ئاساییو باوەکان)و قورساییان خستووەتە سەر چەند لایەنێکی تایبەت لە ناوەرۆکی هۆکانی راگەیاندن، زیاتر لەو قورساییو گرنگیدانەی کە دەبوا بدرایە بە وێناکردنێکی گشتگیریی ناوەرۆکەکە. هەندێکی تریان داوای ئەوەیان دەکرد کە گرنگیی زیاتر بدرێ بە لایەنی چۆنیەتیو جۆری هەواڵ لە لێکۆڵینەوەکانی دواتردا.

ستیفنسونو شۆ، لەو کتێبەیاندا کە لە پێشەوە باس کرا ئەوەیان بۆ دەرکەوتووە کە زۆربەی ئەو بابەتانەی خراونەتە روو لەو گفتوگۆیانەدا کە تایبەتن بە راگەیاندنی نێودەوڵەتییەوە پەیوەندییان نییە بە کێشەو گیروگرفتەکانی رۆژنامەوانیی جیهانی سێهەمەوە بە ئەندازەی ئەوەی پەیوەندییان هەیە بەو کێشانەوە کە کارگوزارانی ئەو بوارە پێویستیان پێیەتی کە لای لێبکەنەوە. لە ناو ئەو کێشانەدا بۆ نمونە، هەموو هۆکانی راگەیاندن مانای هەواڵ بە شێوەیەکی بەرتەسكو دیاریکراو لێکدەدەنەوە، هەروەها هەموو رۆژنامەنووسەکان، قسەو هەواڵەکان بڵاو دەکەنەوە لە بازنەیەکی تەسکی ئەو کەسانەی کە پەیوەندییان هەیە بە هەواڵەکانەوەو دروستیان دەکەن. هەروەها هەموو سەرنووسەرانی رۆژنامەکان، بە تەواوی گرنگی دەدەن بەو هەواڵو رووداوانەی کە لە ناوچەو شوێنە گەرموگوڕەکانی جیهاندا روو دەدەن.



## کێشەو گیروگرفتەکانی بڵاوکردنەوەو راگەیاندن

ئاشکرایە کە جگە لەو کێشانەی باس کران، کێشەو گرفتی تایبەتیی زۆر هەن رووبەرووی رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم دەبنەوە کاتێك هەوڵی ئەوە دەدەن هەواڵە نێودەوڵەتییەکان یا هەر جۆرە هەواڵێکی تر پێشکەش دەکەن بە خوێنەرو گوێگرو بینەر لە وڵاتەکەیاندا. چەند نووسەرێك لەم بوارەدا لە وێنەی (لوید سومرلاد) بە دووروودرێژی باسی ئەم کێشانەیان کردووە، زۆر لەو کێشانەش دەگەڕێتەوە کە رێکخراوی یونسکۆو رێکخراوەکانی تر گرنگییان پێداوە، ئەم کێشانە چەند مەسەلەیەك دەگرنەوە وەك راهێنانی رۆژنامەنووسانو خەرجی ناردنو وەرگرتنی راپۆرتە هەواڵەکان، رێگرتنی دەوڵەتو کۆسپدانانی، ئەو بنەمایانەی دابەشکردنی رۆژنامەکان پشتی پێدەبەستن، باسکردنێکی سنوورداری ئەو خزمەتانەی بواری پەخشکردن ئەنجامی دەدەن، پلەو رادەی نزمیی کرێو مووچەو باری کۆمەڵایەتی، رادەی نزمیی خوێنەواری، وەرگێڕان لە زمانی فەرەنسیو ئینگلیزییەوە بۆ زمانە ناوچەییەکان، لەگەڵ چەند کێشەو گرفتێکی تردا کە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر جیاوازییان هەیە، لە راستیدا ئەم کێشانە کەم نین.

رێکخراوی یونسکۆو دەستەی بەرپرسیارانی راگەیاندنی حکومەتیو ئەو دەستانەی پەیوەندییان بەو پیشەیەوە هەیەو پەیمانگا نێودەوڵەتییەکانی راهێنان، چەندە هەوڵ بدەن، ناتوانن ئەو کێشانە لەناو بەرن لە شەوو رۆژێکدا، بەڵکو رەنگە لە ماوەی دەیان ساڵدا ئەو کێشانە لەناو نەچن.

لە جیهانی سێهەمدا چەند کۆسپێکی زۆر هەن کە دەبنە رێگر لە بەردەم بڵاوبوونەوەیەکی تەواوی هەواڵی جیهانیدا. لەگەڵ ئەوەشدا لە ماوەی دە ساڵی رابوردوودا گۆڕانکارییەکی وا رووی داوە کە نیشانەی گەشبینیی پێوە دیارە، بۆ نمونە راهێنانی رۆژنامەنووسان لە جیهانی سێهەمدا لە زۆر لاوە بەرەو پێشەوە دەڕوا، ئەم راهێنانە یەکێکە لەو بوارانەی کەمتر گرنگی بە جیاوازیی ئایدیۆلۆژیی دەدات. ئەمەش مانای ئەوەیە، ئەوانەی کە رۆژنامەنووسییان کردووە بە پیشەی خۆیان لە رۆژاواو جیهانی سێهەمدا، رەنگە ببن بە خاوەنی هۆیەك بتوانن لە رێگەیەوە سەربکەون بەسەر ئەو کێشەو گرفتانەدا کە پەیوەندییان هەیە بە راهێنانی نووسەرانو رۆژنامەنووسانو دەرهێنەرانی هەواڵو گروپی وێنەگرانو هیترەوە.

گۆڕانێکی تریش هاتووەتە ئاراوە کە بە کردەوە دەبێتە هۆی باشبوونی بڵاوبوونەوەی هەواڵ، ئەویش پەیوەندیکردنە لە ڕێگەی مانگەدەستکردەکانەوە (بەلای کەمەوە لە بواری بڵاوکردنەوەی هونەرییەوە لە نێوان دەوڵەتە جیاوازەکانی جیهاندا). هەروەها هەندێ پێشکەوتنی تر هەن کە ئەوانیش چاوەڕێی شتی باشیان لێدەکرێ، بۆ نموونە پەیدابوونی توانای پەیوەندی لە نێوان دەوڵەتانی باشووردا، یەکێك لەو کۆسپە گەورانەی خستووتە لاوە کە زۆرجار هاتووەتە ڕێی سیستمی ڕاگەیاندن، ئەویش بریتییە لە بڵاوکردنەوەی هەواڵەکانی جیهان لە ڕێگەی ئاژانسەکانی هەواڵی ڕۆژئاواییەوە.

هەروەها ئەو پێشکەوتنەی ئاژانسەکانی هەواڵی نیشتمانی بەخۆیەوە دیویەو ئەو پەیماننامەو ڕێکەوتنانەی تایبەتن بە ئاڵوگۆڕکردنی هەواڵو ڕاگەیاندنەوە، نیشاندەری فاکتەرێکی باشی ترن لە بواری باشکردنی بڵاوبوونەوەی هەواڵ لە دەوڵەتەکانی جیهانی سێهەمدا. لەم ساڵانەی دواییشدا، ئاژانسەکانی دەنگوباسی ڕۆژئاوا بەشدارییەکی گەورەیان کردووە لەم گۆڕانو پێشکەوتنانەدا، چونکە درکیان بەوە کردووە کە لە توانادا نییە بە شێوەیەکی تەواو باسیان لێوەبکرێ ئەگەر تەنیا پشت بە خۆیان ببەستن.

داننان بە ناوچەگەری لە بڵاوکردنەوەی هەواڵدا، وەك لە لێکۆڵینەوەکەدا هاتووە، ئاماژە بە بوارێك دەدا کە ئەگەری ئەوە هەیە تیایدا هەوڵێکی تایبەت بدرێ بۆ چاککردنێکی بەرچاو لە جۆری ئەو هەواڵانەدا، کە سەرنووسەرانو دەرهێنەرانی هەواڵی جیهانی سێهەم دەستیان پێڕادەگات. بۆ نموونە لەم دە ساڵەی دواییدا چەند ئاژانسێکی هەواڵی بەهێز دروست کراون کە جێگرەوەیەکی باشو نوێن بۆ دەوڵەتانی جیهانی سێهەم تا هەواڵی نێودەوڵەتیی وایان دەسکەوێ کە زیاتر گونجاو بن لەگەڵ پێویستییەکاندا.

یەکێك لەو گۆڕانانەی هاتە کایەوە لە ئەنجامی کێشەی بڵاوبوونەوەی هەواڵ لە ساڵانی حەفتادا — هەرچەند هێشتا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ تەواو نەبووە — دروستکردنی ئاژانسێکی خزمەتگوزاریی هەواڵی جێگر یا تەواوکەر کە بریتین لە کۆمەڵێك شارەزاو تایبەتمەند لە بواری هەواڵدا کە سەر بە بزوتنەوەی بێلایەنن. ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە لەم ماوەی دواییەدا گرنگییەکی باشیان داوە بە چاککردنی کارەکان کە پێشتر زۆر ڕەخنەیان



لێدەگیرا، هەروەها دەستەی ڕۆژنامەنووسانی نێودەوڵەتیو ئاژانسی دەنگوباسی جیهانی سێهەم جێگرەوەیەکی گرنگ پێشکەش دەکەن.

هۆیەکی تر کە لەو لێکۆڵینەوە تایبەتانەدا باس کراوە، بریتییە لەو گۆڕانەی هاتووە بەسەر شێوازی بەسەرکردنەوەی هەواڵدا لەلایەن ئاژانسەکانی هەواڵی ڕۆژئاواییەکانەوە دەربارەی ئەو ڕووداوانەی پەیوەندییان هەیە بە دەوڵەتانی جیهانی سێهەمەوە. وەك لێکۆڵینەوەکان ڕوونیان کردووەتەوە، وا دەردەکەوێ بڕێکی زۆرتر لە هەواڵەکانی جیهانی سێهەم بڵاو دەکرێتەوە لە ڕێگەی ئاژانسەکانی دەنگوباسەوە کە ئاراستەی دەوڵەتانی جیهانی سێو هۆکانی ڕاگەیاندنی ڕۆژئاواییەکان دەکرێت.

لە ڕاستیدا ئەو کۆسپو تەگەرانەی دەبنە ڕێگر لە ڕێی بڵاوبوونەوەی هەواڵەکانی جیهانی سێهەم هێشتا زۆرنو کاتو هەوڵو کۆششو بودجەی زۆریان دەوێ بۆ چارکردنو سەرکەوتن بەسەریاندا، لەگەڵ ئەوەشدا کێشەو گرفتە تایبەتەکان ئێستا ئاشکراترن لە دە ساڵ پێش ئێستاو دەکرێ هەوڵە ناوخۆییو دەوڵەتییەکان ئاراستەی کێشە سەرەکییەکان بکرێت وەك ڕاهێنانو کەرەستەو دامەزراندنی ئاژانسی هەواڵی ناوچەییو ئاڵوگۆڕکردنی هەواڵەکان.

# بەشی پێنجەم

## رۆژنامەی بواری شۆڕشگێڕیو رۆژنامەی بواری گەشەکردن

نووسینی: أ. ل. هستر

رەنگە لەنێو ئەو ئەنجامانەی کە لە هەوڵی رزگارکردنی وڵاتێك لە وڵاتەکان دەکەوێتەوە، ئەو ئەنجامە بێت کە دوو جۆر لە شێوازی رۆژنامەگەری دەردەکەون، کە ناونیشانی بەشەکە لە خۆی گرتوونو بریتین لە رۆژنامەی شۆڕشگێڕیو رۆژنامەی گەشەکردن. رۆژنامە شۆڕشگێڕەکان بە تەواویو بە سادەیی خۆیان تەرخان دەکەن بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو هێزانەی کە خەڵکی کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو حەز ناکەن فەرمانڕەواییان بکەنو هەوڵی ئەوە دەدەن کە لەسەر کار لایان بەرن. رۆژنامەی بواری گەشەکردن، ئەنجامێکی سروشتییە بۆ رۆژنامە شۆڕشگێڕەکان، چونکە هەوڵ دەدەن بۆ دروستکردنی میللەتێکی نوێو گەشەپێدانیو بۆ ئەوەی ئەو دروشمانە جێبەجێ بکات کە لە قۆناغی شۆڕشدا بانگەشەی بۆ کراوە.

ئەم دوو جۆرە رۆژنامەیە دەبنە سەرچاوەی مەترسی بۆ ئەوانەی لایەنگیریی بارودۆخی کۆن دەکەنو پارێزگاریی لێدەکەن. لە هەندێ کاتیشدا، ورووژاندنی سۆزو هەستی خەڵكو دوورکەوتنەوە لە هەڵوێستی بابەتییانەو راستگۆیی دەکەن بە کاری خۆیان، نەك هەر ئەوە، بەڵکو حەز لە مشتومڕی توندو دوژمنکاری دەکەن. هەندێ جاریش ئەو رەوشتە ناشیرینە مەترسیدارەیان بۆ دەمێنێتەوە کە بریتییە لە یارمەتیدانو بەهێزکردنی مەبەستو ئامانجی هەندێ لە سەرکردەو تایفەکان کە خۆپەرستن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جۆرەکانی تری رۆژنامەکانیش بە ئەندازەی ئەمان تووشی لە رێ لادان دەبنو خۆیان تەرخان دەکەن بۆ خزمەتکردنی کەسانێك کە خۆیان بە خوا دادەنێن، ئەمەش چونکە هەر جۆرێك بگریت لە جۆرەکانی رۆژنامە، ئەگەر هەست نەکەن بە بەرپرسیاریەتیی کۆمەڵایەتی، رێی تێدەچێ کە ببن



بە ئامێرێك بۆ زیانگەیاندن بە خەڵك. بۆ نموونە، ئەوانەی رەخنە لە سیستمی رۆژنامە بازرگانییەکانی ئەمریکا دەگرن، سەریان سوڕ دەمێنێ لەوەی کە چۆن خاوەنی ئەو رۆژنامانە بە رەوای دەزانن گیرفانیان زیاتر پڕ بکەن لە پارە لە رێی بڵاوکردنەوەی ریکلامو ئاگاداری بۆ ئەو بەرهەمانەی هیچ گومان نییە لەوەدا کە دەبنە هۆی تێکدانی تەندروستیی ملیۆنەها کەس، وەك بەرهەمی کارگەکانی جگەرەو تووتن. ئەوەندە هەیە رێگەدان یا نەدان بەو ریکلامو پڕوپاگەندانەی بڵاو دەکرێنەوە بۆ ئەو جۆرە بەرهەمە زیانبەخشانە جێبەجێ ناکرێ مەگەر لە رێی چاودێرییەکی توندەوە نەبێت لەلایەن حکومەتی فیدراڵییەوە.

### فێربوون لە رێگەی هەڵەکردنەوە

شتێکی زۆر گرانە لەسەر باوکان، منداڵەکان واز لێبێنن لە ماوەی گەشەکردنو پێگەیشتنیاندا باڵەکانیان تاقی بکەنەوە بۆ ئەوەی فێری باڵ گرتنەوەو فڕین بن، یاخود بەو جۆرە بژین کە خۆیان حەزی لێدەکەن، یا تەنانەت کاری هەڵە بکەن بۆ ئەوەی فێر بن بەهۆی هەڵەکردنەکەوە، هەر بەو جۆرە زەحمەتە بۆ ئەوانەی تا دوێنێ دەسەڵاتیان بەدەستەوە بووە، وەك حکومەتە ئیمپریالییەکان، واز لە (منالەکانی) پێشووی خۆیان بێننو رێگەیان بۆ بەرەڵا بکەن کە بە ئارەزووی خۆیان چارەنووسی خۆیان دیاری بکەن.

ئاشکرایە ئەوانەی خراونەتە ژێر چاودێریو پارێزگارییەوە، ئەوانەی نە ئەزموونیان هەیەو نە سەریان لە بەڕێوەبردنی کاروبار دەردەچێ، چەندەها هەنگاوی هەڵەو ناتەواو دەنێنو دەکەونو خۆیان گوردەبەستنو هەڵدەسنەوە سەر پێ، بۆ ئەوەی چەند جارێك هەوڵ بدەن تا فێر دەبنو دەگەنە پلەی کامڵبوون. مێژووی جیهان تا رادەیەك وەك یەك وایە لەو رووەوە ئاماژە بەوە دەدات کە هەموو کۆمەڵگە چەسپیوەکان دەبێ بە ماوەیەکدا تێپەڕن لە ناکۆکیو تاریکیو ترسان لە کەسانی نامۆو بێگانەو چوونە ناو قەواغی خۆیانەوە، ئەمە پێش ئەوەی بتوانن بە تەواوی رۆڵی خۆیان ببینن لە بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیاندا. هەندێ لە میللەتان وەك هەندێ منداڵ وان، ناتوانن خۆیان لەو قەواغەی خۆیان رزگار بکەنو وایان لێبێت ئەوەی ئێمە دەمانەوێ دەربارەی ئەندامانی بەکەڵكو هێمن لە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا جێبەجێی بکەین بەسەریاندا، چونکە زۆربەی خێزانەکان کوڕێك (یا کچێك)یان هەیە بەکەڵکی هیچ نایەنو

هەڵسوکەوتیان شایانی ئەوەیە بەردەوام لۆمە بکرێن، یا وا دەردەکەوێ کە بە هیچ جۆرێك ناتوانن بە ڕێکوپێکی هەڵسوکەوت بکەن.

لە ڕاستیدا نرخی سەروەریی وڵات، وەك سەربەستیی تاکەکان، ئەوەیە کە هەندێ دەوڵەتان یا هەندێ لە تاکەکان ئەو ڕێگەیە هەڵبژێرن کە خۆیان بە ئارەزووی خۆیان دەیانەوێ، بەڵام ئەو ڕێگەیە ئەوە نییە کە ئێمە دەمانویست بیگرنەبەر، جێگری ئەوەش ئەوەیە کە ویستو ئارەزوویەك بسەپێنرێ بەسەریاندا کە لە ئازادیی هەڵبژاردنی شێوەی ژیانو کەسیەتی رووتیان بکاتەوە.

## رۆژنامەی شۆڕشگێڕی

زۆربەی دەوڵەتانی جیهانی سێهەم بەلای کەمەوە لە قۆناغە سەرەتاییەکاندا، چوونەتە کۆڕی تێکۆشانەوە دژی دەسەڵاتی بێگانە لە وڵاتدا، زۆرجاریش دەبوا دژی ئەو سەرکردانەش بوەستن کە بەرژەوەندیی تەواوی نیشتمانەکەیان بەهەند وەرنەدەگرت. بەڵام ئەم ململانێیە بوو بە ململانێیەکی تەواو ناوخۆیی، بە شێوەیەك ئەوەی لە دەرەوەی گۆڕەپانەکەدا بوایە بە زەحمەت دەیتوانی بابەتەکان لەیەك جوێ بکاتەوە کامیان ڕەوایەو کامیان ناڕەوا. شتێکی خۆشی بەخشە ئەگەر سەرنجی ئەوە بدەین کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە قۆناغێکی رۆژنامەی شۆڕشگێڕیدا تێپەڕیوە کە دەیان ساڵ درێژەی کێشاوە پێش بەرپابوونی جەنگی ناوخۆییو لە کاتی جەنگیشدا. لە ساڵی (١٧٧٢)دا (لیژنەکانی هەواڵو پەیام گۆڕینەوە)ی بەناوبانگ پێکهێنران بۆ ئەوەی رۆڵێکی کاریگەر ببینن لە زانیاری پەیداکردن لەسەر ئەو ڕووداوانەی ناو وڵاتە داگیرکراوەکاندا کە زۆرجاران تووشی ئاژاوەو پشێوی دەبوونو ئەو گۆڕانکارییەی دژایەتیی بەریتانیایان دەکرد، بۆ ئامادەکردنی ڕای گشتی دژی دەسەڵاتە ئیمپریالییەکان.

دەبێ دان بەوەشدا بنێین لە حاڵەتێکدا کە رۆژنامەی ئاسایی و هۆکانی ڕاگەیاندنو پەیوەندیکردن، نەتوانن پێداویستییە تایبەتییەکانی گەل بەجێبهێنن، چەند نموونەی جێگری ئەوانە پەیدا دەبن کە تایبەت بن بە هاوبەشیکردن لە ڕاگەیاندندا. ئەمە حاڵەتێکە بە ڕاستی



ڕووی داوە ئیتر لە ئەمریکای سەدەی هەژدەهەمدا بێ یا ڕوسیای سەدەی بیستەم کە بەیانو هەواڵنامە نهێنییەکان بە زۆری بڵاو دەبوونەوە.

سەرنجڕاکێشە ئەگەر کردارە شۆڕشگێڕییەکانی ئەمریکای باکوور بێنینەوە پێش چاوی خۆمان، چونکە هەست دەکەین کە باسی تێکۆشانی ئەفریقیا دەکەین لە سەدەی بیستەمدا بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی ئەگەر ئەو باسکردنەی کارەکانی (صموئیل ئادمز) بخوێنینەوە کە یەکێك بوو لە رۆژنامەنووسە دڵسۆزو نیشتمانپەروەرە ئەمریکییەکان.

(صموئیل ئادمز) کەسێکی بێوێنە بوو لە بواری ڕاگەیاندنو پڕوپاگەندەدا. ئەو لەوە گەیشتبوو کە بۆ ئەوەی لەو ململانێیەی لەگەڵ بەریتانیادا سەرکەوتن بەدەست بێنێت، دەبێ پێنج ئامانجی سەرەکی جێبەجێ بکەن، یەکەم، ڕەوایەتیو پاساویان هەبێ بۆ گرتنەبەری ڕێگەکەیان، دووهەم، دەبێ ئەو دەسکەوتانەی لە ئەنجامی سەرکەوتندا بۆیان فەراهەم دەبێ ڕاییگەیەنن، سێهەم، جەماوەر کە هێزی بەرەنگاربوونەوەی سەرەکییە، ئامادە بکەن بە چاندنی تۆوی ڕقبوونەوە لە دوژمنان لە ناخو گیانیاندا، چوارەم، هەرچی قسەی لۆژیکیو ڕەوای نەیاران هەیە بیخەنە لاوەو بەرپەرچی بدەنەوە، لە کۆتاییشدا لەسەریانە چی مەسەلەکان هەن بە تەواوی ڕوونیان بکەنەوە بۆ ئەوەی چی مەبەستو ئامانج هەن ئاشکرا بن تەنانەت بۆ کرێکارێکی ئاساییش. (صموئیل ئادمز) توانای ئەوەی هەبوو هەموو ئەم کارانە ئەنجام بدات، هۆو ئامرازی سەرەکیش کە بە دەستییەوە بوو بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارانە رۆژنامەی (المستعمرة) بوو.

ئامانجی رۆژنامە شۆڕشگێڕەکان لە سەردەمی (صموئیل ئادمز)دا هەمان ئەو ئامانجانە بوون کە پاش ئەو هەوڵیان بۆ دەدرا بۆ نەهێشتنو لەناوبردنی دەسەڵاتی بێگانە، لە ئەفریقیادا بۆ نموونە دەتوانین ڕەوتێکی رۆژنامەنووسیی تەواو لەیەکچوو بەدی بکەین لە نووسینەکانی کینیاتاو نیکروماو کاوەنداو چەند کەسانی تر، لە کاتێکدا هەوڵیان دەدا بۆ ڕێکخستنی بەربەرەکانیو دژوەستانەوەی دەسەڵاتی بێگانەو دروستکردنی حیزبەکان بۆ سەربەخۆیی وڵاتو نیشتمان. وەك (ویلیام هاشتین)ی مامۆستای رۆژنامەوانی لە ئەمریکای باکوور دەڵێت، رۆژنامە شۆڕشگێڕەکان هەست بە هیچ جۆرە پابەندییەك ناکەن بەرامبەر بەو حکومەتانەی هەوڵ دەدەن بیانڕووخێنن.

دەبێ ئەوەش بگوترێ، ئەوەی پێی دەگوترێ مەسەلەی (ویژدانو بابەتییانە) لەم ململانێ بێ ئەنجامەدا، هیچ دیار نییە، ئەو مێژوونووسە بێهودە خۆی ماندوو دەکا، ئەگەر بیەوێ ڕێی لە مەسەلەی بابەتییانە بکەوێ لەو هەموو لێکۆڵینەوەو ڕاپۆرتە ڕۆژنامەوانییانەدا کە نووسراون لە ڕۆژنامە شۆڕشگێڕەکانی ئەمریکای باکووردا، تەنانەت لە کاتی دروستکردنی دەوڵەتی دیموکراتیشدا. بەم شێوەیە چاوەڕوانی ئەوە ناکرێ لە ڕۆژنامە شۆڕشگێڕەکانی دەوڵەتە تازەپێگەیشتووەکاندا، سیفەتی بابەتییانەت دەسکەوێ.

ئەگەر تۆ ڕۆژنامەنووس بیت لە وڵاتێکدا کە هەوڵی بەدەستهێنانی سەربەخۆییو ڕزگاربوون لە دەسەڵاتی بێگانە بدات، بەلای زۆرەوە شارەزاییەکی تەواوت هەیە لە لایەنی بەهێزیو لاوازی لەو ڕۆژنامە شۆڕشگێڕانەیەدا. چەند جۆرێکی تریش هەن لەو ڕۆژنامە شۆڕشگێڕانە، هەر بەردەوام دەبن لە دەرچووندا تا قۆناغێکی درەنگتر، ئەمەش لەپێناوی بنیاتنانی کۆمەڵگەیەکی دادپەروەردا، ئەمانە ڕۆژنامەیەکی شۆڕشگێڕن تێدەکۆشن بۆ گۆڕینی وڵاتو زاڵبوون بەسەر مشەخۆریو چاککردنی پاشەڕۆژی میللەتێکی دیاریکراو. ئەم جۆرە ڕۆژنامانە کاریان هەر ئەوە نییە کە ڕووداوەکان بڵاو بکەنەوە، یا تەنیا ڕووداوەکان شی بکەنەوە، چونکە ئەوانە هەوڵی ئەوە دەدەن ڕووناکی بخەنە سەر بارودۆخی ناهەموارو ڕووخێنەرو هەوڵ بدەن بۆ نەهێشتنیان. ئەم جۆرە ڕۆژنامانە هەندێ جار بە ڕۆژنامەی لێکۆڵینەوە یاخود ڕۆژنامەی چاکسازی ناو دەبرێن. لە بەشێکی داهاتوودا زۆرێك لەو حاڵەتانە گفتوگۆیان لەسەر دەکەین کە بوونی ئەو جۆرە ڕۆژنامانە شتێکی پێویستن لە جیهانی تازەگەشەکردوودا.

## ڕۆژنامەی بواری گەشەکردن

کارێکی خۆشە گوێ بگرین لەو هەراو زەنای بێزارییەی هەندێ لە داکۆکیکەرانی ئازادیی ڕۆژنامەنووسی بەرپای دەکەن کاتێك باسی ڕۆژنامەگەریی گەشەکردن دەکەنو دەبینن زۆر زەحمەتە لەوە تێبگەن کە لەو وڵاتانەدا سەرچاوەیەکی داراییان نییە، ڕۆژنامە ببێتە هۆی تەواوکردنی ساختمانی سەربەخۆیی وڵاتو نیشتمان کە لە سەردەمی ڕۆژنامەی شۆڕشگێڕییەوە دەستی پێکراوە. شتێکی بەجێیە سەرکردە نوێیەکانی وڵات پرسیار بکەنو بڵێن چی بکەین بۆ ئەوەی بتوانین ئەو وڵاتە بنیات بنێین کە دەمانەوێو بە دڵی خۆمان بێ؟. کوتومت ئەمەیە



کاری گەشەکردنی وڵات. هەوڵدان بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو کێشەو گرفتانەی پێش بەدەستهێنانی سەربەخۆیی بۆیان بەجێماوە، تا داخوازییەکانی خەڵکی سادەو ئاسایی جێبەجێ بکەن لە فەراهەمکردنی ژیانێکی خۆشتر، ئەوانەی ڕەخنە لە ڕۆژنامەی بواری گەشەکردن دەگرن کەسانێکن بە تەواوی دوورکەوتوونەتەوە لە نەریتە شۆڕشگێڕییەکەی خۆیان، یاخود چوونەتە پاڵ ئەوانەی حەزیان لەوەیە بارودۆخ هەروەك خۆی بمێنێتەوە بە بێ گوێدانە ئەوەی ئەو دەسەڵاتە چەندە ستەمکارەو دوورە لە دادپەروەرییەوە.

ئەوانەی ڕەخنە دەگرن لە ڕۆژنامەی تایبەت بە گەشەپێدان، لە ڕاستیدا، ڕەخنەکە لەوەیە کە لە پاشەڕۆژدا ئەگەری ئەوە هەیە ئەو ڕۆژنامانە بەکاربهێنرێن لەلایەن سەرکردەکانەوە بۆ بەدیهێنانی چەند مەبەستێك کە بە خۆپەرستی دادەنرێن. چەند ڕەخنەیەکی ڕەوای تر هەن دەکرێ بخرێنە ڕوو ئەگەر هیچ جیاوازیو دووبەرەکییەك لە ئارادا نەما، یاخود لە کاتێکدا کە هەموو ڕۆژنامەنووسێك یا هەموو هاووڵاتییەك بیروباوەڕو بۆچوونێکی ڕێکوپێكو تەواویان هەبوو. بەڵام شتێکی وا نییە لە ڕۆژنامەی بواری گەشەکردندا شاراوە بێو ئەوە بگەیەنێ کە ئەم جۆرە لە ڕۆژنامە، زیانو زەرەری زیاتر بێ لەو ڕۆژنامە بازرگانییانەی کە پاڵپێوەنەری پارەو بەرژەوەندی دەیانبا بەڕێوەو ئاراستەیان دەکا.

بەلای زۆرەوە بەشی زۆری ڕۆژنامەوانان لە وڵاتانی جیهانی سێهەمدا، کار دەکەن لە یەکێك لە بوارەکانی پەیوەندیو ڕاگەیاندندا کە پشت دەبەستن بە دەسەڵاتە ناوخۆییەکانەوە بۆ بەردەوامبوونیان. ئاشکرایە کە دروشمو ئامانجەکانی دەوڵەتی نیشتمانیو بەرنامە سیاسییەکەی پاڵپشتی دەکرێن لە میانەی ڕۆژنامە نیشتمانییەکانەوە.

گەلێك لە ڕەخنەگرە ڕۆژاواییەکان وای بۆ دەچن کە حکومەتەکان بە شێوەیەکی ئاسایی، ناتوانن سەرپەرشتیو چاودێریی هاووڵاتییان بکەن بە جەمسەری کارەکانیان وەك ئەوەی کە ڕۆژنامەی سەربەخۆ دەیکا، لایشم وا نییە کە بڕێکی زۆر لێکۆڵینەوە کرابێ لەسەر ئەوەی کە ئایا سیستمەکانی ڕۆژنامەی سەربەخۆ ڕۆڵێکی باشتریان هەیە لە پشتگیریو بەهێزکردنی بەرژەوەندیی گشتیدا زیاتر لە ڕۆڵی سیستمی ڕۆژنامە حکومەتییەکان. شتێکی ئاشکرایە ئەوانەی بە زیادەڕەوییەوە پشتگیری دەکەن لە بنەماکانی سەربەستی دەڵێن ڕۆژنامە هیچ پەیوەندییەکی نییە بەوەوە کە ئەنجامی ئەرکەکەی چاك بێ یا خراپ بێ، چونکە ڕۆژنامە بۆ

ئەوە پەیدا بووە کە هەواڵ کۆ بکاتەوەو هەموو رووداوەکان بخاتە رووو سەرنجی خوێنەر رابکێشێ بۆ هەواڵو رووداوی سەیرو خۆش. من خۆم لام وایە هەر سیستمێکی رۆژنامەوانی بەرنامەی تایبەتیی خۆی هەیە بۆ خۆگونجاندنو پەیوەستبوون بە کۆمەڵەوەو تەنیا ساویلکەکان لایان وایە کە رۆژنامە لە گۆشەگیرییەکی تەواودایەو لایەنگیریی هیچ مەسەلەیەك ناکاتو زانیاریو هەواڵەکان بەکارناهێنێ بۆ بەرژەوەندیی خۆی. لە راستیدا هەڵبژاردنی هەواڵو رووداو کارێکی (نابابەتییانەیە). بەشی تایبەت بە واتاو ماناو بەهاکانی هەواڵ، هەوڵدەدا ئەم خاڵە روون بکاتەوە.

لە حەقیقەتدا زۆربەی سیستمەکانی رۆژنامەی بازرگانی لە جیهاندا، مەبەستی سەرەکییان بەدەستهێنانی پارەیە بۆ خاوەنەکانیان. لە زۆر حاڵەتیشدا هەڵبژاردنی رووداوو هەواڵو خستنەڕوویان لەسەر ئەو بناغەیە دادەنرێ کە ئەو هەواڵو رووداوە تا چ رادەیەك فرۆشتنی رۆژنامەکە بەرز دەکاتەوەو ژمارەی زیاتری لێدەفرۆشرێ. لە زۆر هۆڵی نووسەرانی ئەو رۆژنامانەدا کە هی کەرتی تایبەتن، کارمەندانی رۆژنامەو سەرنووسەر کەوتوونەتە ژێر دەسەڵاتو بەزەیی (بەڕێوەبەرپەتی)یەوەو تەنانەت ئەو بەشەی رۆژنامەکە، کە دیاریکراوە بۆ بڵاوکردنەوەی هەواڵ ئەوان دیاریی بکەن (واتە ئەوەی کە دەمێنێتەوە لە بەشی ئاگادارییەکان). ئەگەر رۆژنامەیەك سوودو قازانجێکی باشی نەبوو بۆ خاوەنەکەی ئەوا لە دەرچوون رادەوەستێ، یا دەفرۆشرێ بە یەکێکی تر. ئەم هەوڵدانە بۆ کۆکردنەوەی پارە کە کۆتایی نایەت، ئەو مەبەستە سەرەکییەیە کە گەلێك لە رۆژنامەکانی سەر بە کەرتی تایبەت پەیڕەوی دەکەن. هەندێ لەم رۆژنامانە لە پلەیەکی باشدان لەگەڵ ئەو گوشارەش کە دەکەوێتە سەریان بۆ پارەی زۆرتر بەدەستهێنان یا بەهۆیەوە. لەلایەکی ترەوە هەندێ رۆژنامە هەن کە تەنیا برێکی کەم گرنگی دەدەن بە کاروباری خەڵكو تەنیا بەوە رازی دەبن شتی خۆش بڵاو بکەنەوە تا پاڵ بنێن پێیانەوە بۆ کڕینی زیاترو زیاتر لەو رۆژنامانە، یا ئەو بەرهەمانەی لە رۆژنامەکەدا ئاگادارییەکانیان بڵاو دەکرێتەوە.

زۆربەی ئەو رۆژنامەنووسو سەرنووسەرانەی کار دەکەن لە رۆژنامەکانی کەرتی تایبەتدا، دەتوانن گەلێك لەو حاڵەتانە باس بکەن کە رووداوو هەواڵیان فرۆشتووە بە خاوەن ئاگادارییەکان بۆ ئەوەی هانیان بدەن ئاگادارییەکانیان لە رۆژنامەکەدا بڵاو بکەنەوە. ئەمەش



مانای ئەوەیە کە خاوەنی ئاگادارییەکە تەنیا سوود لە ئاگادارییەکە وەرناگرێ کە بە پارە بۆی بڵاو دەکرێتەوە، بەڵکو سوود وەردەگرێ لەو چیرۆکە هەواڵەی باسی بازرگانییەکەی یا بەرهەمی کارگەکەی دەکاو پڕوپاگەندەی بۆ دەکا.

من خۆم زۆرجاران چیرۆکە هەواڵم نووسیوە بۆ برەودان بە هەندێ کاری بازرگانی کە باسی لەو هەلە جوانو باشانە کردووە لە پێشانگە بازرگانییەکانی کۆتایی ساڵدا، کە گەورە بازرگانەکان لە یەکێك لە شارە گەورەکانی ئەمریکادا دەیانکردەوە. من کە ئەم چیرۆکە هەواڵانەم دەنووسی نەك لەبەر ئەوەی رادەیەکی باش بەهای هەواڵییان تێدایە بەڵکو بۆ ئەوەی هەزاران هاووڵاتی هان بدەم بۆ خەرجکردنی پارەیەکی زۆر لە کڕینی ئەو بەرهەمانەدا کە ئاگادارییان بۆ بڵاو کراوەتەوە.

### بەکارهێنانی هۆکانی راگەیاندن لە کاری نوێکاریی وڵاتدا

(ئامدی مایکل هایتی) دەنووسێو دەڵێ: ئەوەی چاوەڕێ دەکرێ لە هۆکانی راگەیاندن لە زۆربەی دەوڵەتانی جیهانی سێهەمدا، ئەوەیە ببێ بە بەشێك لەو هەوڵە نیشتمانییەی دەدرێ لە چوارچێوەی ئەرکی گەورەی تایبەت بە کاری نوێکارییەوە لە وڵاتدا. هەروەها (ئامدی) سەرنجی ئەوەی داوە کە بەها رۆژاواییەکانی تایبەت بە رۆژنامەی ئازادەوە لە زۆرترین کاتدا لە پلەیەکی دواوەیە ئەگەر مەسەلەی رزگاربوون لە هەژاریو نەخۆشیو نەخوێندەواری ببێ بە مەسەلەیەکی سەرەکیی وا کە خرابێتە پێش هەموو مەسەلەکانەوە.

ئێمە ئەگەر سەیری ئەو رۆژنامانە بکەین کە تایبەتن بە بواری گەشەکردنەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە ئەم تایبەتمەندییانەی خوارەوەیان تێدایە:

١) سیستمی پەیوەندیو راگەیاندن بەشێکی دانەبڕاوە لە دەوڵەتی نیشتمانیو بە زۆری لە رێگەی وەزارەتی راگەیاندن یا وەزارەتی پەیوەندییەکانەوە دەبرێ بەڕێوە. لە زۆربەی دەوڵەتانی جیهانی سێدا دەزگایەکی رۆژنامەوانیی سەرەکی نییە کە لە سەردەمی ئیمپریالیزمەوە مابێتەوە، ئەگەر شتێکی واش هەبێ، ئەوە دەوڵەتە تازە پەیدابووەکە یەك ناخات بەڵکو دەیبەستێتەوە بە بنکە سیاسیو ئابوورییە ئیمپریالیزمییەکانەوە.

٢) رۆژنامەنووسان لەو وڵاتانەدا کە ئەم جۆرە رۆژنامانەیان تێدا دەردەچێ، داوای ئەوەیان لێدەکرێ راستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ بەشداری بکەن لە بەجێهێنانی ئەو ئەرکە گەورانەی پەیوەندییان هەیە بە بنیاتنانی وڵاتو نەتەوەوە. ئەو ئەرکانەش بریتین لە پاڵپشتیکردنی سیستمی سیاسیو یارمەتیدانی هاووڵاتییان کە تێبگەن لەوەی دەوڵەتێکی نوێ هاتووەتە ئاراوە، ئەمەش بە هەوڵدان بۆ زاڵبوون بەسەر هەژاریو برسییەتیو نەخۆشیو نەخوێندەوارید او پاراستنی میراتی کەلتووریی گەل.

٣) هۆکانی راگەیاندنی جەماوەری، لەسەریانە لەسەر ئەو رێوشوێنە بڕۆن لە بواری پەیوەندیی ناوخۆییو دەرەکیدا کە دەوڵەتی ناوەندی نەخشەی بۆ دەکێشێو بڕیاری لەسەر دەدا، بە مەبەستی یارمەتیدان بۆ بەدیهێنانو جێبەجێکردنی گەشەکردنی نیشتمانی.

٤) رۆژنامە پێویستیی هەیە بە ئاراستەکردنی هەوڵەکان بۆ یارمەتی لەسەر بەدیهێنانی ئامانجەکانی میللەت. کەمو زۆریو جۆری ئەو ئاراستەکردنە ئەمسەرو ئەوسەر دەکا لە نێوان دوو حاڵەتدا، یا دەکەوێتە ژێر باری قورسی کردەوەی فاشیزمانە وەك چاودێریکردنی چاپەمەنیو ترسو تۆقاندن، یا رێگەپێدانی لەلایەن کاربەدەستانەوە بۆ گرتنەبەری چەند رێگەیەکی جیاواز بۆ هێنانەدیی ئامانجی هاوبەشی تایبەت بە گەشەکردنی وڵات.

٥) رۆژنامەنووسان کارمەندی ئاسایی دەوڵەتن.

٦) ئەگەر لە وڵاتەکەدا، رۆژنامەی کەرتی تایبەت هەبوو، ئەوە چاوەڕوان دەکرێ لەو رۆژنامانە بەرژەوەندیی وڵات لە سەروو بەرژەوەندیی خۆیانەوە دابنێن، ئەگەر ئەوەی پێنەکرا، ئەوا رۆڵی پێویستی خۆی بەجێ نەگەیاندووە لە گەشەکردنی وڵاتدا.

رۆژنامەوانی بواری گەشەپێدانی وڵات لەو وڵاتانەدا کە دەوڵەت دەستی گرتووە بەسەر هەموو هۆکانی راگەیاندندا، یا نزیکە لەوەوە، زۆر بە ئاسانی دەکرێ تووشی خراپ بەکارهێنانێکی مەترسیدار ببێ. لەو وڵاتانەشدا کە سیستمی دکتاتۆرییەت فەرمانڕەوایە، دیکتاتۆر رووبەڕووی حاڵەتێك دەبێتەوە بە توندی پاڵی پێوە دەنێت بۆ ئەوەی توانای رۆژنامەگەری بەکاربێنێ بۆ خزمەتی ئامانجی خۆی لە بەردەوامیی مانەوەی لەسەر کورسیی دەسەڵاتو، ئامانجەکانی گەشەکردنی وڵات گرنگییەکی کەمی دەبێ لە کاتێکدا کە دەسەڵاتی خودی ئەو دیکتاتۆرە دەکەوێتە مەترسییەوە. خۆ ئەگەر رۆژنامەوانی رۆڵێکی تەواوکەری دەزگا



دەوڵەتییەکانی هەبێ، ئەوە ئاسانە بۆی روو بکاتە ئەم جۆرە رەوتو ریبازانە. ئەوەندە هەیە کە تاوانبارکردنی هەموو رۆژنامەیەکی بواری گەشەکردن بەوەی کە لە خزمەتی سەرکردە خۆپەرستەکاندان گوزارش لە بیروبۆچوونی کەسانی کورتبین دەکەن. چونکە هیچ شتێك نییە سەرکردەکانی جیهانی سێهەم وا لێبکا کە زیاتر خۆپەرست بنو زیاتر شەڕئەنگێزو زیاتر حەز بکەن لە خستنە پشتگوێیی داواکارییەکانی میللەتەکەیان، بە بەراورد لەگەڵ سەرکردەکانی جیهانی پێشکەوتوودا رەخنەگرە رۆژاواییەکان کە رەخنە دەگرن لە حکومەتەکانی جیهانی سێهەم زۆرجاران دەبنە قوربانیی ئەو بۆچوونەیان کە مرۆڤایەتی دابەش دەکەن بۆ (ئێمەو ئەوان)، (ئێمە) هەموو کاتێك زۆرتر رووناکبیرو زیاتر دیموکراسیو زیاتر شارستانیترو رەوشت باشترن (لەوان). پاشان ناکرێ بڵێین کە هەندێ لە سەرکردەکانی جیهانی سێهەم، بەلای کەمەوە لە هەندێ حاڵەتدا، هەست بە بەرژەوەندیی هاووڵاتییانی خۆیان دەکەن، وەك چۆن سەرکردەکانی ئەورووپاو ئەمریکا هەستی پێدەکەن.

لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو رۆژنامانەی تەرخان کراون بۆ گەشەپێدانی وڵات، ئەگەری ئەوە هەیە کە تووشی یارییپێکردنو فرتوفێڵ بنو بکەونە خزمەتکردنی چەند ئامانجێکی خۆپەرستانەوە، بەڵام هێشتا بەلای زۆرێك لە رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەمەوە، بە حەقیقەتی بوونی مرۆڤایەتی دایدەنێن، ئیتر بەلایانەوە گرنگ نییە کە رەخنەگرە رۆژاواییەکان چۆن دەڕواننە ئەو سیستمەی تێیدا دەژینو بوون بە بەشێك لێیو لە هەندێ کاتدا بە ئارەزووی سەربەستانەی خۆشیانە.

ئەو بەشە زۆرەی کە ماوە لەم کتێبە، تەرخانی دەکەین بۆ ئەو هۆیانەی کە نووسەرو سەرنووسەرانی رۆژنامە دەتوانن بەکاری بێنن بۆ ئەوەی لە چوارچێوەی کارەکەیاندا، بە باشترین شێوە پیشەکەیان بەجێ بگەیەنن، دیارە هیچ سیستمێکی رۆژنامەنووسی واش نییە کە خەوشو ناتەواویی تیا نەبێ. تەنانەت سەبارەت بە رۆژنامەنووسی ئازادو سەربەستی رۆژاواییشەوە، گاز ناگرێ لەو دەستەی خواردنی دەداتێ. بەڵام ئێمە بۆمان هەیە تاکە پرسیارێك بکەین، من وەك رۆژنامەنووسێك یا وەك سەرنووسەرێك چۆن بۆم دەکرێ تواناکانی خۆم پەرە پێبدەمو کارەکەم بەرەو چاکی بەرم بۆ خزمەتی ئامانجەکانی خۆمو کۆمەڵگەو وڵاتەکەم؟

دەوڵەتە دیموکراتییەکانی ئەوروپای رۆژاواو ئەمریکا، سەدان ساڵیان تێپەڕاند لە کاری پێشخستنو گەشەکردنی وڵاتەکانیانداو ئەم دەوڵەتە نوێیانەی لە ماوەی دەیان ساڵی رابوردوودا پەیدا بوون ئەو کاتەیان بە دەستەوە نییە، چونکە بە هەزاران کەس لە هاووڵاتییەکانیان دەمرن بەهۆی برسیەتیو نەبوونی خزمەتگوزاریی تەندروستی، یا بەهۆی کەمیی پەرستارو دوکتۆری لێزانو شارەزاوە، بە ملیۆنەها لەوانە ناتوانن ئەو وشانە بخوێننەوە کە لە رۆژنامەکاندا دەنووسرێن، بە دەیان وڵات هێشتا پشت دەبەستن بەو پارەیەوە کە لە وڵاتانی تر وەریدەگرن بەرامبەر بە کەرەستەی خاوو ئەو بڕە کەمەی کە هەیانە لە بەرهەمە سروشتییەکان، هەروەها داهاتی ئەو وڵاتانە زۆرجار دەکەوێتە ژێر بەزەیی بازاڕەوە کە تەنیا بەرهەمێك یا بەرهەمێکی وایان لێدەکڕن کە لە شوێنی تردا دەسیان ناکەوێ. دەوڵەتانی جیهانی سێهەم قورسایی قەرزی زۆر دەکەوێتە سەرشانیان کە رۆژ دوای رۆژ لە زیادبووندایەو دەبێ بیدەنەوە بە دەوڵەتە پیشەسازییەکان. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە بڕێکی زۆری داهاتی ساڵانەیان بدەنەوە وەك بەشێك لەو قەرزانە.

لەم حاڵەتەدا هیچ جێگەی سەرسوڕمان نییە کە رۆژنامەی تایبەت بە بواری گەشەکردنو پێشکەوتن دەربکەوێ وەك ئامرازێك بۆ پاڵنانو هاندانی خەڵك بۆ خزمەتکردنو سوودگەیاندن بەو بوارە؟، یاخود شتێکی سەرنجڕاکێش نییە کە پاراستنی هەر جۆرێك لە سیستمەکانو پێناسەی نیشتمانی ببێ بە مەسەلەیەکی سەرەکیو لە پێشەوەی بەرنامەکانی ئەو دەوڵەتە نوێیانەی کە تا پێش چەند ساڵێکی کەم پشێوییو ئاژاوە باڵی کێشابوو بەسەریاندا.

هۆکانی راگەیاندن دەکرێ دابنرێن بەهۆی گۆڕانکاری لە بواری کۆمەڵایەتیدا بەو مانایەی گەلی وڵاتێکی دیاریکراو، بکەوێتە ژێر کاریگەریی بڕێکی زۆر لەو نامانەی لە هۆکانی راگەیاندنەوە دەکەونە بەرچاوو گوێی خەڵك. ئەو نامە زۆرانە زۆر کەس بە نائاگایانە وەریدەگرن، هەروەها ئەو کەسانەی لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنو سینەما دەردەکەون، بە ئاسانی خەڵك بە کەسانێك سەیریان دەکا کە شایانی ئەوەن چاویان لێبکرێو ببن بە نموونەو پێشەنگی خەڵك.

من زۆر باش ئەو راپۆرتەم لەیادە کە هەندێ لە خوێندکارانی یەکێك لە زانکۆکانی (مەکسیك) ئامادەیان کردبوو پێش چەند ساڵێك. ئەو خوێندکارانە چەند پرسیارێکیان ئاراستەی دانیشتوانی شاری (جوادا لاجارا) کردبوو دەربارەی چوونیان بۆ سینەماو چ سوودێك



وەردەگرن لە بینینی ئەو فیلمانەی سینەما. زۆرێك لەوانەی پرسیاریان لێکرابوو گوتوبوویان، کە دەچنە سینەما بۆ ئەوە ناچن کە بزانن رووداوو سەرگوزەشتەی فیلمەکە چۆن کۆتایی دێتو بە چی دەگا، بەڵکو بۆ ئەوە دەچن بزانن ئەکتەرەکان چ جۆرە جلوبەرگێکیان لەبەردایەو چۆن هەڵسوکەوت دەکەن لە فیلمەکەدا کە شێوازی ژیانی وڵاتانی تر دەخاتە روو. بێگومان بینینی فیلمە بیانییەکان کاریگەرییەکی گەورەی دروست کردبوو لای ئەو مەکسیکییانە، تەنانەت هەندێکیان هەڵسوکەوتو رەوشتی خۆیان گۆڕیبوو لە باری خۆشەویستیو خۆنزیککردنەوە لە رەگەزەکەی تر لە ئەنجامی وردبوونەوە لە پەیوەندیی نێوان پیاوو ژن لە وڵاتانی تردا وەك دەیبینن لەسەر شاشەی سینەماکە.

ئەو رۆژنامەنووسەی گرنگی دەدا بە بواری پێشکەوتنو گەشەکردن دەبێ بیروبۆچوونێکی تایبەتی هەبێ لەسەر چۆنیەتیی جێبەجێکردنی گەشەکردن لە وڵاتەکەی خۆیدا، گەڵاڵەبوونی ئەم بیروبۆچوونە رەنگە لە سیاسەتو رەوتی تایبەتیی دەوڵەتەوەو پێناسەکردنی تایبەتی دەوڵەت بۆ پێشکەوتنو گەشەکردنی وڵات، بێتە کایەوە. مەسەلەی گەشەپێدانی وڵات رەنگە سەرنجڕاکێش بێ. ئەم مەسەلەیە تەنیا ئەوە نییە هەواڵو رووداوە ئاساییەکان بەسەر بکەیتەوە کە خوێنەر لێی بێزارو وەڕس بوو، یاخود بەسەرکردنەوەی هەواڵی یەکێك لە سەرکردەکان کە تووشی خۆپەرستی بووە. زۆرکات هاووڵاتییان لە دەوڵەتە تازەپێگەیشتووەکاندا، تێدەکۆشن دژی بارودۆخێکی ناهەموار بە مەبەستی هێنانەدیی ژیانێکی خۆشترو باشتر بۆ خۆیانو نەوەکانی دوای خۆیان.

هەستکردنو گەیشتن بەم بیروبۆچوونەو خستنەڕووی خەونی ژیانێکی سەربەستانەی خۆش، ئەرکێکە شایانی ئەوەیە رۆژنامەنووس خۆی بۆ ماندوو بکا. گرنگیدان بە مەسەلەی گەشەکردنی وڵات مانای ئەوە نییە کە تۆ تەنیا باسی دەسکەوتە باشەکان بکەی.

ئەگەر بەختەوەر بوویت، ئەوا پیشەو کاری رۆژنامەوانییەکەت لە وڵاتێکدا ئەنجام دەدەیت کە سەرکردەکانی ئەوەندە کامڵ بووبن هەست بکەن بەوەی ئەوانیش دەکرێ تووشی کرداری هەڵە ببن. زۆر لەو کێشانەی رووبەڕووی دەوڵەتە نوێیەکانی جیهانی سێهەم دەبنەوە، بە تەواوی چار ناکرێن. رەنگە هەوڵێکی سەرەتاییو خۆماندووکردنێکی بێهوودە هەبێ (ئەم حاڵەتە لە دەوڵەتە رۆژاواییەکانیشدا هەیە). تۆ خزمەتێکی وڵاتەکەت دەکەیت ئەگەر بتوانی ئەو

بەرنامانەی گەشەكردنە بخەیتە روو كە جێبەجێ ناكرێن. ئەو رۆژنامەنووسەی گرنگی دەدا بە بواری پێشكەوتنو گەشەكردنی وڵات، وەك هەر رۆژنامەنووسێكی تر، پێویستە هەموو كاتێك بپرسێ.. بۆچی؟

یەكێك لەو مەسەلانەی كە گرنگیی پێدراوە لە هەموو گۆشەیەكی جیهاندا ئەو نەبەردو ململانێیەیە كە ژن تێی كەوتووەو دەستی داوەتێ (لەگەڵ ئەو پیاوانەدا كە هاوسۆزن بەرامبەری) بۆ باشكردنی ژیانی لە كۆمەڵگەدا، رۆژنامەنووسێك كە مەسەلەی گەشەكردنو پێشكەوتنی وڵات بەلایەوە گرنگە، رەنگە حەز بكا لەوەی ببێتە چاودێرێكی ورد لە كاتێكدا ئەم چیرۆكە دەگێڕێتەوە كە باس لە باشبوونی بارودۆخی ژیانی نیوەی كۆمەڵگە دەكا. رۆژنامەنووسان وەك چۆن سەرنجی خەڵك رادەكێشن بۆ زوڵمو زۆری چینایەتیو رەگەزپەرستی، سەرنجی خەڵك رادەكێشن بۆ چوونە سەنگەرو لایەنگیری دژی ژن تەنیا لەبەر ئەوەی ژنن.

هەروەها ئەو هەوڵانەی دەدرێ بۆ كەمكردنەوەی رێژەی بێكاری، بابەتگەلێكی چاكو خۆشن بۆ ئەو رۆژنامەنووسەی گرنگی دەدا بە مەسەلەی پێشكەوتنو گەشەكردنی وڵات. قورسترینو سەختترین حاڵەت لە جیهانی سێهەمدا ئەوەیە كە هاووڵاتییان تووشی شكست دەبن لە بەدەستهێنانی ئیشوكاردا، بە جۆرێك ناچاریان دەكا روو بكەنە كۆچكردن بۆ وڵاتە دەوڵەمەندەكان. یا تێوە بگلێن لە جموجوڵی تاوانكاری یاخود هەندێ جار بە رۆژانەو كرێیەكی ناچیز كار بكەن. رۆژنامەنووسێك كە مەسەلەی گەشەكردن بەلایەوە گرنگ بێ، دەتوانێ لە دیدگەی مرۆڤایەتییەوە باسی ئەو زیانو لەكەداربوونە بكا كە تووشی سەروەریی مرۆڤ دەبێ لە ئەنجامی بێكارییەوەو دەكرێ گرنگی بدا بە باسكردنی ئەو هۆیانەی دەتوانن چارەی كێشەی بێكاری بكەن.

رۆژنامەنووسی بواری گەشەكردنی وڵات، ناتوانێ ئەوە لەبیر خۆی بەرێتەوە كە ئەو جگە لەوەی رۆژنامەنووسە مامۆستاشە. پێویستی بۆ فێركردنی خەڵك، پێویستییەكی گرنگە لە دەوڵەتە تازەپێگەیشتووەكاندا. ئەو بابەتانەی باسی زیانی خواردنەوەی ئاوی پیس دەكەنو چۆن دەبێ هاووڵاتی خۆیان بپارێزن لەو نەخۆشییانەی تووشیان دەبن لە ئەنجامی خواردنەوەی ئەو ئاوە پیسەدا، مانای ئەوەیە جیاوازیی نێوان ژیانو مردن دەخەیتە بەردەستیان. ئەركی



فێركردنی خەڵك ئەركێكی گرنگە بە تایبەت كاتێك هاووڵاتی هەلی ئەوەی بۆ نەڕەخسابێ كە فێری خوێندنی سەرەتایی ببێت.

ئەو بەشەی كە تەرخان كراوە لەم كتێبەدا بۆ رۆژنامەی تایبەت بە ریپۆرتاژو لێكۆڵینەوە، بە دووردرێژی باسی هەندێ لەو هۆیانە دەكا كە رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم چۆن دەتوانن بەشدارییەكی كاریگەر بكەن لە پێشخستنو گەشەكردنی كۆمەڵگە یا وڵاتەكەیدا. لە زۆركاتدا رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم ئەوەندە كەمتەرخەم نین كە تەنیا خۆیان بكەن بە تەماشاكەرو چاودێری شانۆی رووداوەكان، رۆژنامەنووس لە وڵاتێكی تازەپێگەیشتوودا، ناكرێ دوورەپەرێز بێ لە مەسەلەی تێكۆشان لە پێناوی ژیانێكی باشتر بۆ وڵاتەكەیان.

وەك دوكتۆر (ولبور سكرام) روونی كردووەتەوە، كە خۆی یەكێكە لەو رۆژنامەنووسو مامۆستایانەی زانیاریو شارەزاییەكی زۆریان هەیە دەربارەی كێشەو گرفتەكانی جیهانی سێهەم. هۆكانی راگەیاندن دەبێ یارمەتیدەر بن بۆ دروستكردنی بارودۆخێك بۆ گەشەكردن. هەروەها رۆژنامەنووس دەبێ هاووڵاتییان ئاگادار بكاتەوە لە كاتە مەترسیدارەكانداو دەبێ سەرنجی خەڵك رابكێشێ بۆ ئەوەی كە پێویستی هەیە بۆ گۆڕانكاری. هۆكانی راگەیاندن دەبێ هاوكارو یارمەتیدەر بن بۆ چڕكردنەوەی ئاواتو ئامانجەكانی هەر میللەتێكو لە توانایدایە لەناو هاووڵاتییاندا هەستێك دروست بكا بۆ یەكبوونو یەكیەتیی نەتەوایەتی.

## سەرچاوەکان

1. Edwin Emery and Michael Emery, The Press and America ($5^{th}$ ed.) (Englewood Cliffs, N. J., USA: Prentice-Hall, 1984), p. 69.

2. The World News Prism: Changing Media, Clashing Ideologies (Ames, Iowa, USA: The Iowa State University Press, 1981), p. 70.

3. See his "The Mass Media in the Third World", in Comparative Mass Media Systems, by L. John Martin and Anju Grover Chaudhary (New York: Longman, 1983), p. 100.

4. Ibid., p. 109.

5. Dr. Schramm's book, Mass Media and National Development (Palo Alto, Calif., USA: Stanford University Press, 1964), still is one of the best discussions of the role of mass communication and national development. Dr. Schramm does not pretend that the mass media can by themselves develop a country, but he points out graphically how the media have their roles to play in the process. It is a helpful background reading for reporters and editors.

# بەشی شەشەم
# پێویستیی سادەیی لە نووسیندا

**نووسینی: أ. ل. هستر**

ئەگەر خوێنەر لە توانایدا نەبێ تێبگا لەو بابەتەی دەینووسیت، کەواتە بۆ دەینووسیت؟ نووسینی بابەت بۆ رۆژنامە ئەو نووسینەیە کە زانیارییەك یا بیروبۆچوونێك بخاتە بەردەست خوێنەر کە پێشتر نەیزانیوە. ئەگەر خوێنەر لە توانایدا نەبوو لە ناوەرۆکی هەواڵەکەی تۆ تێبگات، ئەوە مانای ئەوەیە کە هیچ (پەیوەندییەکی) تەواو رووی نەداوە لە نێوان تۆو ئەودا، ئەگەر خوێنەر تووشی بێزاری یا تووڕەیی‌و سەرلێشێوان بوو ئەوا ئەگەری ئەوە هەیە روو بکاتە شتێکی تر کە زیاتر چێژی لێوەرگرێ.

یەکێك لەو مەسەلە گرنگانەی کە دەبێ لەیادت بێ ئەوەیە کە پەیمانێك نییە لە نێوان‌و تۆو خوێنەردا، ناچاری بکا ئەوەی تۆ دەینووسی بیخوێنێتەوە، واش دیارە هەندێ لە نووسەران باوەڕیان وایە کە هەر بابەتێکیان بلاّو کردەوە لەسەر هەواڵێك، ئەوە کەسانێك پەیدا دەبن بیخوێننەوە. ئەزموونێکی سادەو ساکار هەیە دەتوانی ئەنجامی بدەی، ئەویش ئەوەیە لە هۆڵێکی چاوەڕوانیی فرۆکەخانەکاندا دانیشەو سەیری ئەوە بکە کە خەڵك چۆن رۆژنامەکان دەخوێننەوە، ئەنجا بۆت دەردەکەوێ کە دانیشتوان چاوێکی سەرپێیی دەگێڕن بە لاپەڕەی رۆژنامەکانداو بە خێرایی ئەو رووداوو وێنەو مانشێتانە سەیر دەکەن کە بەلایانەوە گرنگەو بابەتەکانی تر دەخەنە پشتگوێ‌و رەنگە هەر بابەتەکە نەخوێننەوە. نووسەرو سەرنووسەرو وێنەگری رۆژنامەو هونەرمەندی مۆنتاژ، پێویستە لەسەریان بە هەماهەنگی کار بکەن لە پێناوی پێشکەشکردنی (باقەیەك زانیاری) خۆش بە گوێرەی توانا.

ئێمە دەزانین ژمارەی ئەو خوێنەرانەی زیاتر لە شەش بڕگەی هەواڵێك دەخوێننەوە کەمن. رەنگە ئەوانەی کە هەواڵێك دەخوێننەوە لە سەرەتاوە تا کۆتایی لە هەر دە کەسدا یەك کەسە.

تێکڕای ئەو کاتەی خوێنەر دەیباتە سەر لە خوێندنەوەی رۆژنامەیەکی ئەمریکیدا (کە ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ ئەو رۆژنامانەی لە زۆربەی وڵاتانی تردا دەردەچن گەورەترن)، بەلای زۆرەوە

لە پانزە خولەك تێپەڕ نابێو لەسەر لاپەڕەكانی ئەو ڕۆژنامە گەورانەدا بە دەیان چیرۆكە هەواڵ ركەبەرایەتیی یەكتر دەكەن بۆ سەرنجڕاكێشانی خوێنەران.

ڕەنگە تۆ نووسەر بیت لە ڕۆژنامەیەكدا ژمارەی لاپەڕەكانی لە هەشت تێپەڕ نەكات، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ تۆ بابەتێك بخەیتە بەردەستی خوێنەر كە پاڵی پێوە بنێ بۆ خوێندنەوەی. ئەو ئامرازەش كە بەكاری دێنی بۆ هێنانەدیی ئەو مەبەستە ئەوەیە كە لەسەر بابەتگەلێك بنووسی گرنگ بن بەلای خوێنەرەوەو بە شێوازێك بنووسی كە خەڵك بە ئاسانی تێی بگەنو نەك هەر ئەوە بەڵكو پێیان خۆش بێو چێژی لێوەربگرنو دەبێ تۆ لە زۆركاتدا ئەو كارە ئەنجام بدەی بە بەكارهێنانی تەنیا چەند سەد وشەیەك.

ئێمە هەوڵ دەدەین لە بەشەكانی ئەم كتێبەدا یارمەتیت بدەین بۆ هەڵبژاردنی ئەو بابەتانەی گرنگن بەلای زۆرێك لە خوێنەرانەوە، كە بە شێوەیەكی گشتی گرنگی دەدەن بەو بابەتانەی كاریگەرییان هەیە لەسەر ژیانی ڕۆژانەیان. ئەوەش لەبەر ئەوەیە كە بەشی زۆری ئێمە، بە زەحمەت تێدەگەین لە مانای هەندێ شتی رووتو وشكی وەك (كورتهێنان)ی بودجەی ساڵانەی وڵات كە هەندێ جار دەگاتە ملیۆنەها پاوەن یا دۆلار... هتد. زۆربەی خوێنەران ناتوانن لە بابەتێكی قورسو گران تێبگەن ئەگەر نەتوانی بە شێوەیەكی ئاسانو سادە بینووسی، وەك ئەوەی دەستنیشانی ئەو بڕە پارەیە بكەیت كە دەكەوێتە سەر هەر هاووڵاتییەك لە دانیشتوانی وڵاتەكە لە ئەنجامی كورتهێنانی بودجەی ساڵانەی وڵاتەكە.

ئەگەر بتەوێ لەسەر خەڵك بنووسیو بە وردی سەیری مەسەلەكان بكەیت بۆ ئەوەی بۆت روون ببێتەوە كە هەر ڕووداوێك كاریگەریی چییە لەسەر خوێنەری ئاسایی، ئەوا لەو حاڵەتەدا روو دەكەیتە نووسینی زۆر ئاساییو زۆر پەیوەست بە خوێنەرانەوە. ڕۆژنامەنووسان بە تایبەتی ئەوانەی زۆرترین كات لەگەڵ بەرپرسە دەوڵەتییەكان كار دەكەن، دەبن بە ژێر لێشاوێك زانیاریی رووتەوە كە زۆر جاران بە شێوەیەكی ئاڵۆز پێیان دەگوترێ. ئابووریناسانو پیاوانی بواری فێركردنو پزیشكانو پیاوە سیاسییەكان هەندێ جار رستەو زاراوەی وا بەكار دێنن كە هەر تەنیا خۆیان تێیدەگەن، بەڵام خوێنەری ئاسایی هیچیان لێتێناگات، ئەركی تۆ لێرەدا مانا لێكدانەوەو شیكردنەوەی ئەو وشە نهێنییانەیە، بۆ ئەوەی خەڵكی ئاسایی ماناكانیان بزانن. تۆ لە جێبەجێكردنی ئەم ئەركەدا تووشی سەرسوڕمان دەبی، چونكە تۆ خۆت لات وایە كە زاراوەیەكی وەك (تێكڕای بەروبوومی وڵات)



دەزانی چی دەگەیەنێو مانای چییە، بەڵام تووشی سەرەگێژە دەبی كە هەوڵی ئەوە دەدەیت بە چەند وشەیەكی ئاسانو سادە ماناكەی لێكبدەیتەوە.

گەلێك لە كاربەدەستان بە مەبەست یا بێ مەبەست زمانێكی قورسو ئاڵۆز بەكار دێنن بۆ ئەوەی یارمەتییان بدا لە بەردەوامبوونیان لەسەر دەسەڵات، ئەوەش لەبەر ئەوەیە كە ئەگەر ئەوەی ئەوان دەیكەن هەموو كەس لێی تێبگا، ئەوا مرۆڤی ئاسایی لای وایە كە كاری دەسەڵات بە دەستو بە هێز خاڵییە لە ئاڵۆزیو ناڕوونی. بەكارهێنانی زمانێكی تایبەت، بە مەبەستی پاراستنی كۆمەڵی دەسەڵاتدارو بەهێز، بۆ ئەوەی كەسانی ئاسایی لێیان تێنەگەن شتێكی تازە نییەو لە كۆنەوە هەیە. لە هەندێ لە شارستانییەكاندا — وەك نموونە — پیاوانی تیرەو خێڵ زمانێكی تایبەتیان بەكار دەهێنا لە كاتی باسكردنی هەندێ مەسەلەی گەورەو گرنگدا وەك مەسەلە رۆحییەكان. دەبوا ژنانی خێڵەكە ئەو زمانە نەزانن یا بەكاری بێنن، بەڵكو لە هەندێ حاڵەتدا نەدەبوو تەنانەت گوێیشی لێبگرن. دیارە كە شاردنەوەی مانای قسەكانی ئەو پیاوانە بڕێكی زۆر هێزو گەورەیی دەبەخشێ بەو كۆمەڵە پیاوانە بە بەراورد لەگەڵ ئەو كەسانەدا كە لە مانای قسەكانیان تێناگەن.

كاتێك تۆ وەك ڕۆژنامەنووسێك یارمەتیی هەموو مرۆڤێك دەدەیت بۆ تێگەیشتن لە مانای ئەوەی روو دەدا، ئەوە تۆ بوویت بە یاریدەدەرێك بۆ بڵاوكردنەوەی بەهێزی لە وڵاتەكەی خۆتدا، چونكە زانینو لە شت گەیشتن بەهێزییە.

لەگەڵ ئەوەشدا یەكێك لەو هۆیانەی ڕۆژنامەنووس هان دەدا بۆ نووسین ئەوەیە كە نووسینەكانی ئاراستەی سەرچاوەی هەواڵەكانی بكا، واتە ئەو كەسانەی كە دەسەڵاتیان بەدەستەوەیە. ئەو سوودو قازانجەی كە دەگەڕێتەوە بۆ تۆ لەم كارەدا ئەوەیە كە ڕەزامەندیی ئەوانە بۆ خۆت مسۆگەر دەكەیتو ڕێزێكت دەسگیر دەبێ لێیانەوەو هەستێكت لا پەیدا دەبێ كە یەكێكی لەو كۆمەڵە تایبەتە. ڕۆژنامەنووسان هاوبەشن لە دەسەڵاتدا، بەلای كەمەوە نوێنەری ئەوانن، ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە كە پەیوەندییان هەیە بە كەسانێكی گەورەوە لە كۆمەڵگەدا. ئەم هەستكردنە ڕەنگە ببێتە هۆی لە خۆباییبوونی ڕۆژنامەنووس. بەڵام ئەگەر ئەركەكەت بە ڕێكوپێكی ئەنجام بدەیت ئەوكاتە دەزانی كە پێویستە لەسەرت كارێكی زیاتر بكەیت لەوەی بنووسیت بۆ بەرژەوەندیی تاقمێكی بچووك لە سەرچاوە گرنگەكانی دەوڵەت یا بواری بازرگانی یا سیاسەت.

مەترسییەکی تر هەیە رووبەڕووی رۆژنامەنووسان دەبێتەوە کە بریتییە لەوەی نووسینەکانیان بۆ کۆمەڵێکی هەڵبژێردراو بێ لەناو هاووڵاتییان کە پلەیەکی بەرزیان بڕیبێ لە خوێندنی باڵا لە کۆمەڵگە یا لە وڵاتەکەدا. بۆ نموونە ئەگەر تۆ بابەتێك بنووسی بۆ گۆڤارێك کە تەنیا بڵاو دەبێتەوە لەناو ئەو دەرچووانەی کۆلیژەکاندا کە گرنگی دەدەن بە بواری ئابووری، ئەوە شتێکی گونجاوە، بەڵام ئەگەر بابەتێك بنووسی بۆ رۆژنامەیەك کە بەناو خەڵکی ئاساییدا بڵاو دەبێتەوە، ئەوا ئەو جۆرە نووسینە ئەرکەکەی سەرشانت جێبەجێ ناکات.

هەندێ لە رۆژنامەنووسان لایان وایە کە نووسینی سادەو ئاسان نیشانەی کەودەنیو نەزانیی نووسەرەکەیە. بەڵام ئەمانە دواتر بۆیان دەردەکەوێ کە نووسین بە شێوازێکی سادەو ئاسان زۆر گرانترە لە نووسینی قورسو ئاڵۆز. نووسین بە شێوازێکی سادەو ئاشکراو لە هەمان کاتدا بخوێنرێتەوە تاقیکردنەوەیە بۆ تواناو کارامەیی تۆ تا ئەوپەڕی سنوور.

ئاشکرایە کە تۆ هەندێ جار توانای ئەوەت نییە بە ئاشکراو بە سادەییەکی تەواو شت بنووسی، رەنگە ئەمەش شتێکی سەیر بێ بەلاتەوە، بەڵام رۆژنامەنووس هەندێ جار پێویستە لەسەری کە پابەند بێ بەوەوە نابێ دەمامکی رووی بەرپرسانو کەسیەتییە گەورەکان لابەرێ یاخود کردارو بیروبۆچوونیان بخاتە روو، ئەمەش کارێکی قورسو گرانە بۆ رۆژنامەنووسێك کە دڵسۆز بێ لە کارەکەی خۆیدا. بۆ نموونە تۆ دەتەوێ راپۆرتێك بنووسی لەسەر کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانی کە یەکێك لە وەزیرە گەورەکان سازی داوە تیایدا باسی کردووە لەوەی دەبێ رۆڵی ژن لە وڵاتدا دەبێ بەرز بکرێتەوە. بەڵام تۆ ئەوە دەزانی کە ئەو وەزیرە ژنەکەی کردووە بە پاشکۆیەکی خۆیو بێبەش بووە لە خوێندنو رێگەی ئەوەشی لێگرتووە کە بە ئاشکرا لەناو خەڵکدا دەربکەوێ.

ئەگەر تۆ راپۆرتێکت نووسیو پەردەت لەسەر دووڕوویی ئەو وەزیرە هەڵماڵی، ئەوا ئەو نووسینەت رەنگە بڵاو نەکرێتەوەو رەنگە سزاش بدرێیت چونکە بە شێوەیەکی روونو بێ پەردە بابەتەکەت نووسیوە زیاد لەوەی پێویستەو لە سنوور چوویتە دەرەوە. هەموو رۆژنامەنووسێك دەبێ ئەو رادەیە دیاری بکا لە دەرخستنی حەقیقەتو راستیدا کە خوێنەرانی پەسەندی دەکەن، یا راستتر بڵێین ئەو رادەیەی کە رێگەی پێدراوە بۆ دەرخستنی حەقیقەتو راستی لە هەواڵەکاندا، چونکە یەك هەنگاوی زیاتر لەو بارەیەوە سنوورێك دادەنێ بۆ بەرژەوەندیو سوودی ئەو رۆژنامەنووسە. ئەمەش گرفتێکە رووبەڕووی رۆژنامەنووسان دەبێتەوە لە هەموو گۆشەیەکی جیهاندا.



شتێکی ئاشکرایە کە ئەگەر رۆژنامەنووسێك ئەو رێگەیەی بۆ خۆی هەڵبژاردو ویستی بە تەواویو بێ پەردە بنووسێو بگەڕێ بە دوای راستیدا بۆ خستنەڕووی لافلێدانو خۆدەرخستن، ئەوا پێویستە لەسەری توانای سەلماندنی ناوەرۆکی نووسینەکەی هەبێ بە بەڵگەی تەواو. ئەوەی کە بگوترێ هەموو ئەندامانی کۆمەڵگە دەزانن کە ئەو قسانە حەقیقەتو راستنو منیش دەتوانم ئەوە بڵێم بە بێ ئەوەی بەڵگەم بەدەستەوە بێت، شتێکەو بنووسیت بە بێ ئەوەی بەڵگەی پێویستت لە بەردەستدا بێت شتێکی ترەو لە هەمان کاتدا زۆر مەترسیداریشە.

ئەو شێوازەی قسەی پێدەکەین لەسەر مەسەلەکان لە کلتوورێکەوە جیاوازە بۆ کلتوورێکی تر. بۆ نموونە لە ئەمریکای لاتینیدا هەندێك حەز لە جۆرە نووسینو زمانێك دەکەن کە زیادەڕەوی کرابێو ترشو خوێی پێوە کرابێ لە گێڕانەوەی هەواڵەکاندا. ئەوان ئامادەن بۆ خوێندنەوەی ئەو بابەتانەی رۆژنامەنووس بڵاوی دەکاتەوە بەهۆی شێوازی نووسینەکەیەوە. تەنانەت هەندێ لە نووسەرانی ئەمریکای لاتین هەست دەکەن کە بەکارهێنانی وشەیەك دوو جار بە دوای یەکدا وەك تاوانێك وایە بەرامبەر شێوازی نووسین ئەگەر وشەیەکی هاومانای تری هەبێ. بەڵام من باوەڕم وایە ئەم حاڵەتە لەوەوە پەیدا بووە کە نووسین بۆ ئەو توێژانە بووە گەیشتبنە پلەیەکی بەرز لە خوێندندا.

رۆژنامەنووسانی ئەمریکای لاتین دەبێ بە سادەییو ئاسانی بنووسن ئەگەر بیانەوێ ژمارەی خوێنەرانیان زیاد ببێ. ژمارەی رۆژنامە بە قەوارە بچووکەکانی ئەمریکای لاتینی کە برەویان هەیە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە جەماوەری خوێنەر، نووسینی سادەو ئاسانیان بەلاوە پەسەندە، ئەو کەسانەی کە تازە فێری خوێنەواری بوون، یا بەشێکی کەمیان بەرکەوتووە لە خوێندن، دەیانەوێ راپۆرتە هەواڵێکی سادەو ئاسان بخوێننەوە کە ژمارەیەکی زۆر وێنەی تێدابێ. ئەو بۆچوونەش کە دەڵێ خوێنەوارەکان نووسینی گرانو ئاڵۆز دەخوێننەوە، یا لێی تێدەگەن ئەوە بۆچوونێکی هەڵەیە لە زۆر حاڵەتدا، چونکە خەڵك بە زۆری رۆژنامە دەخوێننەوە بۆ حەوانەوەو نایانەوێ خۆیان ماندوو بکەن تا مانای ئەوە تێبگەن کە نووسراوە تەنانەت ئەگەر لە خوێندنیشدا بەشێکی باشیان بەرکەوتبێ.

ئەگەر دەتەوێ خەڵك لە نووسینەکانت تێبگا، یەکەمجار دەبێ جۆری خوێنەری ئەو رۆژنامە یا گۆڤارەی بابەتی بۆ دەنووسی بناسیو رەنگە پێشتریش زانیاریت هەبووبێ لەو بارەیەوە. ئەگەر ئەو رۆژنامە یا گۆڤارەی بۆی دەنووسی بۆ هەمووان بوو، ئەوە دەتوانی زانیارییەك پەیدا بکەی لەسەر رادەی خوێنەواری بە شێوەیەکی گشتی لە کۆمەڵگە یا وڵاتەکەدا، ئەگەر جەماوەری خوێنەران، تازە فێری خوێندنەوەو نووسین بووبن ئەوا زیاتر پێویست دەکا کە بە شێوازێکی زۆر سادەو ئاسان بنووسی.

## ئەو ڕێگەیانەی یارمەتیدەرن لەسەر نووسینی سادەو ئاسان

ڕەنگە ئەو شێوە داڕشتنە سەرەکییەی نووسین لە ڕۆژنامەدا کە پێی دەڵێن ڕاپۆرتە هەواڵی کورتو گرنگترین زانیاری دەخاتە بەردەست خوێنەران لە سەرەتای ڕاپۆرتەکەدا، تا ڕادەیەك داڕشتنێکی پەسەند بێ لە جیهاندا، لەبەر ئەوەی باشترین شێوازە بۆ نووسین دەربارەی ڕووداوێك بە سادەییو ئاسانی. ئێمە بەشی زۆری ڕاپۆرتە هەواڵەکە دەنووسین ئەگەر بێین گرنگترین شتەکان بخەینە پێشەوە، چونکە ئێمە دەزانین کە زۆربەی خوێنەران ئەو ڕاپۆرتە بە تەواوی ناخوێننەوە، ئەگەر شتێکی گرنگت لابێو بتەوێ بیدرکێنی، دوای ناخەی بۆ ماوەی پێنج خولەك.

یاساو ڕێسای ڕۆژنامەنووسی وای لێهاتووە کە بەشی زۆری ڕاپۆرتە هەواڵەکە بنووسرێت بەهۆی ئەوەوە کە گرنگترین شتەکان دابنرێ لە سەرەتای ڕاپۆرتەکەدا. هەندێ ڕاپۆرتە هەواڵ هەن لەم ڕێسایە دەردەچنو ڕوو دەکەنە بەکارهێنانی وروژاندنو ئارەزوو پەیداکردن بۆ بەردەوامبوون لەسەر خوێندنەوە بەهۆی ئەوەوە کە ئەو شتانەی زیاتر وروژێنەرو مەبەستن دەخرێنە کۆتاییەوە، یاخود شێوازی ڕێکخستنی کات بەکار دێنن لە ڕووداوەکاندا واتە کام ڕووداو پێشتر ڕووی داوە دەخرێتە پێشەوەو ئەنجا ئەوەی بە دوای ئەودا هاتووە باس دەکرێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم جۆرە ڕاپۆرتانە یا ڕاپۆرتی تایبەتن یا ڕووداوێکن جێگەی گرنگیپێدانی مرۆڤن.

یەکێك لەو هۆیانەی یارمەتیدەرن بۆ ئەوەی بە ڕوونیو بە جوانی بابەتێك بنووسی، ئەوەیە کە دڵنیا بیت لەوەی بزانی دەتەوێ چی بڵێی پێش ئەوەی بینووسی. ئەگەر هەر ناچاریش بووی ڕاپۆرتەکە زۆر کورت بکەیتەوە لەسەر کاغەز یا لە مێشکی خۆتدا پێش ئەوەی دەست بکەیت بە نووسینی. هەروەها لەسەر هەموو ڕۆژنامەنووسێك پێویستە پرسیار بکا لە خۆیو بڵێ: (گرنگترین شت کە پەیوەندیی هەبێ بەم ڕووداوە یا ئەو کردەوەیەوە کامانەنو بۆ زۆربەی خوێنەران گرنگییان چییە؟). تۆ هەر کە وەڵامی ئەم پرسیارەت دایەوە، ئیتر ماوەیەکی دوورت بڕیوە بەرەو نووسین بە سادەییو ئاسانی.

یەکێکی تر لەو مەسەلانەی بە بەردەوامی یارمەتی دەدەن لە نووسیندا ئەوەیە کە نموونەی دیاریکراوو سەرگوزەشتە بەکار بێنیتو ڕاستەوخۆ شت وەرگریتو ڕاناو یا ناوی تەواو لە



ڕاپۆرتە هەواڵەکەدا باس بکەیت نووسینەکەت تا چەندە لایەنی کەسیەتیی پێوە دیار بێ ئەوەندە توانا زیاتر دەبێ بۆ ئەوەی خەڵك زیاتر لێی تێبگاتو بچێتە مێشکییەوە.

دەبێ ئەوەش ئاشکرا بێ لات کە ئەگەر دەتەوێ خەڵك لە نووسینەکان تێبگات دەبێ وشەگەلێك بەکار بێنی زۆربەی خوێنەران لێی تێبگەن. ئەگەر ناچاریش بووی هەندێ وشە بەکار بێنی کە خەڵکی ئاسایی لێی تێنەگەن، ئەوا دەبێ لێکیان بدەیتەوە. ئەگەر ویستت بە زمانی ئینگلیزی بنوسی، ئەوا دەتوانی بە سادەییەکی زیاتر بنووسی لە ڕێگەی بەکارهێنانی ئەو وشانەوە کە لە ڕیشەدا دەچنەوە سەر ئینگلۆساکسۆنیو ئەو وشانە بەکار نەهێنی کە دەچنەوە سەر وشە لاتینییەکان کە ئاڵۆزترنو بە زەحمەت خەڵك لێیان تێدەگا، دیارە ئەمە بۆ زمانەکانی فەرەنسیو ئیسپانیو پورتوگالی وا نییە کە وشەی زۆری بە ڕیشەو بنەڕەت لاتینییان تێدایەو بوون بە بەشێك لە زمانەکان.

ئەگەر ڕستەی کورتت بەکار هێنا لە نووسیندا ئەوە بە شێوەیەکی باشتر خەڵك لێی تێدەگەن. لێکۆڵینەوە زانستییەکان لەسەر خوێنەرانی زمانی ئینگلیزی ئەوەیان سەلماندووە کە ڕستەکان چەندە درێژتر بن ئەوەندە بە زەحمەتتر مانا دەدەن بەدەستەوەو ئاڵۆزترن چونکە ڕستەی درێژ پێویستیی بە هەوڵی زۆرتر هەیە تا خەڵك لێی تێبگا. ئەگەر تۆ جارێك ڕستەیەکت نووسی ژمارەی وشەکانی زیاتر بوون لە بیستو پێنج وشە، دەبێ جارێکی تر بیخوێنیتەوە بۆ ئەوەی بۆت ڕوون ببێتەوە کە ئایا ماناکەی ئاشکرایە یا نا.

لە هەندێ کاتدا باشترین ڕێگە — بۆ دڵنیابوون لەوەی ئەوەی دەینووسی بە جۆرێکە خەڵك لێی تێدەگا یا نا — خوێندنەوەی نووسینەکەتە بە دەنگی بەرز، ئەگەر خۆت پێت نەکرا یەکێکی تر ڕاسپێرە بە دەنگی بەرز بۆت بخوێنێتەوە. پاش خوێندنەوە ئەگەر لێی تێنەگەیشتی ئەوا باشتر وایە جارێکی تر بینووسیتەوە بە شێوەیەکی سادەو ئاسانتر. لە واقیعدا بێژەرانی ڕادیۆو تەلەفزیۆن، مەرجە لەسەریان کە پەنا بەرنە بەر ئەم ڕێگەیە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ. ڕۆژنامەنووسانیش دەکرێ ئەم جۆرە یاسایە جێبەجێ بکەن لە کارەکەیاندا.

هەندێ لە زانایانو پیاوانی بواری فێرکردن لێکۆڵینەوەیان کردووە لەسەر (شایستەیی نووسین بۆ خوێندنەوە)، هەرچەندە بەشی زۆری لێکۆڵینەوەکەیان دەربارەی نووسینە بە زمانی

ئینگلیزی بەڵام ئەو ئەنجامە سەرەکییەی بۆیان دەرکەوتووە، دەکرێ بەسەر زمانەکانی تریشدا جێبەجێ بکرێ.

زاراوەی (شایستەیی نووسین بۆ خوێندنەوە)، وەك بەکاری دەهێنین لێرەدا واتا بە ئاسانی تێگەیشتن لە نووسین بەهۆی شێوازی نووسینەوە دەکرێ بەکاریش بهێنرێ بۆ دەرخستنی رادەی هاندانی خوێنەر لەو راپۆرتە هەواڵەدا. ئەوەی ئێمە مەبەستمانە ئاسانی لێتێگەیشتنە. مانای شایستەیی نووسین بۆ خوێندنەوە، ئەوەیە هەوڵ بدەی بابەتێك بنووسی کە خوێنەر بتوانێ بە ئاسانی لێی تێبگا.

هەندێ تاقیکردنەوە ئەنجام دراوە لە ئەنجامدا گەیشتوونەتە ئەوەی کە بتوانرێ رادەی ئاسانیو قورسیی نووسین بۆ تێگەیشتن روون بکاتەوە. ئەم تاقیکردنەوانە زۆربەیان تاقیکردنەوەن لە ئەمریکادا بەڵام فیکرەکە بە شێوەیەکی گشتی بۆ هەموو شوێنێك دەبێ، ئەویش ئەوەیە کە چەندە نووسینەکەت قورسو ئاڵۆز بێ، خوێنەرەکانی دەبێ رادەی خوێنەوارییان ئەوەندە بەرز بێ.

لەنێو ئەو تاقیکردنەوانەدا کە زۆر بڵاو بووەتەوە ئەوەیانە کە (روبرت جانینج) دایناوە لە ساڵی ١٩٦٨دا، ئەوەش تاقیکردنەوەیەکی ئاسانە، رەنگە تۆش حەز بکەیت ئەنجامی ئەم تاقیکردنەوەیە بزانیت ئەگەر بەسەر نووسینەکانی خۆتدا جێبەجێی بکەیت. (جانینج) ئەم تاقیکردنەوەیەی ناو ناوە (تاقیکردنەوەی تەمومژاوی)، واتە نووسینی قورسو ئاڵۆز نووسینێکی تەمومژاوییە، ئەگەر بتەوێ بە سادەو ئاسانی بنووسیت دەبێ ئەو تەمومژە بڕەوێنیتەوە. لە خوارەوە چۆنیەتیی بەکارهێنانی ئەم تاقیکردنەوەیە دەخەینە بەردەست:

١) چەند پارچەیەك لە نووسینەکانی خۆت هەڵبژێرە، هەر پارچەیەك بکە بە سەد وشە، هەر پارچەیەکیش بە جیا.

٢) تێکڕای درێژیی رستەکە دەربێنە، ئەمەش بە دابەشکردنی ژمارەی وشەکانی پارچەکە بەسەر ژمارەی رستەکانیدا.

٣) رێژەی سەدیی وشە قورسەکان دەربێنە، ئەمەش بەهۆی ژماردنی ژمارەی ئەو وشانەوە کە پێکهاتوون لە سێ بڕگە یا زیاتر (جگە لە ناوو ئەو پێکهاتە زمانییانەوە کە لە چەند وشەیەکی کورتو ئاسان پێکهاتوون لەگەڵ ئەو فیعلانەی بڕگەیەکیان بۆ زیاد کراوە).



٤) ئەنجامی تاقیکردنەوە تەمومژاوییەکە دەربێنە، ئەمەش بەهۆی زیادکردنی ئەنجامی بڕگەی ژمارە دوو لەسەر ئەنجامی بڕگەی ژمارە سێو ئەنجا بیدە لە ژمارەی چوار.

ئەو ئەنجامەی دەستت دەکەوێت ئاماژەیەکت دەداتە بەردەست بۆ رادەی خوێندنەوەی پێویست بۆ تێگەیشتن لەوەی نووسیوتە. ئەم رادەی خوێندنەوەیە، ئەو رادەی خوێنەوارییەیە کە پێویستە بۆ خوێندنەوەیەکی سەرکەوتووی ئەو پارچە هەڵبژێردراوە. ئەگەر بۆ نموونە رادەی چوارت بەدەست هێنا، ئەوە مانای ئەوەیە هەر کەس چوار ساڵی بردبێتە سەر لە خوێندندا دەبێ توانای ئەوەی هەبێ نووسینەکەت بخوێنێتەوە. ئەگەر رادەی دوانزەهەمت بەدەست هێنا، ئەوە مانای ئەوەیە ئەو کەسەی بابەتەکە دەخوێنێتەوە بە تێگەیشتنەوە، پێویستە دوانزە ساڵی بردبێتە سەر لە خوێندندا. ئەم رادەی خوێنەوارییە بەسەر خوێنەرانی ئەمریکاییدا جێبەجێ دەکرێ، رەنگە بە شێوەیکی راستەوخۆ جێبەجێ نەکرێ بەسەر خوێنەرانی وڵاتەکەتدا، بەڵام دەتوانی دڵنیا بیت لەوەی ئەگەر ئاماژەیەکت بەدەست هێنا کە پێکهاتبوو لە دوو ژمارە ئەوە مانای ئەوەیە کە تۆ راپۆرتە هەواڵێك دەنووسی تا رادەیەك خەڵك بە زەحمەت لێی تێدەگەن.

دیارە زۆر شتی تر هەن کە دەبێ لە بەرچاو بگیرێن ئەگەر بمانەوێ خوێنەر لە نووسینەکانمان تێبگا. هەندێ لەو شتانەش لەژێر دەسەڵاتی رۆژنامەنووسدا نییە بەڵام هەر دەبێ لێرەدا باسی بکەین. یەك لەوانە بۆ نموونە خوێنەر حەز لە خوێندنەوەی لاپەڕەی سەرنجڕاکێشو حەز لە دەرهێنانێکی (اخراج) وا دەکەن لە رۆژنامەکەدا سەرنجیان رابکێشێ هەروەها حەز دەکەن لە وێنەی جۆراوجۆر، ئیتر وێنەی راستی بێت یا، هێڵکاری بۆ روونکردنەوە، لەگەڵ بەکارهێنانی رەنگەکاندا ئەگەر بکرێ. دیارە ئەگەر رۆژنامەکە بە پیتی گەورە چاپ کرابێ خوێندنەوەی ئاسانترە، بەڵام لە زۆر کاتدا، بەشێکی زۆری رۆژنامەکان، پیتی بچوك بەکار دێنن بۆ ئەوەی بابەتی زۆر لە رۆژنامەکەدا جێی بێتەوەو کاغەزی کەم بەکار بێنن. ئەو رۆژنامەو گۆڤارەی تۆ کاری تێدا دەکەیت، رەنگە بە سادەییو بە ئاسانی خوێندنەوە بخاتە لاوە، ئەگەر جۆرە پیتێك بەکار بێنێ کە عەزیەتی ئەو کەسانە بدات دەیخوێننەوە. هەروەها پێویستە لەسەر رۆژنامەنووس، بەلای کەمەوە، خۆی بپارێزێ لە نووسینی بڕگەی دوورودرێژ لەوانەی خەڵك بێزار دەکەن لە خوێندنەوە.

هەموو رۆژنامەنووسان رێزێکی گەورە دادەنێن بۆ خۆیانو ئەو بابەتانەی دەینووسن. بابەتێکی خۆشە ئەگەر لە حاڵەتی چەند رۆژنامەنووسێك بکۆڵێتەوە، ئەوکاتە بۆت دەردەکەوێ کە چۆن هەریەك لەوانە وا هەست دەکەن کە (گرنگترین شتیان) لایە کە بیلێنو بینووسن. ئێمە باوەڕمان وایە کە دەتوانین راپۆرتە هەواڵێك بنووسین کە پێکهاتبێ لە سێ هەزار وشە لە حاڵەتێکدا کە پێویستە بۆ هەر کەسێکی تر کە تەنیا پێنج سەد وشە بەکار بێنێ لەو راپۆرتەدا. لە راستیشدا ژمارەیەکی زۆر کەم راپۆرتە هەواڵ هەن کە پێویستیان بە سێ هەزار وشە هەبێت.

تۆ دەتوانی شتێکی زۆر بڵێیت بە تەنیا بەکارهێنانی چەند سەد وشەیەك ئەگەر وشەکان وا لێبکەیت کە هەر کامیان قورساییو مانای خۆیان هەڵگرنو بە وردیو لەسەرخۆ بابەتەکە بنووسیت. بەڵام ئەوەی پێویستە لە بەرچاوی بگریت ئەوەیە ژمارەیەکی زۆر کەم هەن لە خوێنەران زیاتر لە چەند سەد وشەیەك بخوێننەوە لەو پەخشانەی تۆ دەینووسیت. تەنیا ئەو کەسانە بێنەرە پێش چاوی خۆت کە لە پاسە گشتییەکاندان یا لە هۆڵەکانی چاوەڕوانیکردندان وەك لە سەرەتای ئەم بەشەدا ئاماژەمان پێکرد. ئەوانە کارێکی زۆریان هەیە سەرقاڵی کردوونو زۆر شوێنیان هەیە دەیانەوێ بۆی بچن. رەنگە ئەو بابەتەی تۆ دەینووسیت لە ریزی پێشەوەی لیستی ئەو رووداوە گرنگانەی ژیانی رۆژانەی ئەواندا نەبێت. با هەموو کاتێکیش ئەم راستییەت لە خەیاڵدا بێت کە بە سادەو ئاسانیو ئاشکراو بە شێوەیەك کە خوێنەر بۆی بخوێنرێتەوە دەربارەی ئەو بابەتانەی گرنگە بەلایانەوە بنووسیت. ئەمەش باشترین شتێکە کە پێت دەکرێ بیکەیت بەڵام کارێکی ئاسان نییە.

---

**سەرچاوە**

1. From his book The Technique of Clear Writing (New York: McGraw Hill, 1968).

# بەشی حەوتەم

## بەدواداچوون و بەسەرکردنەوەی راپۆرتە هەواڵە قورسەکان

نووسینی: أ. ل. هستر

کۆمەڵەکە پێکهاتبوو لە ژمارەیەك لە نووسەرانو رۆژنامەنووسانی ئاژانسەکانی دەنگوباسو سەرنووسەران، لە یەکێك لە ئوتێلەکانی پایتەختی تونسدا، کاتێکی پڕ لە خۆشیو شادییان دەبردە سەر، بەدەم هەڵدانی شەرابی ساردو ئاوی میوەوە. چەند کاتژمێرێك بوو سیمینارەکە کۆتایی هاتبوو، بەڵام کۆمەڵەکە هەر خۆیان دوادەخستو خاوەخاویان دەکرد لە ژووری ئوتێلەکەداو حەزیان نەدەکرد ئەو قسەی خۆشو هاوڕێیەتییە کۆتایی بێت. لە دەرەوەی ئوتێلەکەشدا مانگی چواردە تیشکی زیوینی بڵاو کردبوویەوەو شنەبای شەو یاریی دەکرد لەگەڵ پەلوپۆی دارخورماکانداو دەنگێکی لەسەرخۆو هێواشی لێوە دەهات. گفتوگۆ ماوەیەکی کەم راوەستا.

دەنگی رۆژنامەنووسێکی ئەفریقایی بێدەنگییەکەی کۆتایی پێهێناو بەدەم بیرکردنەوەوە گوتی: ئێوە دەزانن کە من حەز دەکەم ئەگەر هەلێکم دەستکەوێ بتوانم گەلێك راپۆرتە هەواڵی وا بنووسم کە ئێستا لە توانامدا نییە بیاننووسم. مەبەستم ئەو جۆرە راپۆرتانەیە کە کاربەدەستان نیگەران بکاو ئەوەی کە روو دەدا بە راستی بیخاتە بەر دەستو چاوی خەڵك. ئێمە هەموومان سەرمان بۆ لەقاند وەك نیشانەی رازیبوون لەسەر جێبەجێکردنی بیرۆکەکەی. لە راستیدا هەموو رۆژنامەنووسان چ ئەوانەی لە وڵاتانی پێشکەوتوودان یا ئەوانەی وڵاتە دواکەوتووەکان، هەردوولا هاوبەشن لە هەوڵی ئەوەدا رێگەیەك بدۆزنەوەو بتوانن ئەو هەواڵو راپۆرتانەی ناتوانن نزیکیان بکەونەوەو باسیان بکەن بیانخەنە بەردەست خوێنەرانو خەڵك.



یەکێك لە دانیشتوان پرسیاری کرد، بۆچی بیروڕا ئاڵوگۆڕ نەکەین دەربارەی ئەو رێگەو هۆیانەی بەکاریان دێنین لە بەدواداچوونو بەسەرکردنەوەی راپۆرتە هەواڵە قورسەکاندا؟

ئەوەی لەم بەشەدا باس دەکرێت ژمارەیەکە لەو پێشنیارانەی رۆژنامەنووسو سەرنووسەرەکان پێشکەشیان کرد بۆ یارمەتیدانی کەسانی تر لە گێڕانەوەو باسکردنی ئەو هەواڵانەی هەستیارو ناسکنو پێویستیان بە بەسەرکردنەوەیە. تەنانەت هەندێ جار لەو حاڵەتانەشدا کە رۆژنامەنووسان بەشێکی دانەبڕاون لە سیستمی رۆژنامەگەریی دەوڵەت، زۆر حەزیان لەوەیە رێگەیان بدرێ جۆرە هەواڵێك بنووسن کە بە هەر شێوەیەك بێت هەڕەشەیەك بگەیەنێت بۆ بەرپرسە گەورەکان یا حیزبە سیاسییەکان یا دەزگا گرنگەکان لە وڵاتەکەیاندا، زۆر جاریش بڵاوکردنەوەی ئەم جۆرە هەواڵانە نابنە هۆی رووخانی حکومەتی نیشتمانی یا هەڕەشە لەسەر رەوایەتیی ئەو حیزبەی دەسەڵاتی بەدەستەوەیە.

بەڵام یەکێك لەو حەقیقەتانەی کە لە ژیاندا هەن ئەوەیە سەرکردە نیشتمانپەرستەکانی وڵاتانی پێشکەوتوو و تازەپێگەیشتوو حاڵەتێکی نەخۆشیی گومانکردنیان لەگەڵدایە کە لایان وایە رۆژنامە وا دەیانخاتە پێش چاوی جەماوەر کە کەم عەقڵو هیچ نەزانن، یاخود ئەو بەرنامەیەی باوەڕیان پێیە بە ئاشکرا لە بەرچاوی خەڵکو لەسەر لاپەڕەی رۆژنامەکان بە سووکی سەیر دەکرێن.

لەسەر هەر رۆژنامەنووسێکی سەرکەوتوو پێویستە لە هەر کوێ ئەرکی کۆکردنەوەی هەواڵو نووسینیان ئەنجام دەدەن، هەوڵ بدەن بگەن بە رێگەو شێوازێك کارامەییو لێوەشاوەیی پێوە دیار بێ، بۆ ئەوەی ئەو هەواڵانەی پەیوەندییان هەیە بە هەندێ کاری هەستیارو ناسکەوە بیکەن بە وشەو قسەی نووسراو. بیروبۆچوونی ئەو کۆمەڵە رۆژنامەنووسە کە ئەو شەوە لە تونس بە یەکەوە بوون لەو سیمینارەی سەر بە (بزووتنەوەی وڵاتانی بێلایەن)، هەموو چونیەك بوون لەوەدا کە لە بەشی هەرە زۆری وڵاتاندا، رێگەی بڵاوکردنەوەی ئەو راپۆرتە هەواڵانە هەیە کە بۆ یەکەمجار وا دەزانرێ ناتوانرێ بڵاو بکرێنەوە.

دیارە ئەو رۆژنامەنووسانەی لەژێر سێبەری سیستمێکدا دەژین کە بە هیچ جۆرێك رێگە نادا بە ئازادی رادەربڕین، ئەوە ئارەزووی خۆیان نییە لەو بابەتەدا کە دەینووسن، بەڵام زۆربەی رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم بەڵکو ژمارەیەك لە رۆژنامەنووسانی جیهانی دووهەمو وڵاتە

سۆشیالیستەکانیش ئەوە دووپات دەکەنەوە کە هەندێ سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە لە نووسین لەسەر ئەو بابەتانەی کە ناکرێ توخنیان بکەون یا باسیان بکەن. خوێنەرانی ئەم بەشە لەو رۆژنامەنووسانەی خۆیان باشتر بارودۆخەکەیان هەڵدەسەنگێنن، دەتوانن ئەوە دیاری بکەن کە ئایا لە توانایاندایە هەندێ لەو رێگەیانە بەکاربێنن. تەنانەت ئەگەر نەشتوانن ئەو رێگەیانەی دەخرێتە بەردەمیان بە شێوەیەکی راستەوخۆ بەکار بێنن، ئەوە تەنیا گفتوگۆکردن لەسەر چۆنیەتیی نووسین لەسەر ئەو بابەتە قورسو هەستیارانە پاڵیان پێوە دەنێ بۆ بیرکردنەوە لە دۆزینەوەی چەند رێگەو شێوازێکی نوێ بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی باشتر خوێنەرانیان ئاگادار بکەنەوە.

هۆی سەرەکی بۆ ئەوەی دەسەڵاتداران رێگە دەگرن لە بڵاوبوونەوەی هەندێ بابەتی هەستیار، ئەوەیە کە ئەوان باوەڕیان وایە ئەو بابەتانە هەڕەشەیەکە لەسەر دەسەڵاتەکەیان بە شێوەیەك لە شێوەکان. کاتێك کە یەکێك لە رۆژنامەنووس یا سەرنووسەرەکان هەست بەوە بکەن مەسەلەیەك هەیە پێویستی بەوەیە بخرێتە روو و باس بکرێو لە هەمان کاتدا دەزانێ زۆر زەحمەتە بڵاو بکرێتەوە، ئەوە دەبێ لە خۆی بپرسێ بۆچی وا دەردەکەوێ کە هەڕەشەی تێدایەو هەڕەشەکە لە کوێیدایە؟ کەم کەس هەیە ئەوە پەسەند بکا کە رۆژنامەیەك هێرش بکاتە سەریو گومان دروست بکا لای خەڵك لە دەسەڵاتو زیرەکیو باشیو چاکەی ئەو. ئەو رۆژنامەنووسانەی چەند رێگەیەك دەگرنە بەر لە نووسیندا کە رووبەڕووبوونەوەی پێوە دیارەو بە ئاشکرا دوژمنایەتیی خۆیان دەردەبڕن. ئەوە هیچ بوارێك ناهێڵنەوە بۆ ئەوەی هەواڵی زۆریان دەسکەوێ، بە تایبەت لەو وڵاتانەدا کە رۆژنامەگەری کۆتو بەندێکی زۆری لەسەرە.

سەرچاوەکانی هەواڵو کارمەندە دەوڵەتییەکان، هاتو هاواریانە لەدەست ئەوانەی لە رۆژنامەکاندا کار دەکەنو دەڵێن ئەوانە کاریان هەر ئەوەیە بگەڕێن بە دوای هەواڵی ناخۆشو خراپو ئەو هەواڵانەی جێگەی مشتومڕو ناکۆکینو لە هەمان کاتدا چاویان دەنووقێنن لە ئاستی ئەو هەواڵانەی باس لە چالاکییە باشەکانو دەسکەوتەکان دەکەن. رۆژنامەنووسەکانیش ئەم تۆمەتو قسەیە رەت دەکەنەوەو دەڵێن، سەرچاوەکانی هەواڵو کاربەدەستەکان تەنیا ئەو بابەتەیان دەوێ بڵاو بکرێتەوە کە خزمەتی بەرژەوەندیی خۆیان دەکاو وا دەیانخاتە پێش چاو کە کۆمەڵە مرۆڤێکی پاكو پیرۆزو بلیمەتن. بەڵام ئەگەر بۆمان هەبێ گفتوگۆ بکەین لەسەر

چۆنیەتیی بڵاوکردنەوەی هەواڵ لەسەر چەند بابەتێکی گرنگو ناسك، دەبێ گرنگیی بدەین بە سەرچاوەکانی هەواڵو ئەو کەسانەی دەسەڵاتی ئەوەیان هەیە فەرمان بدەن بە بڵاوکردنەوەی بابەتێك یا لێقرتاندنی یا پشتگوێخستنی.

پاشان ئەو گرنگییە گەورەیەی ڕۆژنامەگەریی ڕۆژاوا دەیدا بە لایەنە خراپو ناتەواوەکان، قورساییەك دەدا بەو ڕەخنانەی سەرچاوەکانی هەواڵ ئاراستەیان دەکەن. لە بەشی تایبەت بە ڕۆژنامەی بواری لێکۆڵینەوە ئاماژە دەکەین بەم مەسەلەیە، بەڵام لێرەدا هەر تەنها ئاماژە دەکەین بەوەی کە زۆرێك لە ڕۆژنامەنووسان هەست دەکەن بەوەی کە کاتی خۆیان بەفیڕۆ دەدەن ئەگەر لێکۆڵینەوە بکەن لەسەر مەسەلەیەك بەتەمای ئەوەی پەنجە بخەنە سەر جەمسەری گەندەڵیو تاوانو هیچ لەباردانەبوویی، یا کارێکی نەگونجاو لەگەڵ ڕەوشتدا، دواتر لەبری ئەوە دەبینن کەسانێکی پاکیان لە بەردەمدایە کارەکانیان بە ڕێکوپێکی رادەپەڕێنن لەگەڵ بارودۆخی ناهەمواردا. ئەمەش جۆرێکە لە نەخۆشیی کوێری. چونکە ئەوە مەسەلەیەکە زۆر شایانی ئەوەیە بکرێ بە هەواڵ کە ناوبەناو بۆمان دەربکەوێ دامودەزگای دەوڵەت بە ڕاستی کار دەکا یاخود تاکەکەسێك وەك پێویست کارەکەی ئەنجام دەدات، یا یەکێك لە سەرکردەکان کەسێکی پاكو ڕاستگۆیە.

ڕۆژنامەنووسان بە گومانەوە دەڕواننە ڕەوشتی مرۆڤو پاساویش بەوە دەهێننەوە کە جەماوەر تەنیا گرنگی دەدەن بە هەواڵی ئەو (هەرچیو پەرچی)یانەی کە دەگێڕێنو گرنگی نادەن تەنیا بەوە نەبێ کە خراپەو خراپەکاری بڵاو بووەتەوە لە ئێستادا، بەڵام هەواڵی باشو بەکەڵك، دەکرێ هەندێ خاڵی وای تێدا بێ لەسەر سەرکردە لێهاتووە دڵسۆزەکان، یا دەربارەی ئەو ڕووداوانەی باس لە تێکۆشانی خەڵکی ئاسایی دەکەن لە پێناوی مانەوە لە بارودۆخێکی قورسو ناهەمواردا.

ڕەنگە بیرۆکەی سەرەکی بۆ چۆنیەتیی باسکردنی هەواڵە ناسكو هەستیارەکان ئەوە بێ کە تۆ توانای ئەوەت هەبێ، ئەو کەسانەی جڵەوی کاریان بەدەستەوەیە وا لێبکەیت، باوەڕ بکەن بەوەی ئەو هەواڵانە هیچ گومانێك لای خەڵك دروست ناکەن دەربارەی ڕەوایەتیی ئەوان یا بەرژەوەندیی‌گشتی، بڵاوکردنەوەی ئەو جۆرە هەواڵانە کارێکی ئاسان نییە، چونکە بەهۆی ئەو



نووسینەوە هەندێ کەس ڕادەکێشی بەلای خۆتداو هەندێکی ترت لەکیس دەچێ، بەڵام بڵاوکردنەوەکەی، خۆی سەرکەوتنێکە.

ڕۆژنامەنووس لەسەریەتی ئەوە بزانێ کە بەشی زۆری ئەو دوژمنایەتییەی ڕووبەڕووی دەبێتەوە، لە ئەنجامی هەڵوێستی ئەو ڕۆژنامانەن کە لافی خواپەرستیو پاکیەتی لێدەدەنو لە هەندێ وڵاتدا پەیامێکی تایبەتیان بۆ خۆیان داناوە کە خۆیان داویانەتە پاڵ خۆیان، ئەو پەیامەش بریتییە لەوەی بە تەنیا خۆیان بڕیار بدەن بەسەر خەڵکدا کێ چاکەو کێ خراپەو بەرژەوەندیی تەواوی میللەت کامەیە. ڕۆژنامەش هەڵوێستێکی بێخەمانە دەگرێو لە پشت ڕیزەکانی خەڵکەوە ڕادەوەستێ بۆ کێشانو هەڵسەنگاندنی کاروباری دەوڵەتو باری ئابووریو... هتد. کەچی خۆی ئاگای نییە لە کێشەو گرفتەکانی سەرکردایەتیو ئەو کۆسپانەی دێنە ڕێگەی.

ئێمە دەتوانین بەیەکەوە ئەو هاواری تووڕەییە توندوتیژە بێنینە پێش چاوی خۆمان کە ئەگەر یەکێك لە حکومەتەکان — بۆ نموونە — گروپێك پێکبێنێ بۆ لێکۆڵینەوە لە بارودۆخی یەکێك لە ڕۆژنامە گەورەکان. کە چۆن بڵاوکەرەوەی ڕۆژنامەکە تووڕە دەبێو دەڵێ: بە چ مافێك ئێوە خۆتان کردووە بە دادوەرو بڕیار دەدەن لەسەر ئەو شێوازەی ئێمە ڕۆژنامەکەمانی پێدەبەین بەڕێوە؟، کێ ئەو مافەی داوە بە ئێوە خۆتان دابنێن بە دادوەرو بڕیار بدەن لەسەر ئەو ڕێگەیەی دەیگرینە بەر لە خزمەتکردنی خوێنەرانو ئەو کەسانەی ئاگاداری بڵاو دەکەنەوە لە ڕۆژنامەکەماندا؟ چۆن بۆتان هەبێ ئێمە فێری ئەوە بکەن بەرژەوەندیی گشتی کامەیە؟.

ئەگەر ڕۆژنامەنووس یا سەرنووسەر توانای ئەوەی هەبێ کە خۆی دابنێ لە شوێنی ئەو کەسانەدا، هەوڵی بەڕێوەبردنی وڵاتێك یا کۆمەڵگەیەك، یا کۆمپانیایەکی بازرگانی، یا ڕێکخراوەکانی تر دەدەن، ئەوا وای لێدەکا زیاتر لە مەسەلەکە تێبگاو بە شێوەیەکی گەورەتر هاوسۆز بێ لەگەڵ ئەو سەرچاوانەی هەواڵدا. هەموو ئەمانەش کە باسمان کردن مانای ئەوە نییە کە ڕۆژنامەنووسان پێویست نییە لەسەریان هەوڵ بدەن بۆ ئەوەی ڕاپۆرتە هەواڵی ورد بنووسن لەسەر بارودۆخی کۆمەڵگەو میللەتەکەیان. ئێمە تەنیا دەمانەوێ ئەوە بڵێین کاتێك لەسەر چالاکییەکان دەنووسن هەردوو لایەنەکەیان لە بەرچاو بێو تەنیا بەوە واز نەهێنن کە لایەنی سەرنەکەوتنو هەواڵە خراپەکان بخەنە ڕوو.

ڕۆژنامەنووس لە جیهانی سێیەمدا بە شێوەیەکی تایبەت پێویستی بەوە هەیە ئەو ڕێگەیانەی دەیگرێتە بەر بۆ کۆکردنەوەی هەواڵ باش بن‌و هاوسۆز بێ لەگەڵ سەرچاوە هەواڵییەکانیدا، چونکە زۆرجار ئەوان پێویستیان بە ئەزموون هەیە لە سەرکردایەتیداو دەبێ ڕووبەڕووی زۆر کێشە ببنەوە، ئەو وڵاتانەی ڕادەیەکی باش بارودۆخیان سەقامگیر بووە، سەرکەوتوون بەسەر ئەو کێشانەدا.

پێویستە لەسەر ڕۆژنامەنووس لە کاتێکدا کار دەکا لە پیشەکەی خۆیدا، ئاگاداری ئەوە بێ ئەگەر سەرچاوەکانی هەواڵەکانی هەستیان کرد بەوەی دەیەوێ بەکاریان بێنێ بۆ مەبەستێکی تایبەت یاخود دەیەوێ یارییان پێبکا، ئەوە ئەگەری تووڕەبوون‌و هاوکاری نەکردنیان دوور نییە. هەموو ڕۆژنامەنووسێك ویژدانی خۆی بکا بە دادوەر لەو ڕێگەو شێوازانەی بەکاریان دێنێ بۆ بەدەستهێنانی هەواڵەکانی‌و چۆنیەتیی هەڵسوکەوتکردنی لەگەڵ سەرچاوەکانی هەواڵەکانیدا. هەندێ لەو ڕێگەیانەی کە لە پاشماوەی ئەم بەشەدا باس دەکرێن‌و تایبەتن بە هەوڵی بڵاوکردنەوەی هەندێ هەواڵ‌و مەسەلەی گرنگەوە ڕەنگە بڕێك یاریکردن‌و دەسکاری تێدابێ. لەم حاڵەتەدا ئەگەر سەرچاوەی هەواڵ یا بەرپرسەکە هەستی کرد بەوەی ڕۆژنامەنووسەکە بە ئەنقەست‌و بە خوێن ساردییەوە پەنای بردووەتە بەر ئەم ڕێگەیە ئەوا هەموو شتێك بزر دەبێ. تەنانەت لە کاتێکدا پەنا دەبرێتە بەر بەکارهێنانی ئەم جۆرە ڕێگەیانە کە تایبەتن بە هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ سەرچاوەکاندا، هێشتا هەندێ مەترسی هەیە لەوەدا کە خراپ بەکاربهێنرێن. لەسەر هەموو ڕۆژنامەنووسێك پێویستە خۆی بڕیار بدا چ ڕێگەیەك بەکەڵکی ئەوە دێ بەکاری بێنێ لەگەڵ سەرچاوەکانی هەواڵداو لەگەڵ ئەوانەی لەسەر کورسیی دەسەڵات دانیشتوون.

زۆرجار بەرپرسێکی گشتی کە بەتەمای ئەوەیە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵدا بکرێ لەلایەن ڕۆژنامەنووسێکەوە، چەند پرسیارێك لە خۆی دەکا — بە ئاگاییەوە یا بە بێ ئاگایی —. ئەگەر ڕۆژنامەنووس تێگەیشت لەوەی کە ئەم پرسیارانە خۆی شاردووەتەوە لە پشتی عەقڵی سەرچاوەکەوە ئەوە دەتوانێ چارێکیان بکا.

یەکێك لەو پرسیارانەی کە دەبێ سەرچاوەکە یا ئەو بەرپرسە حکومەتییەی ڕەزامەندی پیشان دەدا لەسەر قسەکردن دەربارەی یەکێك لە مەسەلەکان ئەوەیە کە لە خۆی دەپرسێ: تۆ



بڵێی بەم چاوپێکەوتنە لەگەڵ ڕۆژنامەکەدا، ئەو ڕێزو نزیکییەم لەکیس بچێ کە هەمە لای بەرپرسەکانی سەرووی خۆم یا تۆ بڵێی لادەبرێم لەسەر پۆستەکەم‌و کارەکەم لەکیس بچێ؟. لە هەندێ وڵاتدا ڕەنگە بڵاوکردنەوەی هەندێ هەواڵ زیانێکی گیانی بگەیەنێ بە سەرچاوەکە، دوور نییە تووشی کوژرانیش ببێ، لەبەر ئەوە دەبێ ڕۆژنامەنووس هەموو کات ئاگاداری ئەم حاڵەتە زۆر ترسناکانە بێ. ئەگەر ئەم جۆرە هەواڵانە مەترسیدار بن تا ئەو ڕادەیە بۆ سەرچاوەکان ئەوە بۆ ڕۆژنامەنووسەکەش بەو ڕادەیە مەترسیی هەیەو، حیکمەت‌و ژیریش نییە لەوەدا ڕۆژنامەنووسێك ببێ بە (پاڵەوانێکی مردوو) یا سەرکەوتنیش بەدەست بێنێ لە بڵاوکردنەوەی ئەو هەواڵەدا کە دەیەوێ، بە سەدان هەواڵی تر دەمێننەوە بێ ئەوەی بەرگوێی کەس بکەون ئەگەر ڕۆژنامەنووسەکە نەژی بۆ ئەوەی لە ڕۆژێکی تردا هەواڵێك بنووسێ.

کاتێك ڕۆژنامەنووس بیەوێ ڕاپۆرتە هەواڵێکی گرنگ‌و هەستیار بنووسێ، دەبێ توانای ئەوەی هەبێ وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە سەبارەت بەو هۆیانەی پاڵ دەنێن بە سەرچاوەکەوە بۆ ئەوەی هاوکاری بکا لەگەڵیدا. هەندێ لەو هۆیانەی دەکرێ ڕۆژنامەنووس بەکاریان بێنێ بۆ ئەوەی سەرچاوەی هەواڵەکە قاییل بکا قسە بکا لەگەڵیدا، ئەوەیە سەرچاوەکە وا لێبکا باوەڕ بکا بەوەی ئەو چاوپێکەوتن‌و گفتوگۆیە یارمەتیی دەدا بۆ باسکردنی ئەو کارانەی ئەنجامی دەدا. ڕۆژنامەنووس دەشتوانێ بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بۆ سەرچاوەکە ڕوون بکاتەوە کە ئەرکەکەی ئاسانتر دەبێ ئەگەر ڕاپۆرتە هەواڵێکی ورد لەسەری بڵاو بکرێتەوە.

لە حەقیقەتدا ئەو ڕاپۆرتە هەواڵانەی بە شێوەیەکی جوان‌و ڕێکوپێك دەنووسرێن لەسەر ئەو مەسەلانەی پەیوەندییان هەیە بە بەرژەوەندیی گشتییەوە نرخ‌و بەهایەکی ڕۆشنبیرانەیان هەیە بە تایبەتی لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا. هەروەها سەرچاوەی هەواڵ دەتوانێ زانیارییەکان بخاتە بەردەست لە ڕێگەی ئەو ڕاپۆرتە هەواڵانەوە کە جەماوەری خوێنەران پێویستیی زۆریان هەیە بە خوێندنەوەی. گەلێك لە سەرکردەکان زۆر حەز دەکەن لەوەی جەماوەر ئاگادار بکەنەوە لە بەرنامەو پرۆژەکانیان. ڕۆژنامەنووسیش دەتوانێ ئەوە ڕوون بکاتەوە بۆ سەرچاوەی هەواڵ کە بڵاوکردنەوەی هەواڵ هەلێکی دەخاتە بەردەم بۆ خۆ ڕۆشنبیرکردن.

یەکێك لەو ڕێگەیانەی کە هەندێ جار سەردەکەوێ لەوەدا سەرچاوەی هەواڵ قاییل بکا، زانیاریی لێوەربگیرێ دەربارەی ئەو بابەتانەی بوونەتە جێگەی ناکۆکی‌و مشتومڕ، ئەوەیە

رۆژنامەنووسەکە سەرچاوەی هەواڵەکە دڵنیا بکاتەوە لەوەی راپۆرتە هەواڵەکە هەلی ئەوەی بۆ دەرەخسێنێ هەڵویستو بیروبۆچوونی خۆی بخاتە روو لەو بارەیەوە. سیاسییەکان بە شێوەیەکی تایبەت دەیانەوێ بابەتەکان لە گۆشەنیگای خۆیانەوە بگێڕنەوە کاتێك کە نەیارەکان بیروبۆچوونی خۆیان باس کردووە.

هەندێ سەرچاوە یا ئەو کەسانەی دەسەڵاتیان بەدەستەوەیە زۆر حەز دەکەن لەوەی کە دێنە سەر باسی پرۆژەو کارەکانیان بە گیانێکی بەخشندەییو خۆش ویستنی کەسانی ترەوە دەکەونە قسەکردن. رەنگە ئەوانە بە راستی حەز لەوە بکەن کە خزمەتی میللەتەکەیان بکەن. ئەو راپۆرتە هەواڵانەی بە شێوەیەکی ورد بەرنامەو چالاکییەکان دەخەنە روو، یارمەتیدەرن بۆ جێبەجێکردنی هەموو ئارەزووەکانیان لە خزمەتکردنی میللەتەکانیاندا بە لێبوردوویی. دیارە رۆژنامەنووس یا سەرنووسەر سروشتی مرۆڤیان تاووتوێ کردووەو دەزانن کە زۆربەی مرۆڤ تێکەڵن لە رەوشتی باشەو خراپەو لە پاڵنەری خۆپەرستیو بەخشندەییدا بەڵام هۆیەك نییە بۆ ئەوەی وا دابنێین — لە هەموو حاڵەتێکدا — سەرچاوەی هەواڵ لە ناخیدا خۆپەرستە یا کەسێکی شەڕەنگێزە. پاش زیاتر لە سی ساڵ کە لە رۆژنامەوانیدا بردوومەتە سەر بە نووسەریو سەرنووسەری، باوەڕم هاتووەتە سەر ئەوەی رێژەی رەوشت باشی لای سەرکردەو بەرپرسان هەمان رێژەیە کە هەیە لای هاووڵاتییانو رۆژنامەنووسانداو هیچ مرۆڤێك نییە هەموو رەوشتێکی هەر باش بێ یا هەر خراپ بێو هیچ مرۆڤێك نییە هەمووی زیرەکی بێتو یەکێکی تر هەمووی کەودەنی بێت.

ناوبەناو پێویستە لەسەر رۆژنامەنووس گفت بدا بە سەرچاوەی هەواڵەکان کە لە راپۆرتەکەیدا ناوی راستەقینەی بڵاو ناکاتەوە. ئەگەر ئەو سەرچاوەیە باوەڕی پەیدا کرد کە رۆژنامەنووسەکە قسەکانی دەگێڕێتەوە بە بێ ئەوەی ناوەکەی ئاشکرا بکات، رەنگە هەندێ زانیاریی گرنگی بخاتە بەردەست بەڵام ئەگەر رۆژنامەنووسێك یا سەرنووسەرێك گفتی دا بە ئاشکرانەکردنی سەرچاوەی هەواڵەکان، دەبێ رێز لەو گفتەی خۆی بگرێت. خۆ ئەگەر گفتەکەی نەبردە سەر، ئەوە رەنگە سەرچاوەکە کارەکەی خۆی لەکیس بچێت یا تەنانەت ژیانیشی بکەوێتە مەترسییەوە. ئیتر ئەو رۆژنامەنووسە ناتوانێ جارێکی تر هەواڵی لەو سەرچاوەیەوە چنگ بکەوێ کە متمانەی پێنەماوە. ئەو نووسەرو سەرنووسەرانەی پابەندی گفتەکانی خۆیان



نابن لە پاراستنی سەرچاوەی هەواڵەکانیاندا، ئەوە پەستو نزمترین کەسن، چونکە مەبەستو ئامانج نابنە پاساو بۆ گرتنەبەری هەموو رێگەیەك.

رۆژنامەنووسو سەرنووسەرانی جیهانی سێ دەبێ ئاگایان لە خۆیان بێ بە تایبەتی لەو کاتانەدا کە گفتو پەیمان دەدەن ناوی ئەو سەرچاوەیە نەهێنن کە هەواڵەکانیانی لێوەردەگرن، چونکە تەنانەت ئەگەر بە ناوی خۆشیان ناو نەبرێن، ئەگەری ئەوە هەیە زۆرجار بناسرێنەوە، لەبەر ئەوەی ژمارەی ئەو کەسانەی ئاگاداری هەواڵە گرنگەکانن زۆر کەمن. زۆر لە دەوڵەتانی جیهانی سێ چەند سەد کەسێك دەیانبەن بەڕێوەو ئاسانە ناوی ئەو کەسە ئاشکرا بکرێو بدۆزرێتەوە کە ئەو هەواڵە گرنگانەی گەیاندووە بە خەڵكو خوێنەرانو، گەورە بەرپرسانی وڵاتە بچووکەکان دەتوانن سەرچاوەی ئەو هەواڵانە دەستنیشان بکەن.

رۆژنامەنووس یا سەرنووسەر دەبێ ئەوەیان لە بەرچاو بێ کە ئەگەری ئەوەش هەیە ناچار بکرێن بۆ ئاشکراکردنی سەرچاوەی هەواڵەکانیان. ئێمە زۆر نموونەی ئەو حاڵەتەمان بینیوە لە وڵاتەکانی ئەوروپای رۆژاوادا کە دادگاکان رۆژنامەنووسانیان ناچار کردووە سەرچاوەکانی هەواڵیان ئاشکرا بکەن، ئەگەر نا خۆیان دەخرێنە بەندیخانەوە. نەك هەر ئەوە بەڵکو چەندەها هۆی تر هەن بۆ ناچارکردنی رۆژنامەنووسان لەسەر ئاشکراکردنی سەرچاوەی زانیارییەکانیان، لە سێبەری سیستمە فاشیستییەکاندا.

هەندێ رۆژنامەنووس لە جیهانی سێهەمدا، چانسیان باشە لەوەدا کە هەواڵێکی گرنگ بڵاو دەکەنەوە، جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە ناوەرۆکی هەواڵەکە لە رووبەڕووبوونەوە بچێ زیاتر لەوەی کێشەیەکی مەترسیدار بێت، چونکە وشەی کێشە هەر ناوهێنانەکەی مانای ئەوەیە کە شتێکی خراپەو جۆرە هەڕەشەیەکی تێدایە بۆ ئەوانەی دەیانەوێ چارەسەری بکەن. ئەگەر پێیان بگوترێ ئەو رۆژنامەنووسە دەیەوێ چاری ئەو رووبەڕووبوونەوەیە بکا، لەو کاتەدا سەرچاوەکان کەمتر گرژ دەبن بەرامبەر هەواڵەکە.

یەکێك لە رۆژنامەنووسەکانی جیهانی سێ زۆر بەختەوەر بوو لە بەکارهێنانی ئەم شێوازەدا، کاتێك ویستبووی باسی کێشەی بێکاری بکا لە وڵاتە بچووکەکەیدا چونکە توانیبووی پاڵ بنێ بە کاربەدەستە دەوڵەتییەکانەوە بۆ ئەوەی وەڵامێکی ئاشکراو روونی بدەنەوە کاتێك کە پرسیاری کرد لە سەرچاوەکە دەربارەی ئەو بەرەنگاربوونەوەیەی کە لە

مەسەلەی بێکاریدا خۆی دەنوێنێ نەك خودی کێشەی بێکاری کە کێشەیەکی ترسناکە لای هەندێ کەس. بەڵام توانی زانیارییە پێویستەکان بگەیەنێ بە خەڵك لەو راپۆرتە هەواڵەدا.

رێگەیەکی تری تا رادەیەك نائاسایی کە بەکارهێنرا لەلایەن رۆژنامەنووسێکی ترەوە لەگەڵ هەندێ سەرکەوتندا، ئەویش ئەوەیە باس لە کێشەی وڵاتێکی تر بکەیتو مەبەستیشت کێشەکانی وڵاتەکەی خۆت بێت. ئەم رۆژنامەنووسە مۆڵەتی ئەوەی وەرگرتبوو کە زنجیرە نووسینێکی رەخنەگرانە بنووسێ دەربارەی بەروبوومی کشتوکاڵی بێکەڵك لە وڵاتێکی دراوسێیاندا، بەڵام خوێنەرانی رۆژنامەکەی ئەوەندە زیرەك بوون تێگەیشتن لەوەی ئەو کێشانەی وڵاتەکەی دراوسێیان دەناڵێنێ بەدەستیانەوە کوتومت وەك ئەو کێشانە وان کە وڵاتەکەی خۆیان دەناڵێنێ بەدەستییەوەو ئەو ئەزموونو تاقیکردنەوانەی سوودی لێوەرگیراوە لە وڵاتە دراوسێکەیاندا دەکرێ جێبەجێ بکرێ لە وڵاتەکەی خۆیاندا بە بێ ئەوەی کەس رەخنە بگرێ لە وەزیری کشتوکاڵ.

رۆژنامەنووسەکە دەیگوت (باسکردنی کێشەی وڵاتێکی تر وات لێدەکا بیر بکەیتەوە لە کێشە هاوشێوەکانی وڵاتی خۆت). هەروەها دەڵێ: من بۆم دەرکەوت کە ئەمە تاکە رێگەیە بۆ ئەوەی بتوانی لەسەر گەندەڵیی دەسەڵات بنووسی لە وڵاتەکەی خۆتدا، چونکە قەدەغەیە بە شێوەیەکی راستەوخۆ باسی گەندەڵیی دەوڵەتەکەی خۆم بکەم، بەڵام سەربەستم لەوەدا باسی نرخی گرانو ئەنجامی خراپیی بڵاوبوونەوەی گەندەڵیو بەرتیل خواردنو لێنەهاتوویی بکەم ئەگەر چەند نموونەیەك بهێنمەوە کە بە تەواوی هاوشێوەی کێشەکانی وڵاتەکەم نەبێ.

هەندێ جار سەرنووسەر یا رۆژنامەنووس دەتوانێ سەرچاوەی هەواڵ یا کەسی بەرپرس وا لێبکا باوەڕ بکا بەوەی ئەو بابەتە گرنگانەی دەینووسێ لە بیروبۆچوونی سەرچاوەکە یا کەسە بەرپرسەکەوەیە. ئەگەر رۆژنامەنووس توانی باسی ئەو سوودو قازانجانە بکا کە سەرچاوە یا بڕیاربەدەست چنگیان دەکەوێ لە خستنەڕووی بابەتێکدا، ئەوا سەرچاوەکە مەسەلەی زیاتر دەخاتە روو و رەنگە هەست بەوەش بکا لە نەستی خۆیدا کە خۆی خاوەنی بیرۆکەکەیە یا هەواڵەکەیە، رەنگە لەم فێڵکردنەدا هەندێ یاریو گەمەکردنی تێدابێ. بەڵام رێگەیەکی تر هەیە کە زیاتر لە راستییەوە نزیکە، ئەویش ئەوەیە کە رۆژنامەنووسەکەو سەرچاوەی



زانیارییەکە وەك دوو هاوبەش بابەتەکە ئامادە بکەن. رۆژنامەنووسانو سەرنووسەران دەبێ خۆپەرستیو خۆبەگەورەزانین بخەنە لاوە تا بتوانن ئەو ئەرکە ئەنجام بدەن.

رۆژنامەنووس ناوبەناو دەتوانێ ئەو هەستی دوژمنایەتییەی هەیە لای هەندێ بەرپرسان لابەرێ، ئەویش لە رێگەی ئەو شێوازە چاوپێکەوتنەوە کە هەندێ لە نووسەران پێی دەڵێن شێوازی (ئامانجەکان — کۆسپەکان — چارە)، واتە رۆژنامەنووس دەتوانێ کاتێك چاوپێکەوتنێك ئەنجام دەداو دەیەوێ زانیاری بەدەست بێنێ، یەکەم پرسیار ئاراستەی سەرچاوەکە بکات دەربارەی ئامانجەکانی. ئەم رێگەیە ئەو لایەنە باشەی تێدایە کە پەیوەندییەکی توندوتۆڵ دروست دەکا لەگەڵ سەرچاوەکەدا، پاشان هەنگاوی دووهەم دێتە پێشەوە کە پرسیارێکی ئاراستە دەکاو دەڵێ: ئەمە ئامانجەکانتە ئەی چی بووە بە کۆسپ لە رێگەی جێبەجێکردنیانداو لە کۆتاییشدا زۆر لە سەرچاوەکان بە ئاشکرا باسی چارەکان دەکەن.

ئەم رێگەیە نەك هەر یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی سەرچاوەکە هەست بە ئارامیو ئاسوودەیی بکا، بەڵکو واش لەو راپۆرتانە دەکا کە رۆژنامەنووس ئامادەیان دەکا لەسەر بناغەیەکی لۆژیکی بنیات بنرێن.

لە ماوەیساڵانێکی دووردرێژدا سەدان رۆژنامەنووسم ناسیوەو بۆم دەرکەوتووە کە خاڵێکی هاوبەش هەیە لە نێوانیاندا، ئەویش بریتییە لەوەی تا رادەیەك حەزیان لەوەیە بگەڕێن بە دوای ناتەواویو سەرنەکەوتندا لە سیستمو تاکەکاندا، ئەمە بۆ خۆی تا رادەیەك رێڕەوێکی دروستو باشە. چونکە زۆربەی بەرپرسو سەرکردەکان سەرنجی خەڵك راناکێشن بۆ ئەم حاڵەتە، بەڵام ئەگەر رۆژنامەنووس لە هەموو شتێك نزیك ببێتەوەو لای وابێ کە هەڵەو ناتەواویی تێدایە، ئەوە ئەم رێڕەوە خراپە رەنگ دەداتەوە لە راپۆرتەکانیدا.

ژمارەیەکی گاڵتەپێنەکراویش هەن لە رۆژنامەنووسو سەرنووسەران تووشی (گرێی خۆبەخواوەندزانین) هاتوون وەك هەندێ لە سەرکردەکان. ئەم رۆژنامەنووسانە هەر لەخۆیانەوە بڕیاری بێ بناغەو سەرپێیی دەدەن بەرامبەر ئەو بەرپرسو کەسانەی ناو دەبرێن لە هەواڵەکاندا. لای ئێمە کارێکی ئاساییو بڵاوە کە خەوشو ناتەواوییەکانی خۆمان بدەینە پاڵ کەسانی تر، لەلایەکی ترەوە هاندەرێکی بەهێز هەیە پاڵ دەنێ بە رۆژنامەنووسەوە بۆ ئەنجامدانی کارێکی وا کاتێك هەڵسوکەوت دەکا لەگەڵ سەرچاوەکانی هەواڵدا. گومان

پەیداکردن لە ڕەوشتی کەسانی تر زۆرجار ئاسانترە لەوەی بگەڕێین بە دوای هەڵەو ناتەواوییەکانی خۆماندا. زۆر ئاسانە بڵێین بۆ نموونە کۆمەڵە کەسانێکی لێنەهاتوو کاروباری فلان وەزارەت دەبەن بەڕێوە، لە کاتێکدا کە دەزانین ئەو ڕۆژنامەیەی خۆمان کاری تێدا دەکەین بە هەمان لێنەهاتووییەوە دەبرێ بەڕێوە. ڕۆژنامەنووس یا سەرنووسەری کامڵو لێهاتوو دەبێ ئەو هاندەرانە بزانێ کە پاڵ دەدەن بە مرۆڤەوە بۆ ئەوەی خاڵە لاوازەکانی خۆی بداتە پاڵ کەسانی تر.

ئێمە ئەگەر ناتەواویو خەوشەکانی خۆمان بزانین، ئەوە یارمەتیمان دەدا بۆ ئەوەی زۆرتر نەرمونیان بین کە دێینە سەر باسی کێشەکانی وڵاتەکەمان یا ئەو کەسانەی هەڵسوکەوت دەکەین لەگەڵیاندا. هەر کاتێك ڕۆژنامەنووس خەوشو ناتەواوییەکانی خۆی هەست پێکرد، ئەوا دوودڵ دەبێ لەوەدا چاوەڕوانی بێخەوشیو بێ ناتەواوی بکا لە کەسانی تر.

ڕۆژنامەنووسان ئەرکێکی قورسیان لەسەر شانە کە بریتییە لەوەی خۆیان بناسن. لەبەر ئەوەش کە هەڵوێستو ڕێڕەوی ژیانیان زۆرجار ڕەنگ دەداتەوە لە نووسینەکانیاندا — خۆیان بەئاگا بن لێی یا بێئاگا —، دەبێ لە ناخی خۆیاندا بگەڕێن بە دوای ئەو ڕەوشتی لایەنگیریو هێرشبردنە سەر ئەو خەڵکەی خۆی حەشار داوە لە قووڵایی دەروونیاندا، وەك ئەوەی دەیکەن بەرامبەر کەسانی تر.

ڕۆژنامەنووسە سپی پێستە ئەمریکاییەکان دەبوا ئەوەیان بزانیایە کە ئەوان لە ناخی خۆیاندا وا لە ڕەش پێستەکان گەیشتوون کە زۆر کەودەنو مرۆڤی سەرەتایینو تواناییان بۆ فێربوونو پێشکەوتن کەمترە لە سپی پێستەکان، ئەم ڕۆژنامەنووسە سپی پێستانە پێدەگەنو گەورە دەبنو ئەم تێڕوانینو بڕیارە ناڕەوایانە چەسپیوە لە ناخیاندا. کاتێك کە هەواڵێکی پەیوەندیدار بە ڕەش پێستەکانەوە دەنووسن، یا باسی زوڵمو زۆریی ڕەگەزپەرستانەی دەوڵەتی ئەمریکا دەکەن بەرامبەر بە ڕەش پێستەکان، دەبێ ئاگادار بن لەوەی کە کەوتوونەتە ژێر قورسایی ئەو تێڕوانینو بڕیارە پێشوانەی خۆیانەوە کە لایەنگیریو هێرشبردنی ناڕەوای پێوە دیار بوو.

لەلایەکی ترەوە ڕۆژنامەنووسە ڕۆژاواییەکان، لە زۆر کاتو شوێندا لە باری سیاسییەوە لیبراڵنو زۆر زەحمەتە بۆیان کاتێك لەگەڵ سیاسییە کۆنەپارێزەکاندا هەڵسوکەوت دەکەن ئەو



تێڕوانینو لایەنگرییەی خۆیان بخەنە لاوە. ئەو پرسیارەی لێرەدا خۆی قوت دەکاتەوە ئەوەیە: ئایا نووسەرێکی نوێخوازی دیموکراسیی ئەمریکایی، دەتوانێ کاتێك دەیەوێ بابەتێك بنووسێ لەسەر کۆمارییە کۆنەپارێزەکان ئەو تێڕوانینو لایەنگرییەی خۆی بخاتە لاوە؟

لە جیهانی سێهەمدا، ڕۆژنامەنووسێکی سەر بەو خێڵەی ژمارەی ئەندامیان زۆرترو سەرکەوتووترن، دەتوانێ بێ لایەنگریو بە ویژدانەوە لەسەر ئەندامانی تیرەو خێڵی بچوکتر لەوان، یاخود ڕۆژنامەنووسێکی ڕەش پێست دەتوانێ ئەو میراتی زوڵمو زۆرەی بەری کەوتووە لەسەر دەستی هەندێ لە سپی پێستەکانەوە، لەبیر خۆی بەرێتەوەو پێی وابێ کە هەندێ سپی پێست شەڕەنگێزو خراپەکار نین؟

ئەگەر سەرنووسەر یا ڕۆژنامەنووس توانی ئەو خووی لایەنگریو ناتەواوییانەی خۆی بزانێ، ئەوە دەتوانێ خۆی بپارێزێ لێیان لە کاتی نووسیندا. ئەگەر زانیمان کە مرۆڤ لە سروشتیدا لایەنگریی تێدایە، ئەوە بە خێرایی ڕەنگ دەداتەوە لەسەر باش تێگەیشتنو هاوسۆزیمان لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە ڕووبەڕووی کێشەو حاڵەتە سەختو ناهەموارەکان دەبنەوە، ئەو کاتە ئەوان هەست دەکەن کە ئێمە خۆمان ناکەین بە دادوەرو هاوسۆزین لەگەڵیاندا. زۆرجار کلیلی نووسینی ڕووداوو هەواڵی گرنگو ناسك یا ورووژێنەری مشتومڕو ناکۆکی ئەوەیە کە سەرچاوەی هەواڵەکە وا لێبکەین هەست بکا بەوەی ئێمە بە نەرمیو لەسەرخۆ باسی ناتەواوییەکانی دەکەینو لەوە تێدەگەین کە چارکردنی کێشەکە چەندە قورسە.

هەندێ ڕۆژنامەنووسان وا گومان دەکەن کە ئەم قسانەی من دەیکەم زۆرتر گونجاوە بۆ پزیشکێکی دەروونی یا پەندو ئامۆژگاریی ناو کەنیسەکان. زانستی دەروونناسیی تایبەت بە سەرچاوەکانی هەواڵ تەنیا بڕێکی کەم گرنگیی دراوەتێ لەو کتێبانەدا کە تایبەتن بە خوێندنی بابەتی ڕۆژنامەوانییەوە. ئەم کتێبانە وا دەڕواننە پەیوەندیی نێوان ڕۆژنامەنووسو سەرچاوەی هەواڵ یا پەیوەندیی نێوان ڕۆژنامەنووسو کاربەدەستان وەك ئەوەی پەیوەندییەکی سنووردراری دیاریکراوی ئاشکرا بێت. یا سپی یا ڕەشو، ڕۆژنامەنووس ڕۆڵێکی باشو چاك دەبینێو هەموو شتێك دەزانێ. ئەو سەرچاوەی هەواڵ یا دەوڵەتو کۆمپانیا تایبەتانەی لەسەریان دەنووسێ (خراپن)و دەبێ کردارو ڕەفتاریان بخرێتە ڕوو و بە تاوانبار دابنرێن، ئەم پەیوەندییە ناکۆکەیە بەرپرسیارە لە دوژمنایەتیکردنیان بۆ ڕۆژنامەکان.

من هەموو کاتێ سەرم سوڕ دەمێنێ، کە لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو بڕە نیازپاکیو گیانی هاوکاریکردنە هەیە بەرامبەر رۆژنامەنووسان. لە کۆتاییدا لەسەر هەموو رۆژنامەنووسێك پێویستە لە کاتی هەڵسوکەوتکردندا لەگەڵ سەرچاوەکانی هەواڵ، ئەو زیادەڕەوییە لە خۆبەشتزانینو باوەڕکردن بەوەی کە خۆی لە هەموو کەسێکی تر بە رەوشت باشتر دادەنێ بخاتە لاوە، ئەوەشە وای لێکردووە خۆی داناوە بە پارێزەری گری پیرۆزی رەوشت.

ئەو رۆژنامەنووسانەی دەتوانن زۆرجار بنووسن لەسەر ئەو مەسەلەو بابەتانەی گرنگنو مشتومڕو ناکۆکی بەرپا دەکەن، تەنیا ئەوانەن کە توانای ئەوەیان هەیە برێکی باش تێگەیشتنو هاوبەشیو هاوسۆزی بنوێنن لەگەڵ سەرچاوەکانیاندا. بەرامبەر هەر راپۆرتە هەواڵێك کە سەرکەوتووانە دەنووسرێ لە رێگەی بەکارهێنانی ئەو شێوازانەوە کە رووبەڕووبوونەوەو تونـدی دەردەکەوێ تیایاندا، دەیان راپۆرتە هەواڵی تر هەن بە سەرکەوتووانە دەنووسرێن لە رێگەی هەوڵو خۆماندووکردنێکی دوور لە رووبەڕووبوونەوەو حەزکردن لە دەرخستنی هاوسۆزی لەگەڵ سەرچاوەکانی هەواڵدا. ئەمەش مانای ئەوە نییە کە پەیوەندیی دوژمنان جێی نابێتەوە لەوێداو دروست نابێ، چونکە رۆژنامەنووس هەندێ جار دەبێ چەکی خۆی تیژ بکاو خۆی ئامادە بکا بۆ ئەوەی بچێتە نەبەردەوە. بەڵام چاوەڕێی ئەوە مەبە وەك رۆژنامەنووسێك کە هەموو جارێك سەربکەوی کاتێك بەتەمای ئەوە بیت لە رێگەی تووڕەکردن یا ورووژاندنی ئەو کەسانەوە کە هەواڵەکەتی لێوەردەگری سەرکەوی بەسەریاندا. دەبێ ئەوە بزانی کە تۆ بەهۆی هەنگوینەوە ژمارەیەکی زۆر مێش بخەیتە داوەوەو لەناویان بەری زیاتر لەوەی کە بەهۆی سرکەوە دەتەوێ لەناویان بەری.

# بەشی هەشتەم

## رۆژنامەگەریی بواری لێکۆڵینەوە

## بابەتو ئامرازەکان

**نووسینی: أ. ل. هستر**

رۆژنامەگەریی بواری لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون، جۆرێکە لە رۆژنامەگەریی کە زەحمەتە لە هەموو شوێنێکدا پەیڕەوی بکرێ. لە گەلێك لە وڵاتەکانی جیهانی سێهەمدا، کە سیستمی رۆژنامەگەری بەشێکی دانەبڕاوە لە حکومەتی نیشتمانی، زیاتر زەحمەتە پەیڕەوی بکرێ. تەنانەت لە کاتێکدا کە رۆژنامەوانی جیابووبێتەوە لە دەوڵەت لە وڵاتانی جیهانی سێهەمدا، مەسەلەی بیرکردنەوەی رۆژنامەنووسێك لە لێکۆڵینەوە لە هەر شتێك بیەوێ، رووبەڕووی سەرسوڕمان دەبێتەوە.

بەشێك لەوەی کە گومان هەیە لە توانای رۆژنامەنووسان بۆ ئەوەی ئەو جۆرە رۆژنامەگەرییە پەیڕەوی بکەن، یا سەبارەت بە رێگەپێدان بۆ ئەو کارە لە وڵاتانی جیهانی سێهەمدا، دەگەڕێتەوە بۆ جۆری پێناسەی (رۆژنامەنووسی بواری لێکۆڵینەوە)، چونکە گەلێك کەس بۆچوونێکی تایبەتیان هەیە دەربارەی رۆژنامەنووسیی ئەو بوارەو لایان وایە کە تێکەڵەیەکە لە جەنگاوەرێکی کەللەڕەق، پۆلیسی نهێنی، سەگی پۆلیسی کە بەردەوام دەگەڕێ بە دوای کەسانی خراپەکارو تاوانو گەندەڵیو هەڵەکانی تری مرۆڤدا.

ئەگەر بە تەواوی لەم بۆچوونە ورد ببینەوە بۆمان دەردەکەوێ کە خاوەنەکانی ئەو بۆچوونە لایان وایە رۆژنامەنووسانی ئەو بوارە جۆرە کەسانێکن حەزیان لە رەخنەی توندو گاڵتەکردنە بە خەڵكو تەنیا خۆشییەکیان لە ژیاندا ئەوەیە چی گابەرد هەیە هەڵیگێڕنەوە بۆ ئەوەی بزانن چ مارو مێرووییەکیان لە ژێردایە.



هەموو ئەم جۆرە بیرکردنەوانە دەربارەی رۆژنامەگەریی بواری لێکۆڵینەوە، بەشێك لە راستییان تێدایە، بەڵام بۆ نەگبەتیی جەماوەرو زۆرێك لە رۆژنامەنووسان بیر لەم جۆرە رۆژنامەوانییانە ناکەنەوە تەنیا بۆ (پەردەهەڵماڵین) نەبێ، کە ئەوەش پایەو بەهای بابەتەکە کەم دەکەنەوە. من لام وایە کە رۆژنامەوانیی بواری لێکۆڵینەوە دەکرێ چوارچێوەکەی لەوە فراوانتر بێ، هەروەها دەکرێ بە سەرکردنەوەی رۆژنامەوانیی هاوشان لەگەڵ لێکدانەوەی قووڵدا لەخۆ بگرێ.

بەڵام بەشی زۆری ئەوەی کە ئێمە پێی دەڵێین رۆژنامەگەریی بواری لێکۆڵینەوە، لە چەند لایەنو گۆشەی گرنگەوە جیاوازە لە بەسەرکردنەوەی ئاسایی هەواڵ. جیاوازییەکانیش بریتین لەم خاڵانەی خوارەوە:

١) لێکۆڵینەوەی رۆژنامەوانی، ئەنجام دەدرێ لەسەر ئەو بنەمایەی کە دەبێ کارێکی لێبکەوێتەوەو گۆڕانێك دەبێ روو بدا. بەڵام هەندێ جار دەبینی ئەو یاسایە تەواو دەرناچێ، واتە جارجارێك لێکۆڵینەوەیەکی رۆژنامەوانیی گشتگیر هەر دووبارەکردنەوەی ئەو کارانەن کە جێبەجێ کراونو دەرخستنی پێزانینی جەماوەر بۆ ئەو کارانە.

٢) لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی رۆژنامەوانی، بە ئاسایی رووبەرێکی پانتر داگیر دەکا لە رۆژنامەکەو کاتێکی درێژتری دەوێ بۆ ئامادەکردنو کۆکردنەوەی زانیاری، هەروەها کاتێکی زۆرتری دەوێ بۆ نووسین.

٣) لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی رۆژنامەوانی، زۆر جاران پێویستی بە بودجەو سەرچاوەیەکی دارایی گەورە هەیە، هەروەها کاتێکی زۆرتری دەوێ بۆ ئەوانەی ئەم ئەرکە ئەنجام دەدەن، چونکە لێکۆڵینەوە وا سەیر دەکرێ کە گرنگییەکی زیاتری هەیە لە کاری رۆژنامەگەریی رۆتینی.

٤) لێکۆڵینەوەی رۆژنامەوانی لە زۆر کاتدا بە مەبەستی نووسینی راپۆرتێکی راستی نییە دەربارەی بابەتێك، بەڵکو نووسەری لێکۆڵینەوەکە کە خەریکی ئەو کارەیە لە خەیاڵی خۆیدا بڕیار دەدا لەسەر ئەوەی پێویستی بە گۆڕانێك هەیە کە دەبێ روو بدا، یا چاکسازییەك دەبێ ئەنجام بدرێ، یاخود چەند هەڵەیەك دەبێ دەستی چاککردنەوەیان بگاتێ. پاش ئەمانە دەزگای رۆژنامە یا گۆڤارەکە، سەرنووسەرو نووسەران، دەبێ رێك بن

لەسەر کاتو تەرخانکردنی بودجەی پێویست بۆ ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە پێش ئەوەی دەستی پێبکەن.

٥) لێکۆڵینەوەی رۆژنامەوانی بە ئاسایی مشتومالکردنێکی تایبەتی تێدایە، وا لە بابەتەکە دەکا سەرنجراکێش بێ بە شێوەیەکی تایبەت، هەروەها هەندێ جار پێویستیی بەوەیە کە چەند جار چاپ بکرێتەوە.

٦) لە لێکۆڵینەوە رۆژنامەوانییەکاندا گرنگییەکی زیاتر دەدرێ بە وێنەی جوانو نەخشەو هێلکاریو لیست.

٧) لێکۆڵینەوەی رۆژنامەوانی دەبێ ئەو رۆژنامەنووسو نووسەرانە ئەنجامی بدەن کە لە هەمووان ئەزموونیان زیاترە، چونکە نووسینی ریپۆرتاژ بە سەرکەوتوویی گرانترین جۆری نووسینی رۆژنامەوانییە.

٨) پێویستە هەموو کات بڕیار وەربگیرێ لەلایەن گەورەترین کاربەدەستی رۆژنامە یا گۆڤار یا فەرمانگە دەوڵەتییەکان بۆ رازیبوون لەسەر پرۆژەی لێکۆڵینەوە رۆژنامەوانییەکە، چونکە رۆژنامە یا گۆڤار هەڵوێستێکی رەخنەگرانە یا پیاهەڵدان دەگرێ لەسەر ئەو مەسەلەیەی لێکۆڵینەوە رۆژنامەوانییەکەی بۆ نووسراوە.

زۆرجاران چاوەڕوانی ئەوە دەکرێ کە رۆژنامەنووس چەند بیرۆکەیەک گەڵاڵە بکا بۆ پرۆژەی لێکۆڵینەوەکەی. رۆژنامەنووس بە شێوەیەکی ئاسایی، ئەرکی لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی بوارێکی دیاریکراو دەخرێتە ئەستۆی، زۆرجار ئەو ئەرکە ئەوەی لێدەخوازێ کە چەند بیرۆکەیەک پێشکەش بکا بۆ ئەو لێکۆڵینەوە رۆژنامەییەی دەنووسرێ لە چوارچێوەی بوارەکەدا. هەندێ جاریش بیرۆکەی لێکۆڵینەوەی رۆژنامەوانی لە سروشتی ئەو بەرپرسە پلە بەرزانەن کە چاوپێکەوتنەکە لەگەڵ رۆژنامەنووسەکەدا دەکەنو ئامۆژگاریی پێویستی دەدەنێ. ئەو رۆژنامەنووسە چانسی هەیە ئەگەر ئەو بەرپرسانە پێشەکی هەولی ئەوەیان نەدا کە بزانن ئەنجامی ئەو ریپۆرتاژە رۆژنامەوانییە بە چی دەگات. لە گۆشەنیگایەکی راستو تەواوەوە، رۆژنامەنووس یا ئەو کۆمەڵە رۆژنامەنووسەی ئەرکی ئەنجامدانی پرۆژەیەکی رۆژنامەوانی دەخرێتە ئەستۆیان، دەبێ توانای ئەوەیان هەبێ پلان دابنێن بۆ ئەو پرۆژەیە، ئەمەش بە

هاوکاری لەگەڵ سەرنووسەرو ئەوانی تردا و، پاشان ئەو زانیارییانە کۆ بکەنەوە کە بۆچوونەکانی خۆیانیان لەسەر بنیات دەنێن.

پێویستە رۆژنامەنووسان بە خێرایی فێری ئەوە بن کە هەوڵی ئەوە نەدەن جۆرە راپۆرتێک بنووسن ببێتە جێگەی مشتومڕو ناکۆکی بە بێ ئەوەی رەزامەندیی ئەو دەزگایە وەربگرن کە کار دەکەن تێیدا، ئەگەر ئەو رۆژنامەنووسانە پێشەکی پشتگیریی سەرۆکەکانیان مسۆگەر نەکەن، ئەوە رەنگە هەندێ گوشاری کاریگەر بخرێتە سەر کاربەدەستانی سەرووی خۆیان بۆ بڵاونەکردنەوەی ریپۆرتاژەکە. ئەو رۆژنامەنووسەی کە پشتگیریی دەزگاکەی خۆی بەدەست ناهێنێ، رەنگە خۆی ببینێتەوە کە تووشی گێچەڵێك بووە، دەبێ رۆژنامەنووسان ئاگایان لەوە بێ ئەگەر ریپۆرتاژێکی رۆژنامەوانی ئەنجامەکەی پێچەوانەی ئەوە بوو کە ئەوان بەتەمای بوون، ئەوە لەو کاتەدا هەر کام لەو رۆژنامەنووسانە دەبینێ بووە بە قوربانیی مەسەلەکەو باجەکەی دەدات، بۆ نموونە، وا رێك دەکەوێ بەرپرسێك توندوتیژیی رەخنەکەی پێ قەبووڵ ناکرێ‌و دەڵێ: فلانە رۆژنامەنووس بە زیادەڕەوییەوە لەسەر بابەتەکەی نووسیوە بە بێ ئەوەی توانای ئەوەی هەبێ لە بابەتەکە گەیشتبێ‌و هەندێ هەڵوێست وەردەگرین دژی ئەو بەداخەوە.

هەروەها پێویستە رۆژنامەنووسان ئاگادار بکرێنەوە لەوەی کە دەبێ زۆر ئاگایان لە بەرپێی خۆیان بێ، کاتێك دەیانەوێ ریپۆرتاژێك بنووسن لەسەر بابەتێك کە ناسك بێ‌و مشتومڕو ناکۆکیی لێبکەوێتەوە. ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەم جۆرە ریپۆرتاژانە، بەلای زۆرەوە رەنگە ببێتە هەڕەشەیەك بۆ سەرچاوەکانی هەواڵ‌و کاربەدەستان. ئەگەر ئێمە بمانەوێ خۆمان بپارێزین لە کات‌و پارە لەکیسچوون، پێویستە پلانێکی باش دابنێین بۆ ئەنجامدانی ئەو ریپۆرتاژە رۆژنامەوانییە. هەروەها دەبێ رۆژنامەنووس — بە رێکەوتن لەگەڵ سەرنووسەرو ئەوانی تردا — یەکەمجار پرسیار بکا (ئەو بابەتە چییە کە دەمانەوێ راپۆرتەکەی لە بارەیەوە ئامادە بکەین یا دەمانەوێ دەریخەین؟). هەنگاوی دووهەم ئەوەیە بەگوێرەی توانا بە وردی ئەوە دیاری بکا کە کام پرسیارانە یارمەتی دەدەن بۆ بەدەستهێنانی وەڵام لە ریپۆرتاژەکەدا. پاش ئەوە پێویستە لەسەر رۆژنامەنووس بزانێ بە بۆچوونی خۆی زانیاریی پێویست لای کێ چنگ دەکەوێ‌و ئایا ئەو کەسە یا ئەو سەرچاوانە رێگەی دەدەن زانیاری پەیدا بکا یا بەدەستیان بهێنێ. دیدارو چاوپێکەوتنی رۆژنامەوانی، بە چاوی خۆبینینی خودی رووداوەکە، هەوڵدان بۆ پەیداکردنی



زانیاری لەسەر رووداوەکە بەهۆی خوێندنەوەی سەرچاوەکان لە کتێبخانە گشتییەکاندا، یا چاوگێڕان بە رۆژنامە جۆراوجۆرەکاندا، ئەمانە هەموویان زۆر پێویستن بۆ بەدەستخستنی زانیاریی پێویست بۆ ریپۆرتاژەکە.

پێویستە لەسەر رۆژنامەنووس بە هاوکاری لەگەڵ سەرنووسەرو ئەوانی دیکەدا، هەوڵ بدا بۆ ئەوەی بزانێ ئایا ئەو ریپۆرتاژە، دەکرێ یەك کەس ئەنجامی بدا یا کۆمەڵێك لە رۆژنامەنووسان. ئەگەر مەسەلەکە پێویستی بەوە کرد کە زیاتر لە یەك کەس ئەنجامی بدا، ئەوا پێویستە چەند بڕیارێك دەربکرێ بۆ دیاریکردنی بەرپرس لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی لێکۆڵینەوەکە، رەنگە ئەوەش روو بدا کە یەکێك لە رۆژنامەنووسەکان ئەرکی سەرپەرشتیکردنی ئەندامەکانی تری کۆمەڵەکە بخرێتە ئەستۆی. ئەگەر ریپۆرتاژەکە پێویستی هەبوو بە بەکارهێنانی وێنەگر، ئەوا پێویستە ئەوانیش لە پلاندانانەندا ئامادە بن بۆ پێشکەشکردنی پێشنیارەکان دەربارەی وێنە باشەکان، ئەم پێویستیی ئامادەبوونە هونەرمەندان‌و کاریکاتێریست‌و ئەوانی تریش دەگرێتەوە لەو کەسانەی ریپۆرتاژەکە پێویستیی بە لێهاتوویی‌و کارامەییان هەیە.

رەنگە رۆژنامەنووس یا ئەو سەرنووسەرەی سەرپەرشتیی پرۆژەکە دەکا، پێویستیی هەبێ بە لیستێك تیایدا بابەتی ریپۆرتاژەکە دیاری بکا لەگەڵ ئەو پرسیارانەی ئاراستە دەکرێن‌و — ئەگەر بوار هەبوو — ئەو سەرچاوانەی چاوپێکەتنەکەیان لەگەڵدا دەکرێ‌و ئەو زانیارییە پێشوەختانەی پێویستە بەدەست بهێنرێن‌و ئەو شێوازەی ریپۆرتاژەکەی پێ پێشکەش دەکرێ وەك ئەوەی بە شێوەی زنجیرە پێشکەش بکرێ یا لەسەر دوو لاپەڕەی بەرامبەر بەیەك یا هەر جۆرێکی تر.

هەروەها پێویستە کات‌و خەرجی مەزەندە بکرێن پێش ئەوەی دەست بکرێ بە نووسینی ریپۆرتاژەکە، لە راستیدا لێکۆڵینەوەی رۆژنامەوانی پێویستی بە زۆرترین هەوڵ‌و ماندووبوون هەیەو زۆرجار پارەی زۆریشی تێدەچێ. پارەی تێچووی پرۆژەی ریپۆرتاژێکی رۆژنامەوانی، زۆر زۆر بێ ئەگەر بەراورد بکرێ لەگەڵ ئەو بەهایەی چاوەڕوان دەکرێ لێوەی دەست بکەوێ. ئەگەر وەهاش بوو چاکتر وایە پێش دەستکردن بە پرۆژەکە ئەوە بزانرێ نەك پاش دەستپێکردنی.

## هونەری بەدواداچوونی ئەو بابەتانەی لە تواناداں

ئەم بابەتانەی خوارەوە، بەشێکن لەو بابەتانەی بیستوومن لە کاتی مشتومڕی نێوان ڕۆژنامەنووسەکانی جیهانی سێهەمدا، ئەم بابەتانە، یا ریپۆرتاژە ڕۆژنامەوانییەکان باسیان کردوون یاخود پێویستیان بەوەیە باس بکرێن. هەندێك لەم بابەتانە بەدواداچوونیان زۆر ئاسانترن لە هەندێکی تریان.

یەکەمی ئەو بابەتانە ئەوەیە کە دەکرێ ناوی بنێین (برینداربوون بەهۆی گای کەسانی ترەوە) بۆ گاڵتە، ڕەنگە زیادەڕەویی تێدابێ، ئەگەر داوا بکەین لە حکومەت، یا یەکێك لە فەرمانگەکانی، ریپۆرتاژێکی ڕۆژنامەوانیمان بخاتە بەردەست دەربارەی چالاکییەکانی لەوانەی لە چاپەمەنییەکاندا بڵاویان دەکاتەوە. ڕەنگە شتێکی پەسەندیش نەبێ بۆ ڕۆژنامەیەکی کەرتی تایبەت ریپۆرتاژێك بڵاو بکاتەوە بە ئاشکراییەکی واوە کە سنوور ببەزێنێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە مانای ئەوە نییە بە تەواوی واز لە لێکۆڵینەوەو ریپۆرتاژ بێنێ. ڕەنگە هەندێ بوار هەبن لەو بابەتە قەدەغانە نەبن کە نەتوانرێ نزیکیان بکەویتەوە لە لێکۆڵینەوەدا. مەبەستیشمان لەم قسەیە گاڵتەکردن نییە، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە ژیان جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هەندێ بوار وان لە دەرەوەی سنووردا، تەنانەت ئەگەر ڕۆژنامەنووس هەموو هەوڵو توانای خۆی بەکاربێنێ بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە ئەو بوارانە دەبێ ریپۆرتاژیان لەسەر بنووسرێ. کەواتە بۆچی تۆ کاتی خۆت بەفیڕۆ دەدەیو سەری خۆت دەدەی لە دیوارێکی بەرد، ڕۆژنامەنووسی لە ڕاستیدا هونەری بەدواداچوونی ئەو بابەتانەن کە لە توانادا بن.

نموونەی لێکۆڵینەوە لەو بابەتانەدا کە لە تواناداں، ئەو راپۆرتانەن کە ئامادە دەکرێن لەسەر چالاکی، بەرهەمەکان، یا ڕەوشتو هەڵسوکەوتی ڕێکخراوە بیانییەکان. چونکە لە جیهانی سێهەمدا کۆمپانیا بیانییەکان یا هەر جۆرە بوونێکی بیانی بە زۆری، بە چاوی گومانەوە خەڵك تێیان دەڕوانێ بەهۆی مێژووی سەردەمی ئیمپریالیزمییەوە. ئەگەر ڕۆژنامەنووسە ڕۆژاواییەکان هەست بەوە بکەن کە پێویستە لەسەریان وەك چاودێرێك ئەرکی خۆیان بەجێ بهێنن لە چاودێریکردنی سنوور بەزاندنی دەوڵەت یا کۆمپانیا گەورەکان، ئەوا بۆ ڕۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم ڕەواترە، ئەگەر بیر بکەنەوە لە ئەنجامدانی ریپۆرتاژ لەسەر دەسەڵاتی



ئیمپریالیزم یا کۆمپانیا بیێگانەکان. ئەو پرسیارانەی کە دەکرێن بەم بۆنەیەوە ئاراستە بکرێن ئەوەیە بگوترێ: بۆ دەبێ بێگانە لەم وڵاتەدا بن؟ دەبێ دەوڵەتانی جیهانی سێهەم چ سوودێکیان دەست بکەوێ لە چالاکیی ئەو دەزگاو کۆمپانیا بیانییانەی لەسەر خاکی وڵاتەکەیان کار دەکەن؟ ئایا بوونی بێگانە دەبێتە هۆی زۆربوونی هەلی کارکردن یا بەرزکردنەوەی ڕادەی خۆشگوزەرانی لەو وڵاتەدا، ئایا بەڵگەی وا هەیە ئاماژە بکەن بۆ ئەوەی چالاکیو جموجووڵی ئەو بێگانانە دەبنە هەڕەشەیەك بۆ سەربەخۆیی وڵات؟ ئایا ئەو سوودو قازانجەی کە لە بوونی بێگانەوە پەیدا دەبێ، هەر دەگەڕێتەوە بۆ خۆی یاخود ویژدانو دادپەروەری هەیە لەو پەیوەندییەی کە هەیە لە نێوان کۆمپانیا بیانییەکانو ئەو وڵاتەی کار دەکەن تیایدا؟، جۆری ئەو یاسایانە چۆنە کە بەرژەوەندیی بێگانەکان ڕێکدەخاتو دیاریی دەکات؟ ئایا ئەو کۆمپانیاو دەزگا بازرگانییانە، یاسای خۆیان پەیڕەوی دەکەن یا ملکەچی ئەو یاسایانەن کە لەو وڵاتەی جیهانی سێهەمدا پەیڕەوی دەکرێن؟ ئایا بەڕێوەبردنی ئەو دەزگاو پرۆژانە بە تەواوی لە دەستی بێگانەدایە، یاخود بە هاوبەشییە لە نێوان ئەو دەوڵەتەی جیهانی سێو ئەو دەزگا بیانییەی کە میوانە لە خاکی ئەو وڵاتەدا؟ ئایا بەرژەوەندییەکی بەردەوام هەیە لەو وڵاتەی جیهانی سێدا کە سوودمەند بێ بۆ ئەو بێگانەیە لەسەر حیسابی زۆرینەی هاووڵاتییان؟.

دەتوانی زانیاریی تەواو بەدەست بێنی دەربارەی جموجووڵو چالاکیی دەزگا بیانییەکان لە وڵاتدا، لەو وەزارەتەی بەرپرسە لە ڕێکخستنی بوونی بێگانە. زۆر دەوڵەتی وا هەن داوای زانیاریی تەواو دەکەن لەو دەزگاو کۆمپانیانەی کە دەیانەوێ کار بکەن لە وڵاتەکەیاندا، ئەمەش وەك زانیاری لەسەر قازانج، زیان، ئەو باجەی لێی وەردەگیرێ، ڕێژەی کارمەندانی هاووڵاتییانو بێگانە، کێ دەتوانێ بەش بکڕێو ببێ بە خاوەنی بەش لەو کۆمپانیایەدا، کێ بۆی هەیە باڵادەست بێ تێیدا؟

لە ڕاستیدا یەکێك لەو سەرچاوانەی خراونەتە پشتگوێ سەبارەت بە ڕۆژنامەنووسانی بواری لێکۆڵینەوەو ریپۆرتاژ نووسینی جیهانی سێهەم، ئەو بەڵگانەیە کە کۆمپانیاکە دەبێ بیانخاتە ڕوو لە وڵاتەکەی خۆیاندا یا لەو وڵاتەدا کە کاری تێدا دەکەن. بۆ نموونە لە ئەمریکادا لیژنەیەکی ئەمریکیی تایبەت هەیە لە واشنتۆندا، ئەو کۆمپانیا گەورە ئەمریکییانە کە دەیانەوێ بەشێکی کۆمپانیاکە بفرۆشن، ناچار دەکا کە ژمارەیەکی زۆر بەڵگە بخەنە بەردەست

باسی قازانجو زیانی کۆمپانیاکەیانی تێدا روون بکەنەوە هەر چوار مانگ جارێو، کێ زۆربەی بەشەکانی هەیەو چین ئەو گۆڕانکارییانەی کاری کردووەتە سەر کۆمپانیاکەو قازانجەکانیو... شتی تر، زۆرجار ئەم بەڵگەو زانیارییانە دەبنە هۆی چاوکردنەوەو شارەزایی دەوڵەتانی جیهانی سێهەم، کاتێك کە دەیانەوێ یەکێك لەو کۆمپانیانە بانگ بکەن بۆ وڵاتەکەیان بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەیەك.

دەبێ ئەو پێشنیارانەی باسمان کردن بۆ لێکۆڵینەوەو وردبینی دەربارەی بوونی کۆمپانیا بێگانەکان لە جیهانی سێهەمدا، وا لێك نەدرێتەوە کە ئەم جۆرە دەزگاو کۆمپانیا بێگانانە، هەمووکاتێك دژی بەرژەوەندیی وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان کار دەکەن، چونکە هەندێ جار کۆمپانیاکان بەشداری دەکەن لە گەشەکردنی باری ئابووری یا گۆڕینی جۆری ژیان لەم وڵات یا ئەو وڵاتدا. بەڵام رێی تێدەچێ کە چەوساندنەوەو زیادەڕەویش روو بداو لەو حاڵەتەدا دەکرێ تیشك بخرێتە سەریان.

رەنگە بەرپرسانی دەزگا خێرخوازیو کۆمەڵە ئایینییە بێگانەکان بابەتێکی باش بن بۆ ریپۆرتاژ لەسەر نووسین. بۆ نموونە لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٥دا دەرکەوت ئەو برە پارەیەی دەزگایەکی خێرخوازی گەورە لە ئەمریکا کۆی دەکردەوە بە ناوی یارمەتی بۆ ئەو وڵاتە ئەفریقییانەی تووشی وشکە ساڵی هاتبوون، بەشی زۆری نەدەنارد بۆ ئەو وڵاتانە. ئەم دەزگا خێرخوازییە راهاتبوو ئاگاداری بڵاو بکاتەوە کە گوایا کارێکی مرۆڤانە ئەنجام دەدا. بەڵام دەوڵەتە ئەفریقییەکان هیچیان لەو پارەو دانەوێڵەیە بەدەست نەگەیشت برێکی کەم نەبێ. رۆژنامەنووسە ئەفریقییەکان دەیانتوانی ئەم هەواڵە بخەنە بەر باسو لێکۆڵینەوە لەلای خۆیانەوە داوای لێبکەن ببێتە جێگەی گرنگیپێدانی هەموو جیهان. بەڵام ئەوەی کە رووی دا ئەوەبوو کە هۆکانی راگەیاندنی ئەمریکا کەوتنە گومان لە مەسەلەکەو چەند رۆژنامەنووسێکیان بۆ ئەفریقیا نارد بۆ ئەوەی بزانن رادەی راستگۆیی ئەو دەزگا خێرخوازییە لە کوێدایە. رۆژنامەنووسە ئەفریقییەکان دەیانتوانی وەك ئەمریکاییەکان جموجووڵو چالاکییان هەبوایەو دەیانتوانی لەم بارەیەوە داوای یارمەتییان بکردایە لە برا رۆژنامەنووسەکانی ئەمریکا. بۆ نموونە لە ئەمریکادا کۆمەڵێك هەن لە رۆژنامەنووسو سەرنووسەری وا کە چالاکیو جموجووڵیان هەیەو دەرکەوتوون لە کارەکەیانداو پێیان دەڵێن (کۆمەڵەی رۆژنامەنووسو سەرنووسەرانی لێکۆڵینەوەو ریپۆرتاژ)، ئەمانە سەر بە پەیمانگەی رۆژنامەگەریی (زانکۆی



میسووری)ن لە کۆڵۆمپیا لە ئەمریکا. رۆژنامەنووسان دەتوانن بچنە ریزی ئەو کۆمەڵەیەوە بەرامبەر بە پارەیەکی کەمو چاپەمەنیو بڵاوکراوەکانی ئەو کۆمەڵەیان چنگ بکەوێ کە یارمەتییان دەدا لە کاری رۆژنامەگەرییەکەیاندا. هەروەها بۆیان هەیە لیستێك وەرگرن بە ناوی ئەو رۆژنامەنووسانەی گرنگی دەدەن بە لێکۆڵینەوە لەو بوارانەدا پسپۆرییان هەیە تیایانداو هەموو لایە جۆراوجۆرەکانیان تاقی کردووەتەوە.

### پیسبوونی ژینگە

ئەمە بابەتێکە بۆ لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونو لە گەلێك لە وڵاتانی جیهانی سێهەمدا بووە بە بابەتی باسو لێکۆڵینەوە.

لە ئەنجامی گەشەکردنی خێرای شارە گەورەکان لە زۆر وڵاتاندا، پیسبوونی ژینگە گەیشتووەتە رادەیەکی سەرسوڕهێنەر. ئەم پیسبوونە هەندێ جار ئەنجامی پەلەکردنی کاربەدەستانە لە گواستنەوەی وڵاتەکەیاندا بۆ قۆناغی پیشەسازی بە شێوەیەکی بێسەروبەرانەی نارێك. هەندێ جاریش بەهۆی حکومەت خۆیەوە یا بەهۆی ئەو پرۆژە ناوخۆییە تایبەتە یا پرۆژەکانی کۆمپانیا بیانییەکانەوە پەیدا دەبێ. یەکێك لەو حەقیقەتانەی دەبنە مایەی ئازارو خەفەت، ئەوەیە کە زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێهەم، ژینگەی وڵاتەکەیان پیس دەکەن بەهۆی ئەم پەلەکردنەیان لە گواستنەوەی وڵات بۆ قۆناغی پیشەسازی. ئەم دەوڵەتانە بۆ ساڵانێکی دووروودرێژ، گوێیان نەدەدا بەو نرخە گرانەی دەکەوتە ئەستۆیان لە شێوەی مردنو گرفتاربوونی هاووڵاتیانو پەیدابوونی ئەو هۆیانەی کە مرۆڤ تووشی نەخۆشیی شێرپەنجە دەکەن، لە ئەنجامی پاشماوەی کارگەکان کە ژینگە پیس دەکەن.

لە کاتی باسکردنی ئەم مەسەلەیەدا، بەرازیلو مەکسیك دێت بە خەیاڵماندا، وەك دوو نموونە لەو دەوڵەتانەی کە دەناڵێنن بە دەست کێشەی پیسبوونی سامناکی ژینگەوە بەهۆی کارگەی پیشەسازیی بترۆکیمیاویو کارگەکانی ترەوە لەو دوو وڵاتەدا. ئەوەش راستە کە کۆمپانیا بیانییەکان زۆرجار لە وڵاتانی جیهانی سێهەمدا کارگەکانیان دادەمەزرێنن بۆ سوود وەرگرتن لە کەمیی کرێی کرێکارو نەبوونی یاسای پارێزگاریکردن لە ژینگە. پرۆژەکانی بواری کانگاکانو ژینگە لە خراپترین ئەو پرۆژانەن کە ئەو یاسایانە پێشێل دەکەن.

گۆڕانکارییەکی تر هەیە کە پەیوەندیی هەیە بەم بابەتەوەو شایستەی ئەوەیە بکرێ بە بابەتێکی لێکۆڵینەوەی رەخنە ئامێزی توند، کە بریتییە لە شاردنەوەی پاشماوە کیمیاویو تیشکییە سامناکەکان لە جیهانی سێهەمدا. چونکە دەوڵەتە پێشکەوتووەکان هەندێ لە وڵاتانی هەژاری جیهانی سێهەم فریو دەدەنو رەزامەندییان وەردەگرن لەسەر ئەوەی خاکی وڵاتەکەیان بکەن بە گۆڕستان بۆ شاردنەوەی پاشماوە پیسکەرە سامناکەکان کە لە ئەنجامی ئەو پاشماوانەدا پەیدا دەبن کە وڵاتە پێشکەوتووەکان بۆیان دەنێرن.

## فەوتانو لەکیسچوونی کەلتووری نیشتمانی

هەندێ لە دەوڵەتانی جیهانی سێهەم گوێنەدانو پشتگوێخستنێك بەخۆوە دەبینن لەلایەن خودی دەوڵەتەوە کە دەبێتە هۆی فەوتانو لەکیسچوونی کەلتووری کەمینەکان، ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە کە هان نادرێن بۆ پاراستنی کەلتوورەکەیان. ئەم هەڵوێستە بووەتە هۆی خێرا لەناوچوونو نەمانی چەند کەلتوورێکی گرنگ. ئەم حاڵەتە لە هەندێ لە وڵاتە پێشکەوتووەکانیشدا روو دەدا وەك ئەمریکاو ژاپۆنو ئوسترالیاو باشووری ئەفریقیا. کاتێك ئەم کەلتوورانە لەناو دەچن، ئەوە کەسیەتیی نیشتمانیی ئەو وڵاتە، یەکێك لە پایەکانی لەکیس دەچێ. رەنگە کاریگەریی هۆکانی راگەیاندنو کۆمپانیا بازرگانییە بیانییەکانیش ببنە هۆی تێکدانی کەلتووری نیشتمانی، هەروەها دەستتێوەردانو هێرشی سەربازی رەنگە کەلتووری نیشتمانی وا لێبکەن ببێتە پاشکۆی بەرژەوەندیی بێگانەو ملکەچیان ببێ.

پاشکۆیی لەباری ئابوورییەوە:

ئەمە یەکێکە لە کێشە هەرە گەورەکانی جیهانی سێهەم، چونکە لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم وڵاتانە سەربەخۆیی خۆیان بەدەستهێناوە — با هەر بە ناویش بێ — هەر پاشکۆیەکی تەواون بۆ دەوڵەتە خاوەن هێزو دەسەڵاتەکان. با لە سروشتی ئەم پاشکۆیەتییە تێبگەینو بزانین چییە؟، دەوڵەتە شوێنکەوتووەکانی جیهانی سێهەم چۆن دەناڵێنن بە دەستییەوە؟، چی لە توانادایە بکرێ بۆ کەمکردنەوەی ئەم پاشکۆیەتییەی بواری ئابووری؟، کێ سوودمەندە لەم بارودۆخە لەم سیستمە ئابوورییە؟



## بەشارستانیبوونی جیهانی سێهەم

ئەمەش هەر کێشەیەکی گەورەیە، چونکە جوتیاران هەوڵ دەدەن بۆ ئەوەی کارێکیان چنگ بکەوێ لەو یەك دوو شارە گەورەیەی هەن لە وڵاتدا، چی دەکرێ بۆ چارکردنی ئەم کێشەیە؟ ئەنجامەکانی چۆن دەبن؟ ئایا هیچ جووڵانو چالاکییەك لە ئارادایە بۆ بەدیهێنانی وابەستەنەبوون بە ناوەندی وڵاتەوە (لا مرکزیە)؟، کێن ئەو لایەنانەی سەرقاڵی ئەم کێشەیەنو تا چ رادەیەك سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە؟

## لەناوبردنی دارستانەکانو رووتکردنەوەی شاخەکان

لە زۆرێك لە وڵاتانی جیهانی سێهەمدا بە شێوەیەکی بەربڵاو دارستانەکان لەناو دەبرێن بۆ ئەوەی دارەکان بەکاربهێنرێن وەك وزەیەك بۆ ئامادەکردنی خواردنو گەرمکردنەوە بە رادەیەك کە ساڵ لە دوای ساڵ ناوچە دارستانییەکان کەم دەبنەوەو دەچنەوە یەك، ئەنجامەکانی ئەم کردەوەیەش وێرانکارییەو دەبێتە هۆی پیسبوونی ئەو شوێنانەی ئاوی بارانیان تێدا کۆ دەبێتەوە وەك شیوو جۆگەو گۆمەکان، رووتبوونەوەی شاخەکان، گۆڕانی کەشو هەوا، کەمبوونی بەرهەمەکانی دارستانەکان... هتد. لە راستیدا خەڵوز دروستکردن پێویستیی بە بڕێکی زۆر دار هەیە لە هەندێ وڵاتدا، هەروەها هەندێ لە وڵاتان دەناڵێنن بەدەست کەمیی نەوتەوە بە جۆرێك لە توانای هەژاراندا نییە بیکڕن.

## بارودۆخی ئافرەت

ژمارەیەکی روو لەزیادبوونی دەوڵەتانی جیهانی سێهەم دەستیان داوەتە ئەوەی ژیانو بارودۆخێکی باشتر ببەخشن بە ئافرەتو زیاتر وەك پیاو هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکرێ. لەگەڵ ئەوەدا کە زۆر کات سیاسەتی دەوڵەت دان دەنێت بەوەدا کە ژن دەبێ یەکسان بێ لەگەڵ پیاودا، بەڵام کاربەدەستانو هاووڵاتییانی ئاسایی هەندێ جار گوێ نادەن بە مەسەلەی یەکسانی پیاوو ژن — بە رادەیەکی کەم نەبێ —، وەك هەڵسوکەوتکردنیان لەگەڵ کەمینە نەتەوەییەکانو خێڵو تیرەو ئەو چینانەی نوێنەرایەتیی کەمایەتییەکان دەکەن لە وڵاتانی جیهانی سێهەمدا. هەروەها پێویستە گرنگی بدرێ بە کێشەی (باوکی لە جێی نەبووان) لە

هەندێ وڵاتانی جیهانی سێهەمدا، ئەم کێشەیە بریتییە لەوەی پیاوان ژن دەهێنن یا رەفتاری ژنو مێردایەتییان لەگەڵدا دەکەنو منداڵێکی زۆریان لێدەکەوێتەوە بەڵام هەست بە هیچ بەرپرسیاریەتییەك ناکەن بەرامبەر بە بەخێوکردنو سەرپەرشتیکردنیان. ئەم کەمیو ناتەواویی هەستکردن بەو ئەرکە لەلایەن پیاوانەوە لە هەندێ وڵاتانی جیهانی سێهەمدا شتێکی زۆر بڵاوە، دوای ئەوە ئیتر ئەرکی دەوڵەتو کۆمەڵە خێرخوازە تایبەتەکانە هەوڵ بدەن یارمەتیی ئەو ژنە هەژارانە بدەن کە پێویستیان بە یارمەتییە.

## تەرخانکردنی پارە بۆ بواری سەربازی

ئەم بابەتە یەکێکە لەو بابەتی لێکۆڵینەوە ئاڵۆزانە کە زەحمەتە باس بکرێن لە زۆربەی دەوڵەتانی جیهانی سێهەمدا، بەڵام ئەوەش راستە ئەوەی کە پێی دەگوترێ (بودجەی بەرگری) لە زۆربەی وڵاتاندا چ ئەوانەی پێشکەوتوون یا ئەوانەی تازە گەشە دەکەن، برێکی زۆری بۆ تەرخان دەکرێ کەچی بۆ بواری خوێندنو تەندروستیو رۆشنبیری بڕە پارەیەکی کەمیان بۆ دادەنرێ. دواتر دەبینین ئەو مەسەلانەی پێشتر باسمان کردن تەنیا باسی چارکردنی چەند رووداوێکی تایبەتو دیاریکراو ناکەن. ئێمە کە ریپۆرتاژێکی رۆژنامەوانی دەنووسین لەسەر ئەو بابەتانەی لە سەرەوە باس کران، بە زۆری لەگەڵ هەڵوێستو کردەوەدا مامەڵەو هەڵسوکەوت دەکەین، زیاتر لەوەی کە رووداوێك باس بکەین زۆربەی بەسەرکردنەوە ئاساییەکانی هەواڵ باسی چەند رووداوێکی دیاریکراو دەکەن، بەڵام کاتێك بە چاوی وردبینییەوە دەڕوانینە کۆمەڵگە، ئیتر دەست دەکەین بە هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ کردەوەکاندا، واتە چالاکییەکان، رێڕەوو رێبازەکان، هۆکان، ئەوانەی کاریگەرییان هەیەو چەند پرسیار لە خۆمان دەکەین، وەك: ئەم مەسەلەیە بە گشتی چی دەگەیەنێ؟، دەبێ چ کاریگەرییەکی هەبێ لەسەر کۆمەڵگەو تاك؟، چی روو دەدا لە مەودایەکی دوورودرێژی رۆژگاردا؟. کاتێکیش کە ئێمە باسی کارو کردەوەکان دەکەین، نەك رووداوە تاكو جیاوازەکان، ئەو کاتە لە تواناماندایە هەندێ جار، ریپۆرتاژو لێکۆڵینەوە یا لێکدانەوەیەکی زۆر وردتر بنووسین، ئەمەش کارێکی سادەو ئاسان نییە، چونکە ئەوە زۆر ئاسانترە کە بێین باسی هەواڵێك یا کارەساتێك بکەین کە تازە روویدابێ لەوەی بەسەرکردنەوەی هەواڵی کردەوەیەك بکەین کە دەخوێنرێتەوە.



پێشنیارێکی تر هەیە بۆ رۆژنامەنووسانی بواری لێکۆڵینەوەو ریپۆرتاژ، ئەویش ئەوەیە کە ئەوانە هەموو کاتێك ئەوە بخەنە پێش چاوی خۆیان لە کاتی گێڕانەوەی بابەتێکدا وشەو رستە گەلێك بەکار بێنێ کە پەیوەندییان هەبێ بە مرۆڤەوە، چونکە ئێمە توانای ئەوەمان نییە لە بابەتی رووت تێبگەینو پێویستیمان بەوە هەیە کە خەڵكو مرۆڤ بەرجەستە بکەین لە ژیانی رۆژانەیاندا، هەروەها پێویستیمان بەوەیە ئەوانە بگێڕینەوە کە بمانبەستێتەوە بە ئاواتو ئازارەکانی مرۆڤایەتییەوە. رەوشتو هەڵسوکەوتی کەسیەتییەکان، سەرگوزەشتەکان، چاوپێکەوتنە رۆژنامەوانییەکان، ئەو رووداوانەی خەڵك خۆیان دەیگێڕنەوە، ئەمانە هەموویان هۆگەلێکی کاریگەرن، شایستەیی نووسینەکە مسۆگەر دەکەن بۆ خوێندنەوەو مانایەکی زیاتر دەبەخشن بەو چیرۆکە هەواڵانەی دەیاننووسین. نەك هەر ئەوە، بەڵکو دەبێ ئاڵۆزترین هەواڵ بە شێوەیەکی سادە بگێڕینەوە ئەگەر بمانەوێ ئەنجامێکمان لێوەی دەستگیر ببێ. ئەو هەوڵو ماندووبوونە زۆرەی بەکاری دێنین لە ریپۆرتاژی رۆژنامەوانیدا هەمووی بەفیرۆ دەڕوا ئەگەر خوێنەر توانای ئەوەی نەبێ تێبگا لەوەی کە ئێمە دەیڵێینو دەینووسین.

# بەشی نۆیەم

## بەدواداچوونی ئەو بابەتانەی پەیوەندییان هەیە بە ژینگەوە

**نووسینی: محمود عبدالعزیز رۆژنامەنووس**
**لە رۆژنامەی (الاهرام). قاهیرە — میسر**

کاتێك هینری فۆرد یەکەم ئوتـومبێلی دروسـت کـرد، شۆڕشـێکی بـەرپا کـرد لـە بـواری گواستنەوەدا چ بۆ مرۆڤ چ بۆ کەرەستەی بازرگانی. ئەو سەرکەوتنەی فـۆرد، هـەموو جیهـانی گۆڕی، بەڵام پاش ئـەوە بـە دەیـان سـاڵ زاناکـان هەسـتیان کـرد ئـەو ئوتومبێلانـە گـازێکی زیانبەخش بڵاو دەکەنەوە لە بۆریی دووکەڵکێشەکانەوە بە جۆرێك کاریگـەریی خراپیـان دەبـێ لەسەر تەندروستیی مرۆڤو لەسەر ژینگە. پاش ئەوە مەسەلەی پارێزگاریکردن لە ژینگە بوو بە یەکێك لەو مەسەلانەی مرۆڤ بیری لێدەکردەوەو هەستی پێکرد. چونکە زۆربەی پرۆژەو کێـشەو گرفتەکانی وڵاتـە تازەپێگەیـشتووەکان پەیوەندییـەکی تـەواویان هەیـە بـە بابەتـە زانـستیو ژینگەییەکانەوەو پێویستە لەسەر بڕیار بەدەستان — هەروەها خـەڵك بـە گـشتی — شـارەزایی پەیدا بکەن لەسەر ئەو بابەتو حەقیقەتانە.

ڕۆڵی ئەو رۆژنامەنووسەی کە لەسەر ژینگـە دەنووسـێ، ئەوەیـە کـە هـەوڵو کۆشـشێکی بەردەوام بدا بۆ ئاگادارکردنـەوەی خـەڵكو زیـادکردنی رادەی زانیـاریی خـۆی لـەو بارەیـەوە. هەروەها پێویستە لەسەری توانای ئەوە بەدەست بێنێ لە زاراوەو زانیارییە هونەریو زانـستییە هەرە تایبەتییەکان تێبگاو توانای ئەوەی هەبێ بە شێوەیەکی ساکارو سادە لەسەریان بنووسـێ کە بگونجێ لەگەڵ پلەی خوێنەواریو تێگەیشتنی خوێنەرانداو، ئاگاداری ئەوەش بێ لـە کـاتی ئەنجامدانی کارەکەیدا هیچ کام لە حەقیقەتە زانستییەکان ون نەکاو نەخاتە پشتگوێ.

ڕەنگە سوودبەخش بێ ئەگەر ئەو رۆژنامەنووسەی لە بواری ژینگەدا دەنووسێ پێشینەیەکی زانستیی هەبێ لەو بوارەدا، وێنەگرتنیش کارامەییەکی پێویستە بۆ ئەو جۆرە رۆژنامەنووسانە.



چونکە یارمەتی وەرگرتن لە وێنـەگرێکی رۆژنامەوانییـەوە بـە پلـەی یەکـەم دێـت لـە کـاتی نووسینی ریپۆرتاژێك لەسەر رووداوە سیاسییەکان، هەوەرها هـەواڵی وەرزشو تـاوانو رووداوە ئاساییەکان، بەڵام بۆ بابـەتێك کـە پەیوەنـدیی بـە ژینگـەوە هـەبێ ئـەوە دەکەوێتـە کۆتـایی لیـستەکەوە. لەبـەر ئـەوە رۆژنامـەنووس ناچـارە خـۆی وێنـەکان بگـرێ، بـۆ نموونـە کاتێـك ریپۆرتاژێکم نووسیی لەسەر پیسبوونی هەوا لە تەپۆڵکە دەسکردەکانی میسرو تەپۆڵکەی (ابو الهول)ی مێژوویی، دەبوا رۆژێکی تەواوم بەسەر ببردایە لەگەڵ تاقمە لێکۆڵەرەوەکـەی سـەر بـە تاقیگەی پیسبوونی هەوا، هەروەها دەبوو سەرکەومە سەر لوتکەی یـەکێك لـە پەرسـتگەکانی (ابو الهول)و چەند وێنەیەکی ئامێرەکانی دەرخستنی پیسبوون بگرم کـە بەسـەر تەپۆڵکەکـەدا جێگیر کراون بۆ دیاریکردنی برو رێـژەوی ئـەو لـمە وردانـەی دەمێننـەوە لەسـەر پەیکەرەکـە، ئەمەش کارێکی قورسە بۆ وێنەگرێکی بواری رۆژنامەنووسی کە نە کـاتی هەیـەو نـە توانـای هەیە یا هەردووکیانی نییە.

لەنێو ئەو کێشەو گرفتانەی ژینگە کە پێویستە گرنگییەکی تایبەتییان بدرێتێ لە جیهـانی سێهەمدا، ئەو کێشانەن کە پەیوەندییان هەیە بـە پیـسبوونی هـەواوە بـە تایبـەت لـە شـارە گەورەکاندا، کارگەکانی دەرمانی لەناوبردنی مارو مێروو و بەکارهێنانی، خـراپ بـەکارهێنانی زەویی کشتوکاڵیو دارستانەکان.

ماوەیەکی دوورودرێژ ململانێیەك پەیدا بووبوو لە نێوان دوو بۆچووندا، یەکێکیان لایەنگری گەشەپێدانی ئابووری بوو، ئەویتریان لایەنگریی لە پاراستنی ژینگە دەکرد. وا دەردەکـەوێ کـە هەمووان لە ریزی ئەوانەدان کە لایەنگریی گەشەپێدانی ئابووری دەکەن لە هـەموو گۆشـەیەکی جیهاندا. وەك ئەوەی لە (وادی السلیکون) رووی دا لە شاری کالیفۆرنیـای سـەر بـە ویلایەتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کە هەرچی زەویو زاری بەپیتی باشی ئـەو ناوچـەیە هـەبوو درا بـە سەرمایەدارە خاوەن کارگەکان بۆ ئەوەی بیکەن بە بنکەیـەك بـۆ پیـشەسازییەك کـە رۆژێ لـە رۆژان وا گومان دەبرا کە پیشەسازییەکی بێ زیانـە بـۆ ژینگـە ئـەویش پیـشەسازیی ئـامێرە ئەلەکترۆنییەکانە، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات دەرکەوت کە ئەم جـۆرە پیـشەسازییە خـۆی زیـان دەگەیەنێ بە ژینگە. لەبەر ئەوە، ئەوانەی کاریـان دەکـرد لـە بـواری کـشتوکاڵیی دانەوێڵـەو خۆراکدا، ناچار بوون بۆ ئەوەی بگوێزنەوە بۆ دەشـتو شـیوەکانی کالیفۆرنیـای ناوەڕاسـت کـە

کەوتووەتە شوێنێکی دوورەوە گواستنەوەی پەیین بۆ کێڵگەکانو گەیاندنی سەوزەو میوەو بەرهەمەکانی تر بۆ بازاڕەکان بووە بە کێشەیەك بۆیان، هەروەها ئاویش بووە بە کێشەیەك بۆ ئەوانەی چوونەتە ئەو شوێنە.

لە هیندستاندا، کارەساتی (بوبال) ئەو کێشەیەی خستە روو کە هەندێ لە کۆمپانیا گەورە فرەڕەگەزەکان، بووبوونە هۆی پەیدابوونی ئەو کۆمپانیایانەی کە تایبەتمەند بوون لە بواری بەرهەمهێنانی دەرمانی مارو مێرووەدا. چونکە پاشتر دەرکەوت ئەو کۆمپانیایانە، ئەو دەرمانە مەترسیدارە کە بەکارهێنانی قەدەغە کراوە رەوانە دەکەن بۆ یەکێك لە دەوڵەتە تازە گەشەکردووەکان لە شێوەی چەند پێکهاتەی کیمیاویی جیاجیادا، تا لەو وڵاتەدا کۆ بکرێنەوەو بکرێن بە دەرمان لەژێر ناوێکی بازرگانیی تردا.

لە زۆربەی پایتەختو شارە گەورەکانی جیهانی سێهەمدا، پیسبوونێکی مەترسیداری هەوا هەیەو گرنگیی پێویستیشی پێنادرێ یاخود هەوڵ نادرێ بۆ کۆنترۆڵکردنی یا بەلای کەمەوە رێژەکەی کەم بکرێتەوە. لە میسردا یەکێك لەو کارانەی کە لە سەردەمی فیرعەونەکانەوە کراوە دروستکردنی خشت بووە بۆ بنیاتنانی خانوو و شوێنی نیشتەجێبوون لە قوڕو لیتە. لەو کاتەدا لافاوی ساڵانەی رووباری نیل بڕێکی زۆری قوڕو لیتە هێناوە لەگەڵ خۆیدا کە بە ملیۆنەها تەن مەزەندە کراوە، بەڵام پاش دروستکردنی بەربەستی بەرزی (ئەسوان)، ئەو قوڕو لیتەیە لە پشتی بەربەستەکەوە کۆ دەبوویەوەو لەگەڵ لافاوەکەدا بڵاو نەدەبوویەوە وەك پێش دروستکردنەکەی. لەم حاڵەتەدا خاوەن زەوییەکان بڕێك لە رووبەری خاکەکەیان دەفرۆشت بەو کەسانەی بێبەش بووبوون لە قوڕو لیتە بۆ دروستکردنی خشتی سوور. ئەم کارەش بووە هۆی لەناوچوونی چینێکی زەویی بەپیت لە ناوچەیەکی فراواندا. هەندێکی تر بۆ چارکردنی کێشەی خانوو و شوێنی نیشتەجێبوون پەنایان بردە بەر دروستکردنی خانوو لەسەر ئەو زەوییانەی کشتوکاڵیان لێدەکرا، بەڵام ئەو یاسایانەی لەم دواییەدا دەرچوون قەدەغەیان کرد خانوو لەسەر زەویی کشتوکاڵی دروست بکرێ یاخود زەوی هەڵبکەنرێ بۆ ئەوەی خشتی سووری لێدروست بکرێو سزایەکی قورس دانراوە بۆ ئەو کەسانەی ئەو کارانە ئەنجام دەدەن.

لە دارستانو جەنگەڵە فراوانەکانی (ئەمازۆن) لە (کۆلۆمپیا)، کێڵگەی نایاسایی (کوکە) بە شێوەیەکی فراوان بڵاو بوویەوە کە سوودێکی ساڵانەی زۆر دەگەیەنن بە کرێکارو خاوەن



کێڵگەکان بەهۆی ئەوەوە کە ماددەی (کۆکایین) بەرهەم دێنن لەو گیایانەی دەیڕوێنن هەر لەو کارگانەدا کە لە ناو دارستانەکەدا دروست کراون. بە جۆرێك دەوڵەتی کۆلۆمپیا ناچار بوو فڕۆکەو هێزی سوپا بەکار بێنێ بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو کارە. ئەو کێشەیە کاریگەریی خراپی هەبوو لەوەدا کە زیانی دەگەیاند بە دارستانەکانو لە ناردنی (کۆکایین) بۆ وڵاتانی تر.

رەنگە ئامادەکردنی ریپۆرتاژێکی رۆژنامەوانی هۆیەکی گونجاو بەکەڵك بێ بۆ چارکردنی مەسەلەی ژینگە وەك خۆم کردم کاتێك بابەتێکی رۆژنامەوانیم ئامادە کرد لەسەر پیسبوونی هەوا لە قاهیرە، من دەبوا زانیاری وەربگرم لە بەڕێوەبەرایەتیی هاتوچۆ لەسەر ژمارەی ئەو ئوتومبێلو لۆریو پاسانەی کە بە شەقامەکانی قاهیرەدا هاتوچۆ دەکەن. هەروەها رۆژنامەنووس دەتوانێ پشت ببەستێ بە خزمو دۆستانی خۆیەوە بۆ وەرگرتنی ئەو زانیارییانەی کە لە کەناڵە حکومییەکانەوە ناتوانێ بەدەستیان بێنێ. پاش ئەوە دەبوا ئەنجامی شیکردنەوەی کیمیاویی جۆری هەوا بەدەست بێنم لە تاقیگەی لێکۆڵینەوەی پیسبوونی هەوا لە (مەڵبەندی نەتەوەیی لێکۆڵینەوە). هەروەها لە وەزارەتی وزە زانیاریم وەرگرت لە بڕی ئەو سووتەمەنییەی لەو ساڵەدا بەکارهێنراوە. پاشتر دەبوو پەیوەندی بکەم بە بەڕێوەبەرایەتیی تەندروستیی گشتیو پیشەسازیی کۆلێژی پزیشکیی زانکۆی قاهیرەوە، بۆ وەرگرتنی زانیاری لەسەر کاریگەریی ئەو رەگەزە جۆراوجۆرانەی هەن لەو گازو دووکەڵەوە کە لە بۆریی دووکەڵکێشی ئوتومبێلەکانەوە دەردەچن وەك قوڕقوشمو هایدرۆکاربۆناتو هیتر.

پاش ئەوە دەبوو بڕۆیشتمایە بۆ دەستەی چاودێریکردنی کەشو هەوا بۆ ئەوەی باری کەشو هەوا، بخەمە سەر لێکۆڵینەوەکەو بزانم چ کاریگەرییەکی هەیە لەسەر رادەی پیسبوونی هەوا لە شاری قاهیرەدا. هەروەها دەبوو چەند وێنەیەك پەیدا بکەم کە پەیوەندییان هەبێ بە بابەتەکەوەو شت بخوێنمەوە دەربارەی پیسبوونی هەوا لە گۆڤارو راپۆرتە زانستییەکاندا. لە کۆتاییدا توانیم ریپۆرتاژێك ئامادە بکەم بە شێوەیەکی باش لەسەر کێشەی پیسبوونی هەوای شاری قاهیرە، رەنگە ئەو لێکۆڵینەوانەی ئەنجام دەدرێن کە بە لێکۆڵینەوەیەکی نموونەیی دادەنرێنو رۆژنامەنووس پشتیان پێ ببەستێ وەك سەرچاوەیەکی زانیاری، چەند لێکۆڵینەوەیەك بگرنە خۆ دەربارەی کاریگەریی قوڕقوشم لەسەر توانای فیکری کرێکاران لەو چاپخانەدا کە قوڕقوشم بەکار دێنن، هەروەها لێکۆڵینەوە دەربارەی کاریگەریی پیسبوونی هەوا لەسەر

کارمەندانی بواری هاتوچۆ لەوانەی کە رۆژانە هەشت کاتژمێر تووشی هەڵمژینی ئەو هەوایە دەبن کە پیس دەبێ لە ئەنجامی دووکەڵی ئوتومبێلەکانەوە.

سەبارەت بە لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی رۆژنامەوانی لەسەر ئەو بابەتە سەرەکییانەی پەیوەندییان هەیە بە ژینگەوە، رۆژنامەنووس دەتوانێ بیروبۆچوونێك بەدەست بێنێ لە ئەنجامی وردبوونەوەو سەرنجدانی خۆیەوە. بۆ نموونە رادەی دەنگەدەنگ لە شاری قاهیرە ساڵی **١٩٧٦** زۆر بەرز بوو بەهۆی قەرەباڵغیی ئوتومبێلو خراپ بەکارهێنانی هۆڕنەکانیانەوە، ئەم سەرنجدانە تایبەتییەی لەسەر ئەو کێشەیە چەند خوێندنەوەو نووسینی بەدوادا هات. ئەمجارەیان لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاری ئەنجام درا لەسەر سێ شارو گوندێکی دوور لە باشووری سودان. لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئەو تیمە پزیشکییەی سەرقاڵی لێکۆڵینەوەکە بوو بۆی دەرکەوت ئەو هەراوزەناو دەنگەدەنگە کاریگەرییەکی زیانبەخشی هەیە لەسەر تەندروستی بە جۆرێك دەبێتە هۆی لەکیسچوونی هەستی گوێلێگرتنو بیستنو بەرزبوونەوەی پلەی فشاری خوێنو گرژیی مێشك، کە ئەمانە رەنگە ببنە هۆی تووشبوون بە نەخۆشیی دڵ.

پاش خوێندنەوەی ئەم زانیارییانە، چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەوانیم کرد لەگەڵ سەرۆکی بەشی بیستنو قسەکردن لە زانکۆی (عين الشمس)و چەند وێنەیەکی ئەو نەخۆشانەم گرت کە توانای بیستنیان تاقی دەکرایەوە بۆ زانینی رادەی هاتنەخوارەوەی توانای بیستنیان. پاش ئەو لێکۆڵینەوە سەرکەوتووە کە نووسیم دەربارەی کێشەی هەراو دەنگی بەرز، هەڵمەتێك دەسپێکرا لە قاهیرە دژی ئەو کێشەیە کە ئەمە نیشانەی ئەو کاریگەرییەیە ئەو لێکۆڵینەوەیە هێنایە کایەوە.

بوارێکی تر هەیە بۆ لێکۆڵینەوەو ریپۆرتاژ لەسەر بابەتەکانی ژینگە ئەویش بریتییە لە پاراستنی ئاژەڵو گژوگیا لە نەمانو لەناوچوون. لە راستیدا وڵاتانی جیهانی سێهەم شوێن نیشتەجێی گەلێکە لە جۆرەها گیانلەبەری کێوی کە تووشی مەترسی دەبنەوە لە ئەنجامی گۆڕانو بەکارهێنانی فراوانی زەوییە کشتوکاڵییەکان کە کاریگەریی هەیە لەسەر ژینگەی سروشتی. لەبەر ئەوە پێویستە زۆر هەوڵ بدرێ بۆ پاراستنی هەموو جۆرە ئاژەڵێکی کێویو گژوگیاکان لە فەوتانو لەناوچوون، چونکە هەست بە خۆشی دەکرێ لە بینینی ئەو ئاژەڵو گیایانەدا، ئەمانە بە گەنجینەیەکی سروشتی دادەنرێن کە رەنگە سوودێکی زۆریان هەبێ بۆ مانەوەی رەگەزی مرۆڤ خۆی.



لە میسردا چەندین جار بابەتم نووسیوە لەسەر گرنگیی ناوچەی (رأس محمد) کە سێگۆشەی باشووری نیمچە دوورگەی سینایەو دەورە دراوە بە کەناڵی سویسو کەنداوی عەقەبە کە پڕە لە مرواریی جوانو لە هەموو گۆشەیەکی جیهانەوە خەڵك رادەکێشێ بۆ مەلەوانی تیایدا. ئەم ناوچەیە جێگەی سروشتیی هەڵۆ ماسیخۆرەکانە. هەروەها درەختی (مانجروف)ی تێدایە کە لە ئاوی تەنکی کەنار دەریاکاندا سەوز دەبێو توانای ئەوەی هەیە ئاوی شیرین لە ئاوی سوێری دەریا جیا بکاتەوە. لە ئەنجامی ئەو نووسینانەدا ناوچەی (رأس محمد) کرا بە ناوچەیەکی سروشتیی پارێزراوو بە یەکەم باخچەیەکی دەریایی نیشتمانی لە میسردا.

بوونی پێشینەیەکی زانستی شتێکی پێویستە بۆ ئەو رۆژنامەنووسەی گرنگی دەدا بەو بابەتانەی پەیوەندییان هەیە بە ژینگەوەو ئەو رۆژنامەنووسە دەتوانێ زانیارییەکی باش بەدەست بێنێ بۆ ئەم بوارە لە رێگەی خوێندنەوەی ئەو بابەتانەی رێکخراوە نێودەوڵەتییە جۆراوجۆرەکان بڵاوی دەکەنەوە، وەك (بەرنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەر ژینگە). پەیوەندیکردن بەم بەرنامەیەوە، دەبێتە هۆی ئەوەی رۆژنامەنووسەکە پەیوەندی پەیدا بکا لەگەڵ ئەو رێکخراوانەدا کە لەم بوارەدا کار دەکەنو ئاگاداریو زانیاری پەیدا بکا لەسەر ئەو بڵاوکراوەو چاپەمەنییانەی ئەو رێکخراوانە دەری دەکەن.

لە راستیدا ژینگە مەسەلەیەکە چەندین لقی زانستی لەخۆ دەگرێ وەك زانست، پزیشکی، تەندروستیی گشتی، چاودێریکردنی کەشو هەواو ئەندازیاری، رەنگڕێژیی شارەکان، ئابووریو زۆر شتی تر لە دیاردەکانی ژیانی مرۆڤایەتی، جگە لەوەش ئێمە پێویستمان بە تێگەیشتنو فێربوونی بەردەوام هەیە بۆ ئەوەی بگەینە پلەیەك بە باشترین شێوە بەروبوومی وڵاتەکەمان بەکار بێنینو کەمترین زیان بگەیەنین بە ژینگە. قووڵکردنەوەی ئەم هەستکردنە ئەرکی ئەو رۆژنامەنووسەیە گرنگی دەدا بە بابەتەکانی ژینگەوە.

# بەشی دەیەم

## بەدواداچوون و بەسەرکردنەوەی رۆژنامەوانیی ڕۆڵی ژن لە جیهانی سێهەمدا

**نووسینی: ئیدیت ئینکوازیما – ئاژانسی دەنگوباسی نیجیریاو فاتمە (ناوێکی خوازراوە) لە جەزائیر**

مێژووی بەشداریکردنی کارای ژن لە بواری گەشەکردنی سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتیی وڵاتی نیجیریا، دەگەڕێتەوە بۆ پێش سەردەمی ئیمپریالیزم. مێژوو جموجوڵو چالاکییەکانی شاژنە (ئەمینە)ی شاژنی (زاریا)ی تۆمار کردووە کە چەندەها نەبەردیی ئەنجام داوەو چەندەها کەسی بەتوانای هێناوەتە ژێر ڕکێفی خۆیەوەو ملکەچی کردوون لە بەشی باکووری ئەو وڵاتەدا. هەروەها مێژوو ناوی فومیلایو رانسومی – کوتی (دایکی پرۆفیسۆر ئولوکویی زانسومی – کوتی وەزیری تەندروستیی نیجیریا)ی تۆمار کردووە، کە بنکەیەکی بۆ خۆی دروست کرد لەو ناوچەیەدا کە تێیدا دەژیا، بۆ ڕێکخستنی کاروباری ژنانی نیجیریاو دابەشکردنیان بەسەر چەند گروپێکی فشاردا بە مەبەستی هەڵمەتبردن دژی یاسا ستەمکارەکانی ئیمپریالیزم، واتە دژی (ئیلیك ئیمبیوکوتا)ی فەرمانڕەوای ویلایەتی ئویو کە ناچار بوو واز لە تاجو تەختەکەی بێنێ لە ئەنجامی ئەو گوشارەی کوتیو گروپەکانی دژی دەسەڵاتەکەی بەکاریان دەهێنا. خانم کوتی دەستبەرداری تێکۆشانی بەردەوامی خۆی نەبوو لە پێناوی بەدەستهێنانی دادپەروەریو ژیانێکی باش بۆ ژنانو بۆ مرۆڤایەتی هەمووی.

لە ساڵی ١٩٢٩دا، لە شاری ئابا لە ڕۆژهەڵاتی نیجیریا ئافرەتان خۆپیشاندانێکی گەورەیان بەرپا کر دژی دەسەڵاتی ئیمپریالیزم بۆ ئەوەی ژنان هان بدەن بۆ نەدانی باجو سەرانە. لەو



خۆپیشاندانە توندو گەورەیەدا ئافرەتانی ناوچەکانی تری ڕۆژهەڵات بەشدار بوون تێیدا. هەروەها لە شاری ئەبوبو، ئافرەتان خۆپیشاندانێکی بێزارییان ساز کرد دژی سەرانەو باج، لەو خۆپیشاندانەدا پەنجا ئافرەت کوژرانو ژمارەیەکی زۆری تر بریندار بوون، ئەوەش کە فەرمانی دا بە گوللەبارانکردنی ئەو ژنانە کاربەدەستە داگیرکەرەکان بوون کاتێك ژنەکان ئەوەیان ڕەت کردەوە کە ڕێپێوانەکەیان واز لێبێنن. نەنکم بۆی گێڕامەوە کە ئەویش بەشداریی ئەو ڕێپێوانەی کردووەو خراوەتە بەندیخانەوە بەو بۆنەیەوە.

سەبارەت بە ژنی ئاسایی نیجیریا، ئەوە پێویستیی بۆ تۆمارکردنی ڕووداوەکانی مێژوو و بەسەرکردنەوەی ڕۆژنامەگەریی ڕۆژانە بۆ چالاکییەکانی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، کارێکی زۆر گرنگە. چونکە ئەگەر ئەو پوختەکورتە مێژووییە دەربارەی چالاکیی ئافرەتان تۆمار نەکرابێ کە لە سەرەتاوە باسم کرد، ئەو کاتە مافی ئەوەم هەبوو بپرسم چۆن دەتوانرا ئەو زانیارییانە لە نەوەیەکەوە بگات بە نەوەیەکی تر؟. لەبەر ئەوە پێویستییەکی زۆر هەیە بۆ تۆمارکردنی ڕۆژانەی چالاکیی ژنان لە نیجیریاو ئەفریقیا بەڵکو لە هەموو جیهانی سێهەمدا. ئەو کێشانەش کە بوونەتە ڕێگر لە بەردەم ئەنجامدانی ئەو ئەرکەدا کەمیو ناتەواویی پابەندبوونو گوێنەدانە بە مەسەلەکە لەلایەن خودی ژنو لە ڕۆژنامەگەریشەوە.

هۆی کەم گرنگیدان بەم ئەرکە لەلایەن خودی ئافرەتانەوە، وەك دەردەکەوێ دەگەڕێتەوە بۆ پێویستیی ژن بۆ دیاریکردنێکی وردی ئەو ڕۆڵانەی لەسەریەتی ئەنجامیان بدا چونکە زۆرێك لە ژنان هێشتا لەوە نەگەیشتوون کە ڕۆڵیان وەك ژنی ئاساییو دایکایەتیو ژنی ماڵەوە زیادی کردووەو ئەرکی هەوڵدان بۆ پەیداکردنی بژێویی ڕۆژانەی خێزانیشی چووەتە سەر. هەروەها گەلێك لە ژنان هێشتا لە ژێر عەبای مێردەکانیاندا خۆیان دەشارنەوەو حەز ناکەن دان بنێن بەوەدا کە ڕۆڵیان هەیە لە بواری ئابووریشدا، بۆ ئەوەی بارودۆخی ژیانیان سەرەوژێر نەکەن بەهۆی دان نان بەوەدا کە ژن تەواوکەری ڕۆڵی ئابووری مێردەکانیانن لە ژیانی خێزانیدا.

ئیتر کاتێك ژن هەستی بەوە کرد کە سەربارێکیان خستووەتە سەر بارە ئاساییەکەی خۆیانەوە، کاتی ئەوەیان نامێنێ کۆ ببنەوە بۆ گفتوگۆکردن لەسەر چۆنیەتیی بەدەستهێنانی ئەو ڕێگە باشانەی دەتوانن بەهۆیەوە ڕووبەڕووی ئەو کۆسپانە ببنەوە کە ئەرکە نوێکانیان دەیخەنە سەر شانیان چونکە ئیشی ڕۆژانەی قورسی ناوماڵو هەندێ جار کەمیەتی پارەی

پێویست بۆ دابینکردنی پێداویستیی ماڵ، دەبێتە ڕێگر لە بەردەم هاوکاریی بەکۆمەڵ لەناو ژناندا بۆ ئەوەی لە کێشەکانیان بکۆڵنەوەو هەوڵ بدەن چارەیان بۆ بدۆزنەوە. لەلایەکی ترەوە ژنان لەناو خۆیاندا یەك نین، خوێنەوارەکانیان دژی نەخوێنەوارانیان وەستاونەتەوە، لە بارودۆخێکی وەهاشدا، زەحمەتە بتوانن بەرەیەکی هاوبەش پێکبهێنن، چونکە خوێنەوارەکانیان بە کارێکی نەکردەنیی دەزانن خۆیان لە کۆشکە خەیاڵییەکانیانەوە بێنە دەرو دەستی خۆشەویستیو دۆستایەتی درێژ بکەن بۆ خوشکە نەخوێنەوارەکانیان. هەروەها نەخوێنەوارەکانیش کە باسی خوشکە خوێنەوارەکانیان دەکەن بە یاخیو لەخۆباییبوو و لووتبەرز ناویان دەبەن. لە حاڵەتێکیشدا کە ئەم پەرتەوازەییو دووبەرەکییە هەبێ، ئاشکرایە کە پێگەیەك نییە بۆ بەیەکگەیشتنو چاوپێکەوتن کە سەرنجی رۆژنامەگەری رابکێشێ بەلایاندا.

ئەنجا با باس لە خودی رۆژنامەوانی بکەین، بزانین ئایا بارودۆخی ئافرەت لەو بوارەدا باشترە لە دەرەوەی بوارەکە؟، نەخێر بە دڵنیاییەوە. گەلێك لە رۆژنامەنووسە پیاوەکان، تا ئێستاش، وەك شتێکی بێبایەخ سەیری جموجووڵو چالاکییەکانی ئافرەتان دەکەنو لایان وایە کۆڕو کۆبوونەوەکانی ژنان کۆبوونەوەیەکن ژنان کۆ دەبنەوە تیایدا بۆ چەنەبازیو باسی مۆدەی نوێو شتی تری لەو بابەتە لە مەسەلە بێ ماناو بێ کەڵکەکان کە هەر بە خەیاڵیشدا نایەت، لەبری ئەوەی بێن گفتوگۆو مشتومڕ بکەن لەسەر بابەتو بیرۆکە بایەخدارو گرنگەکان، ئیتر ئەوەی کە پیاوان لە کۆبوونەوەکانیاندا باسی شتی گرنگتر دەکەن لەوان ئەوە واز لێدێنین بۆ گفتوگۆی تر.

من خۆم هەندێ جار وا دەبینم کە بەدواداچوونی چالاکیی ئافرەتان کارێکە رۆژنامەوان بێزار دەکا، چونکە ژنان لە ڕێکوپێکیدا ناتەواونو بەڵکو ڕەنگە (چەتون)یش بن، بە بێ گوێدانە پلەی خوێنەواری یا ئەو ئەرکو پۆستانەی لەسەر شانیانە. بەڵام ئەمەش مانای ئەوە نییە کە من ڕێز لە خوشکەکانم ناگرم لە ئافرەتان چونکە من لە ڕاستیدا ڕێزو خۆشەویستییەکی زۆرم هەیە بۆیانو، ئەوەی کە روو دەدا وەك بە خەیاڵمدا دێت، ئەوەیە کە ژنان منیان بەلاوە باشترە لە کەسانی تر بۆ ئەوەی چالاکییەکانیان بەسەربکرێنەوەو ریپۆرتاژیان لەسەر ئامادە بکرێت.

کێشەیەکی تر کە رووبەڕووی بەدواداچوونی چالاکییەکانی ئافرەتان دەبێتەوە ئەوەیە کە نووسەر یا رۆژنامەنووس توانای ئەوەیان نییە بگەنە ناوچە گوندنشینەکان کە زۆربەی ژنانی وڵاتەکەم لەو ناوچانەدا دەژین. لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان سەلماندووە کە گەلێ بوار هەیە ژنان



پێویستییان بەوە هەیە تیایدا زیاتر بخرێنە ژێر تیشکی راگەیاندنو پڕوپاگەندەوە، لەنێو ئەوانەدا بواری تەندروستی، سەربردنی کات بە خۆشی، زانیاریی ڕێپیشاندان بۆ شت کڕین، شانۆ، بواری جلوبەرگو مۆدە.

تیریزا ئوجیبا کە نووسەرە لە رۆژنامەی (نیجیریا ستیتسمان)، دەڵێ: (بەڕێوەبەرانی دەزگاکانی رۆژنامەوانی، حەز ناکەن بەوەی بڕێکی زۆر بابەتی رۆژنامەوانی بڵاو بکرێنەوە لە لاپەڕەی تایبەت بە ژن لە رۆژنامەکانی جیهانی سێهەمدا، ئەمەش وەنەبێ هەر تایبەت بێ بە جیهانی سێهەمەوە، بەڵکو لە جیهانی یەکەمو دووهەمیشدا هەروایە). هەروەها تیریزا دەڵێت: هەر ئەمەشە بووەتە هۆی ئەوەی کە لە ئەمریکاو رۆژاوای ئەوروپادا گۆڤاری تایبەت بە ژن زۆر بن، بەڵام ئاماژەش بەوە دەکا کە خۆی بەختەوەرە بە درێژایی ماوەی کارکردنی وەك نووسەر لە رۆژنامە نیشتمانییە گەورەکاندا وەك (دەیلی تایمز)، چونکە سەربەستییەکی زۆری هەبوو لە هەڵبژاردنی بابەتەکان بۆ ئەو لاپەڕەیەی سەرپەرشتیی دەکرد، هەروەها گفتوگۆی دەکرد لەسەر کێشەکانی ژنان لەلایەنی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتیو هیترەوەو، کاربەدەستانی رۆژنامە کە لە کاتی پێویستدا سەرنجیان رادەکێشا بۆ چەند بوارێکی تر کە بایەخیان زیاتر بوایە بۆ ئافرەت.

لەلایەکی ترەوە (ئوناکو ئیکویجابولو) نووسەر لە رۆژنامەی (دەیلی ستار) دەڵێ: (هاوکارەکانو کاربەدەستانی رۆژنامە، هیچ دەست وەرنادەن لە کارەکەتەوە ئەگەر بزانن کارەکەی خۆت وەك پێویست جێبەجێ دەکەی). هەروەها (ئوناکو) رەزامەندیی خۆی دەربڕیوە لەو سەربەستییەی هەیەتی لە بەڕێوەبردنی ئەو لاپەڕەیەدا کە چاودێریو سەرپەرشتیی دەکا، ئاماژەش بەوە دەکا کە دەسەڵاتی ئەوەی هەیە کار بە کەسانی تر بسپێرێو پەسەندکردنو بڵاوکردنەوەی ئەو بابەتانەی بایەخیان هەیە بۆ ئافرەتو، بابەتی هەواڵیش هەڵدەبژێرێ بۆ رۆژنامەکە.

ئەو دوو ژنە نووسەرە کۆکن لەسەر ئەوەی کە ژنان دەیانەوێ رووداوو بابەتگەلێك ببینن‌و ببیستن‌و بخوێننەوە لەسەر تەندروستی، چونکە خێزان پشت دەبەستێ بە ژنەوەو ژنیش دەیەوێ ئەو زانیارییانە وەربگرێ کە بەهۆیانەوە بتوانێ سەرپەرشتیی خێزانەکەی بکاو توانای ئەوەی هەبێ چاری ئەندامانی خێزانەکەی بکا ئەگەر یەکێکیان تووشی نەخۆشی هات.

پرسیارێکی تر هەیە ئایا ژنانی ڕۆژنامەنووس رابوردوویەکیان هەیە لە بواری ڕۆژنامەوانیدا؟، وەلامەکەشی ئەوەیە کە لە مێژووی هۆکانی ڕاگەیاندنی نیجیریادا، شتێکی وا نییە ئاماژە بێ بۆ بوونی ژنانێك لە بواری ڕۆژنامەوانیدا کاریان کردبێ.

بەلام ئەمڕۆ سوپاس بۆ خوا، هەوڵو کۆششێکی بەئاگایانە لە ئارادایە لەپێناو خزمەتکردنی کاروباری ژنانداو، لە رادیۆو تەلەفزیۆنو ڕۆژنامەکاندا بەشی تایبەت کراوەتەوە بۆ گرنگیدان بە کێشەی ئافرەتو پێشکەشکردنی پێشنیار بۆ چارەکردنیان. (ئوناکو ئەکویجا بالو) دەڵێ ئەم هەوڵو کۆششانە خەریکن دێنە بەر، هەروەها زانکۆکانمان زیاترو زیاتر ئەو پۆلە کچو ئافرەتانە پێدەگەیەنن کە تایبەتمەندییان پەیدا کردووە لە بواری ڕاگەیاندنو پەیوەندیی جەماوەردا بۆ سەرپەرشتیکردنو بەڕێوەبردنی بەرنامەکان. هەروەها ئوناکو دەڵێ ئەم بەشانە بە زۆری پێویستییان بە گفتوگۆکردنە لەسەر ڕۆڵی ئافرەت چونکە ئەگەر تێگەیشتنێکی باش تێنەگەن لەو ڕۆڵە، ئەوا زۆر لە ژنان زەحمەتە بۆیان خزمەتو زانیارییەکی باش پێشکەش بکەن بە ژنان.

لە حەقیقەتدا نەوە یەك لە دوای یەکەکانی جیهانی سێهەم وایان دادەنا کە ژن دروست کراوە بۆ سەیرکردن نەك بۆ ئەوەی گوێیان لێڕاگیرێ بەلام ئەمڕۆ ژنانی جیهانی سێهەم ڕۆڵێکی تری خستووەتە پاڵ ڕۆڵە سەرەکییەکەی خۆی کە بریتییە لە پەیداکردنی پارووە نانەکەی بە رەنجەشانی خۆی. ژن وەك جاران نەماوە پێی بگوترێ (ئوریاکا) کە بە زمانی (ئیجبو) واتە دێتە سەر حازری بەڵکو بووە بە (ئوکباتاکو) کەواتە هاتووە بۆ ئەوەی بەشداری بکا لە هەوڵداندا بۆ بەدەستهێنانو پەیداکردنی سەروەتو سامان. ژنانیش پێویستە لەسەریان لەم گۆشەنیگایەوە سەیری خۆیان کەن، مێردەکانیشیان پێویستە لەسەریان دان بنێن بەو هەوڵو کۆششەی ژنانەندا کە دەیکەن بۆ بەشداریکردن لە بەدیهێنانی خۆشگوزەرانیی خێزاندا.

لەمیانەی ئەم پێشبڕکێیەوە بۆ دیاریکردنی ئەو ڕۆڵەی ئافرەتان لەسەر ژنە خوێنەوارەکان پێویستە لە کۆشکە خەیاڵییەکانی خۆیان بێنە دەرەوەو خوشکە نەخوێنەوار یا نیمچە خوێنەوارەکانی خۆیان لەخۆ بگرنو بە یەکەوە کار بکەنو پرسیار ئاراستە بکەن بۆ تێگەیشتنی باشتر لەو حاڵەی تیا دەژینو بەشداریی تایبەتیی خۆیان پێشکەش بکەن لەو بوارەدا.



بۆ نەگبەتی ژن ئەو کێشە ئایینیو کۆمەلایەتییانەی پەیوەندییان هەیە بە دابونەریتەوە هێشتا هەروەك خۆی ماوە، بۆ نموونە کاتێك کە پیاوێك لەوانەی کەڵکەڵەی خۆپەرستییان لەسەردایە، ئەگەر ویستی هەر ئارەزووەکانی خۆی جێبەجێ بکا، ئەوا پەنا دەباتە بەر کەلتووری ئەفریقیایی لەبارەی ژنهێنانەوەو مل دەنێ بۆ هێنانی بیست یا سی ژن بەگوێرەی توانای دارایی خۆی. بەلام ئەوەی کە سەبوورمان دەداتەوە لەم بارەیەوە ئەوەیە کە زۆرێك لە پیاوە خوێنەوارەکان باوەڕیان بەوە نییە کە دەوڵەمەندیو سامانی خۆیان بەوە بخەنە روو کە ژن کۆ بکەنەوە لە دەوری خۆیانو لە ژمارەیەکی زۆری منداڵ ئەملاو ئەولای بگرن، ئەو پیاوە تێگەیشتووانە دەزانن کە ئەوان قەرزاری مرۆڤایەتینو لەسەریانە تێبکۆشن بۆ ئەوەی ئەو قەرزانە بدەنەوەو سامانیان خەرج بکەن بۆ پێشخستنی وڵات.

لەگەڵ ئەوەدا کە ژنان لە ئەمریکای لاتینیدا کار دەکەن بە هەموو توانایەکیانەوە، کەچی هەژاری توند یەخەی گرتوون، هەروەها ڕێژەی خوێنەوار کەمە لەنێو ژناندا لە ئاسیا، لەبەر ئەوەی بواری ڕۆژنامەگەری دەبێ گرنگی بدا بەم کێشانەو چارەسەرییێکیان بۆ بدۆزێتەوە، هەروەها پێویستە کاری بەردەوام — نەك کاتی — دابین بکرێ بۆ ئەو ژنانەی شوویان کردووەو هەوڵ بدرێ بۆ ئەوەی ژن پشووی منداڵبوونو بەخێوکردن بەدەست بێنێ بە مووچەی تەواو. ئەمەش بۆ بەرزکردنەوەی کەسیەتیی ژن. بەهەرحاڵ ئەو ژنانەی شوویان کردووەو چوونەتە ماڵی خۆیان لە نیجیریادا ئێستە کاری بەردەوام دابین کراوە بۆیان.

لەم بارەیەوە پێویستە لێرەدا ئاماژە بکەین بەوە کە لە سەردەمی ئەم کۆمارەی دواییدا، یەکێك لە پارێزگارەکان کە ناوی (مایکل ئەجاسین)ەو پارێزگاریی ناوچەی (ئوندو)یە، فەرمانێکی دەرکردووە کە ژن لە حاڵەتی منداڵبوونو شیرداندا بۆی هەیە پشوو وەربگرێ بە مووچەی تەواو لەو ویلایەتەدا.

هەروەها لە نیجیریادا تێکۆشان بۆ ڕەخساندنی هەلی چونیەك لە کاردا خەریکە دێتە بەرهەم. لە بواری خوێندنی بالاو ئەکادیمیدا لە نیجیریا دان نراوە بە ڕۆڵی ژن لە بوارەکەدا، هەرچەندە ژمارەیان زۆر کەمە ئەگەر بەراورد بکرێن لەگەڵ ژمارەی پیاواندا. لەم بارەیەوە یەکەم ژن دانراوە بە جێگری سەرۆکی زانکۆ لە نیجیریادا لە ساڵی ١٩٨٥، ئەویش (جریسی ئالیلی — ویلیامز)ە کە دانراوە بە جێگری سەرۆکی زانکۆی (بینین)، بەلام ئەنجومەنی

نیشتمانی کۆمەڵەی ژنان کە (هیلدا ئادیلفیراسین) سەرۆکایەتیی دەکا، جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی ئەو کارانەی لەم بارەیەوە ئەنجام دراون هێشتا کەمەو پێویستە زۆرتر ژنـان دابنـرێن لـە پۆستە گرنگەکاندا.

سەبارەت بە ژنە رۆژنامەنووسەکانی جیهانی سێهەم، کە ئـەرکێکی گـرنگ لـە ئەسـتۆیانە ئەنجامی بدەن لە بواری رۆژنامەوانیی گەشەکردنی وڵاتدا، ئەوە بەردەوام دەبێ بەرجەستەیەك بن بۆ بەهاکانی رۆژنامەگەری، واتە دەبێ بابەتی رۆشنبیرکردنو کات بەسەربردنی خۆش پێشکەش بکەن بە خوێنەرانیانو هەواڵ کۆ بکەنەوەو بە بێ کەموکووڕی بڵاوی بکەنەوە. هەروەها دەبـێ ژنان کـۆ بکەنـەوەو ئامادەیـان بکـەن بـۆ جێبـەجێکردنی پرۆژەکـانی حکومـەت لـە بـواری پێشخستنی ناوچە گوندنشینەکاندا، بە مەبەستی باشکردنی ژیانی زۆربەی گەلانی ئەم وڵاتە لە ناوچە گوندو دەوارنشینەکاندا کە پێویستییان هەیـە بـە رێگـەوبانو کارەبـاو ئـاوو بگـرە بـە خواردنیش کە زیاتر ئازاری خەڵك دەدا.

من ئاواتـەخوازم ئـەو تۆمـەتی چـەتونیو کەللـەڕەقیو یاخیبوونـەی دراونەتـە پـاڵ ژنـە رۆژنامەنووسەکان لە کۆڵیان بێتەوە، چونکە ئەوانە هەندێ جار ناتوانن بە درۆو بە بێ ئارەزووی خۆیان پێبکەنو ناتوانن رێگە لە خۆیان بگرن لەوەدا کە لێرەو لەوێ بگەڕێن بە دوای هـەواڵو رووداوەکانداو حەز لە لێکۆڵینەوەو باسکردنیان بکـەنو، بـوێریو ئازایـەتییان هـەبێ، بـەڵکو هەندێ جار کەللەڕەقیشن بۆ ئەوەی دڵنیا بن لەو هەواڵو لێکۆڵینەوانەی بڵاویان دەکەنـەوە لـە رادەی داخوازیو پێداویستییەکانی جەماوەردا بێ.



## ئافرەت لە کۆمەڵگەی جەزائیردا

**نووسینی فاتمە**

بەدواداچوونو بەسەرکردنەوەی رۆڵی ئافرەت لـە کۆمەڵـگەی ئێمـەدا شـتێکی لـە نـەبوو گەڕاوەتەوە. پاش وەرگرتنی سەربەخۆیی، شۆڕشی جەزائیر رێگەی خۆش کرد بۆ (سـەرەتایەکی نوێ)ی بزووتنەوەی ئافرەتان لەو بوارەدا کە پەیوەندیی هەیە بە پـرۆژە سیاسـییە گەورەکانـەوە وەك (چاکسازیی کۆمەڵایەتی، چاکسازیی کشتوکاڵ... هتد).

ئافرەتانی جەزائیر رۆڵێکی گرنگیان بینی لە تێکۆشاندا بۆ رزگارکردنی نیشتمان. لە سـاڵی ١٩٦٦دا (یەکیەتیی گشتیی ژنانی جەزائیر) بەڵـگەنامەیەکی بڵاو کردەوە جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە پێویستە ژنان بەشدار بن لە کاروباری سیاسیدا لەگەڵ هاوبەشیکردنیان لە پرۆژەی دەرکردنی بڕیارەکاندا. لەگەڵ ئەوەشدا گۆڕانی سەرکردایەتی ئەو یەکیەتییە بوو بەهۆی گـۆڕانی هەڵـسوکەوتکردن لەگـەڵ ژنـداو لـەو کاتـەوە تـا ئێـستا، تـەنیا گرنگـی دەدرێ بـە کێـشە کۆمەڵایەتییەکان لەوانەی کە پەیوەندییان هەیـە بـە ژنـەوەو هـەر لـەو کاتـەوە یەکیەتییەکـە پێدادەگرێ لەسەر هاوبەشیکردنی ئافرەتان لە جێبـەجێکردنی پـرۆژە کۆمەڵایـەتیو ئـابووریو هاندانە سیاسییەکاندا.

لە ماوەی نێوانی ساڵانی ١٩٧٥و ١٩٧٨دا، دەستکراوە بە کارکردن لە پرۆژە گەورەکانـداو گرنگی دراوە بە دوو بواری سەرەکی: پێویستیی چاکسازی لـە بـواری دەسـتوورو یاسـادا، بـۆ رووبەڕووبوونەوەی (پێداویستییە نوێکان) لەگەڵ دانـانی تیـۆریی ئایدیۆلۆژیایـەکی نـوێ. لـەو گفتوگۆیانەدا کە لە ساڵی ١٩٧٦دا ورووژێنـرا دەربـارەی رەشنووسـی (پرۆگـرامو پەیماننامـەی نیشتمانیی جەزائیر)، هەوڵێکی تایبەت درا لـەسەر ئاستی عەقیـدەو بیروبۆچـوون بـۆ داڕشـتنو دیـاریکردنی کێـشەی ژن. رێکخـراوی ئافرەتـانیش بەشـداریی کـرد لـەو گفتوگۆیـەدا بـە پێشکەشکردنی بیروبۆچوونی خۆیان بۆ رزگارکردنی ئافرەت لە رێگەی بەشداری پێکردنیـان لـە پرۆسەی دروستکردنی نەتەوەو گەلدا، کاتێکیش کە کۆمەڵەی نیـشتمانیی جـەزائیر پێکهـات، رێزو پابەندیی خۆی پیشان دا بۆ پرەنسیپی یەکسانی لە نێوان ژنو پیاودا.

بەڵام ناکۆکیی نێوان دەقی نووسراوو ئەو واقیعەی کـە ژن تیایـدا دەژی شـتێکی بەرچـاوو ئاشکرایە. ئەو گوتارە سیاسییەی هۆکانی راگەیاندن بڵاوی دەکەنـەوە، گوایـا گرنگییـەکی زۆر

دەدەن بەوەی ئایدیۆلۆژیای سیاسیو کۆمەڵایەتیی چونیەکن، دوورە لە راستییەوە، چونکە لە واقیعدا رەتکردنەوەیەك هەیە بۆ دەستهەڵگرتن لە هەندێ دابونەریتو بەهاو تێڕوانینە کۆنەکان، بەڵکو رۆژنامەو هۆکانی راگەیاندن هەندێ بیروبۆچوونو تێڕوانین هەڵدەبژێرنو دەهۆڵی بۆ لێدەدەن بە تایبەت ئەو تێڕوانینەی کە دەڵێ: ژن سەرچاوەیەکی سەرەکییە بۆ مەترسی لە کۆمەڵگەداو، ژن هێزێکی خاوەن توانایە بۆ سەرەوژێرکردنی سیستمی کۆمەڵایەتی ئەگەر چاودێری نەکرێ لە کاتی نەبوونی بەهاو دابونەریتێك بیپارێزێو پارێزگاریی لێبکا.

ژن برێکی باش پێشکەوتنی بەدەستهێناوە لە رێگەی ئازادیدا پاش سەربەخۆیی، ئەمەش بەهۆی ئەوەوە کە خوێندن بووە بە خۆڕاییو رێگە دراوە پێیان بۆ کارکردن. بەڵام هێشتا — لە باری ئایدیۆلۆژییەوە — رووبەڕووی ئەو تێڕوانینە کەلتوورییانە دەبنەوە کە پێشتر گەڵاڵە بووە دەربارەیان، چونکە ژنانی وڵاتەکەم بەوە تاوانبار دەکرێن کە مەسەلە نەتەوەییەکان لە بەرچاو ناگرن، هەروەها، هەرکاتێك دەنگ بەرز بکەنەوە داوای ئەوە بکەن کە لە بواری کۆمەڵایەتیدا یەکسان بن لەگەڵ پیاواندا، بەوە تاوانبار دەکرێن کە کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی کەلتووری بێگانەوە. دابونەریت لە کۆمەڵگەی ئێمەدا هەموو قورساییەکی خستووەتە سەر ژن، تەنانەت ئەوەش کە پێی دەگوترێ (رێزگرتن لە ژن)، لە حەقیقەتدا رێزگرتنە لەو توانایەی کە هەیەتی لەسەر بەرگەگرتنی بەرامبەر ئەو ئازارو بەسووکی سەیرکردنو گرفتارییەی تووشی هاتووە.

تەنانەت ئەگەر ژن توانای هەبوو بەربەستەکان هەموویان راماڵێو سنوور ببەزێنێو چەند پلەیەك سەربکەوێو بگاتە بەرزترین پلە لەو دەزگایانەدا کە پیاوان کۆنترۆڵیان کردووە، هێشتا هەر بە هاوشانی پیاوان سەیر ناکرێ. ئەمەش هەر لەبەر ئەوەی هەندێ لەوانەی خاوەنی عەقڵێکی ناتەواوو ئاسۆیەکی سنووردارن لە بیرکردنەوەدا، خۆیان دەکوژن لە پێناوی زیندووکردنەوەی سیستمێکدا کە شۆڕش لەناوی برد. جگە لەوەش ئەو کارەی ئافرەت دەیکا، ئیتر کاری دەستی بێ یا هونەری یا فیکری بە پلەیەکی نزمتر سەیر دەکرێ ئەگەر بەراورد بکرێ لەگەڵ ئەو کارەدا کە لە ماڵەوە دەیکا.

هەروەها ئەو ئەرکە قورسەی ژنی کرێکار لە بەرپرسیاریەتیی ئیشی ماڵو کارەکەیدا بە شتێکی ئاسایی سەیر دەکرێو بە قوربانیدانێکی زیادەو نرخێك دادەنرێت کە دەبێ ژن بیدا بەرامبەر حەزو ئارەزووی خۆی لە گونجاندنی رۆڵی سەرەکیی خۆی وەك ژنی ماڵەوەو دایكو



رۆڵی وەك ژنێکی کارگەر. تەنانەت لە کاتێکدا کە کارکردنی ژن شتێکی پێویست بێ، هێشتا بەو شێوەیە سەیر ناکرێت کە پەیوەندیی هەیە بە مەسەلەی سەربەخۆیی ژنو ئازادیی کەسیەتییەوە.

ئافرەتی کرێکار ناچارە پابەندی سەنگو تەرازووی کۆمەڵگە بێتو لا نەدا لەو دابونەریتە کۆمەڵایەتیو کەلتوورییانەی لە کۆمەڵگەدا پەیڕەوی دەکرێن. لە واقیعدا ژن لە کۆمەڵگەی جەزائیردا لە نەبەردێکی بەردەوامدایە دژی دواکەوتوویی، چونکە کارێکی ئاسان نییە ژن خۆی رزگار بکا لە کاریگەریی (بابەتە قەدەغەکراوەکان)و بیروبۆچوونی رابوردوو، جگە لەوەش کەمیەتی دەزگای فێرکردنو رۆشنبیریو تەندروستیو کێشەی هاتوچۆکردن ئاستەنگی روو لە زیادی خستووەتە بەردەم ژن کە بتوانێ کاری دەرەوەو کاری ناوماڵ بگونجێنێ لەگەڵ یەکدا.

هۆکانی راگەیاندن لەبری ئەوەی تیشك بخەنە سەر ئەم کێشانەو بیانخەنە روو، زیاتر باری ژنیان قورس کردووەو هەموو کاتێك لۆمە لە ژن دەکەن، لە رێگەی پێداگرتنیان لەسەر رۆڵی ژن وەك دایكو بەڕێوەبەری ماڵو پیاهەڵدانیان لەم لایەنەوە. ژنانی وڵاتەکەم ئێستا تووشی نائومێدیو ماندووبوون هاتوون بە رادەیەك گرنگی نادەن بە کارکردنو بە ژیان بە گشتی.

یەکێك لەو کێشانە کە پێویستە تیشکیان بخرێتە سەر لەلایەن هۆکانی راگەیاندنەوە، کێشەی نایەکسانیی پیاوو ژنە بە شێوە راستەکەی، ئەمەش لەگەڵ ئەوەدا کە دەقە سەرەکییەکانی بەرنامەو پەیماننامەی نیشتمانیی جەزائیر، بڕیاری داوە لەسەر یەکسانیی پیاوو ژن، بەڵام لە حەقیقەتدا وا نییە چونکە ژن چۆن دەتوانێ سوود لە مافەکانی وەربگرێت وەك هاووڵاتییەك لە کاتێکدا کە لە ماڵەوە لەژێر چاودێریدایە. ئافرەتان وەك مرۆڤی ناکامڵ سەیر دەکرێن بە درێژایی ژیانیانو هەرگیز وەك ئەندامی کۆمەڵگە سەیر ناکرێن، ئەگەر ژنان لە وڵاتەکەی منو وڵاتانی تری جیهانی سێهەمدا زۆر منداڵیان دەبێ، ئەوە رەنگە لەبەر ئەوە بێ کە منداڵبوون تاکە رۆڵێکە کە کۆمەڵ دانی پێدا دەنێ بۆ ژن، هەر ئەوەشە بووەتە هۆی ئەوەی کە باسکردنی رێکوپێکی خێزان باسکردنە لە بارودۆخی ژن. ئەو سیاسەتە دیموگرافییانەی حکومەت پەیڕەوی دەکا بە گفتوگۆکردن دەربارەی رۆڵی ژن وەك دایك دەستی پێکرد، بەڵام تەنیا لە گۆشەنیگای ئابوورییەوە. لە راستیشدا ئەو پاشکۆیەتییەی کە ژن دەژی تیایدا، حاڵەتێکی جیهانییە تا رادەیەك، چونکە هەموو کۆمەڵگەکان پیاو دەیانبا بەڕێوە، لە جیهاندا

هیچ کۆمەڵگەیەك نییە هەردوو رەگەزەکە هاوبەش بن لە بەڕێوەبردنیدا، نە لە باری سیاسییەوە نە لە باری پیشەییەوە، یاخود هەردووکیان چونیەك هاوبەش بن لە پرۆسەی بڕیارداندا، ئەم کێشەو جیاوازییە پەیوەندییەکی توندوتۆڵی هەیە بە چەند فاکتەرێکی ئایینی، مێژوویی، کۆمەڵایەتی، ئابوورییەوە.

لە ماوەی ئەم چەند ساڵە کەمەی رابوردوودا، ئەو ژنانەی کار دەکەن لە بواری راگەیاندندا ژمارەیان زۆر بووە، کەچی ژمارەیەکی زۆریان نەگەیشتوونەتە پلەی سەرۆکی نووسەران. بەڵام ژمارەیەکی زۆر نووسەری ژن هەن کە بە شێوەیەکی زۆر باش کارەکانیان ئەنجام دەدەن، چونکە گەنجن‌و زۆرتر کەللەڕەقن لە نەوەکانی پێش خۆیان.

لە ئێستادا، چەند هەوڵ‌و کۆششێك لە ئارادایە بۆ باشکردنی بارودۆخی ژیانی ژنان، بە تایبەت لەلای ژنان خۆیانەوە، هەروەها چەندین کۆنگرەو کۆبوونەوە ساز دراوە بۆ گفتوگۆکردن لەسەر رۆڵی ئافرەت لەلایەن چەند ژنێکەوە کە مامۆستای زانکۆکانن بە هاوکاریی چەند ژنێکی رۆژنامەنووس‌و ئەوانەی لە بواری ژناندا کار دەکەن. ئەم کۆمەڵە ژنە گۆڤارێکیان بڵاو کردووەتەوە بە ناوی (بریزانس فام)، مەبەستیش ئەوەیە هەوڵ بدەن بۆ ئەوەی ژنان بتوانن بیروبۆچوونی خۆیان دەربڕن بە نووسین لە گۆڤارەکەدا.

هەروەها بەم نزیکانە گۆڤارێکی نوێی ژنانەی تر دەردەچێ بە ناوی (جەمیلە)وە. ناوی گۆڤارەکەش وەرگیراوە لە ناوی ژنە پاڵەوانی شەڕی رزگاریی نیشتمانییەوە. ئەم گۆڤارە گۆڤارێکی کۆمەڵایەتی‌و ئابوورییە، مەبەستی پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەیە کە هەیە لە بواری رۆشنبیریدا. چەند چاوپێکەوتن‌و کۆبوونەوەش کراوە لەگەڵ ژنە جەزائیرییەکاندا بۆ زانینی بیروڕایان دەربارەی گۆڤارەکەو ئەو بابەتانەی پێیان باشە لە گۆڤارەکەدا بڵاو بکرێنەوە... هتد.

ژنانی وڵاتەکەم تا ئێستا هەر گۆڤارە فەرەنسییەکان دەخوێننەوە کە لێی تێناگەن. گۆڤاری جەمیلە هەوڵ دەدا بەرز ببێتەوەو بگاتە ئاستی خواستەکانی ژنانی جەزائیر، هەروەها هەوڵ دەدا ئەو بابەتانە بڵاو بکاتەوە کە گرنگە بەلای ئافرەتە جەزائیرییەکانەوەو ئەم گۆڤارە لە پاشەڕۆژدا وەك ئەنجومەنێکی لێدێ بۆ گفتوگۆکردن لەسەر کاروباری ژنان.

ئەو ژنانەی بواری رۆژنامەگەری هەڵدەبژێرن بۆ کارکردن تووشی گەلێك کێشە دەبن، چونکە ژنی رۆژنامەوان لە حەقیقەتدا هەروەك (ژنێك) سەیر دەکرێ‌و ئەو کێشانەی تووشی ژنان دەبن



لە بوارەکانی تری کاردا، لە بواری رۆژنامەشدا تووشی دەبن. واتە گۆشەگیر دەکرێ‌و قەوارەیەکی تایبەتیی بۆ دادەنرێ. زۆر زەحمەتە بۆ ئافرەت کە دەربکەوێ‌و شوێنێکی دیاری هەبێ لە بوارێکدا کە تا ئێستا باوەڕ وابووە هەر بواری پیاوانە بە تەنیا، بە دەگمەن رێك دەکەوێ ژنە رۆژنامەنووسەکان بنێردرێن بۆ دەرەوەی وڵات بۆ بەدواداچوون‌و بەسەرکردنەوەی رووداوە جیهانییەکان، ئەمە ئەگەر هەر بیاننێرن. هەروەها ژنانی رۆژنامەنووس پلەیان بەرز ناکرێتەوە بەو خێرایی‌و ئاسانییەی پلەی رۆژنامەنووسە پیاوەکان بەرز دەکرێتەوە، تەنانەت ئەگەر شایانی ئەوەش بن. جگە لەم کێشەو گرفتانەی باسمان کردن، ژنان کۆت کراون لەلایەن مێردەکانیانەوە کە هیچ جۆرە هاوکارییەکیان لەگەڵدا ناکەن‌و لێیان تێناگەن، بەڵکو مێردەکانیان زۆرجار دەبنە کۆسپ لە بەردەم ئەو ژنانەیاندا کە بە شەو کار دەکەن یا سەفەر دەکەن بۆ دەرەوە یا ناوەوەی وڵات. ئەمەش وەك کۆتێك وایە رێگەی کارکردنیان لێدەگرێ.

لەگەڵ ئەوەشدا ژنە رۆژنامەنووسەکان پێویستە لەسەریان کە خۆڕاگر بن لەم نەبەردییەیاندا لە پێناوی بەدیهێنانی یەکسانیدا بۆ ژنان‌و نابێ خۆیان بدەن بە دەستەوەو دەبێ سەربکەون بەسەر هەموو ئەو کۆسپانەدا کە لە بەردەم رێگەی ئازادییاندا قوت بوونەتەوە. گۆڕینی ئەو حاڵەتی پاشکۆیەتییەی ئافرەت دەژی تیایدا، بە دەستی ئافرەت خۆی نەبێ نایەتە دی. جگە لەوەش دەبێ گۆڕانکارییەکی سەراپاگیر بکرێ لە بواری ئابووری‌و کۆمەڵایەتی لە کۆمەڵگەکانی جیهانی سێهەمدا، هەڵساندنەوەی ژن‌و بەرزبوونەوەی پێگەی ژن راوەستاوە لەسەر رادەی ئامادەیی خۆی بۆ تێکۆشان لە پێناوی بەدەستهێنانی مافەکانی خۆیدا.

شتێکی پێویستە بۆ کۆمەڵگەکانی جیهانی سێهەم کە لە نەبەردێکی بێووچاندان دژی دواکەوتوویی، وا لە ژنان بکەن کە تێبگەن لە توانای تەواوی خۆیان‌و رۆڵیان لە هەڵگرتنی ئەرکی قورسی دروستکردنی وڵاتەکەیاندا، نەك بەو سیفەتەی کە پاشکۆی پیاوانن بەڵکو وەك هاوشانێکی پیاوان لەو کارەدا.

# بەشی یانزەهەم
# رۆژنامەی بواری ئەدەبو وێژە

**نووسینی: وای لان جی. تو**

رۆڵی رۆژنامەنووسو ئەو ژیانەی لەگەڵ پیشەکەیدا دەیباتە سەر، چەندین بەشو لای لێدەبێتەوە. چونکە لە پەنای ئەو داهاتو دەسکەوتە سنووردارەی مرۆڤو ئەو پێداویستییە زۆرەی ژیاندا، کارکردنی رۆژنامەنووس لە زیاتر لە شوێنێك بووە بە حەقیقەتێك لە حەقیقەتەکانی ژیان. رەنگە گەنجێك حەز لەوە بکات ببێت بە رۆژنامەنووس یا نووسەرو لە سەرەتادا وەك نووسەرێك لە رۆژنامەیەك یاخود لە یەکێك لە رادیۆکاندا دەست پێدەکا. بەڵام ئەم نووسەرە ئەوەندەی پێناچێ روو دەکاتە کارکردن لە یەکێك لە گۆڤارەکاندا، یا روو دەکاتە کارکردن وەك لێکۆڵەرەوە یا سیناریۆنووسێك لە یەکێك لە تەلەفزیۆنەکاندا. دوور نییە هەر ئەم رۆژنامەنووسە پێش بکەوێ لە کارەکەیداو ببێ بە سەرنووسەر یا بەرپرسێکی بواری راگەیاندن، رەنگە روو بکاتە بواری کارکردن لە سیاسەتیشدا.

دواتر ئەو نووسەرە کە ژیانی خۆی تەرخان کردووە بۆ ئەم پیشەیە بۆی دەردەکەوێ زۆرجار ناچارە نەرمی بنوێنێو خۆی بگونجێنێ لەگەڵ ئەو حاڵەتانەدا کە پەیوەندییان هەیە بە خواستەکانی خۆیو خزمەتکردنی کۆمەڵگەوە. هەروەها بۆی روون دەبێتەوە کە ئەو کارەی ئەو دەیکا وەك نووسەرێك یەکێکە لەو هۆ زۆرانەی دەبنە مایەی بەدیهێنانی ئامانجەکانی گەشەکردنی نەتەوەییو ئابووری. ئەم بەشەی کتێبەکە، چەند نموونەیەکی کەمو چەند تێبینییەکی سادە دەخاتە روو دەربارەی جێگرەوەکانی نووسینی رۆژنامەگەری.

رۆژنامەی بواری ئەدەبی:

لەبەر ئەوەی سیستمی رۆژنامەوانی لە جیهانی یەکەمدا، بەرەبەرە نزیك دەبێتەوە لەو شێوازی نووسینەی راوەستاوە لەسەر لێکۆڵینەوەو شیکردنەوە، هەندێ لە رۆژنامەنووسان



هەست بەوە دەکەن کە دەبێ بواری پیشەگەریی رۆژنامەنووسان فراوان ببێ. رۆژنامەوانیی بواری ئەدەبی یەکێکە لە ئەنجامی کۆششی ئەوان لەم بارەیەوە.

دەتوانین زاراوەی (رۆژنامەی بواری ئەدەبی) لە رۆژاواداو بە تایبەتی لە ئەمریکادا بۆ سالآنی دەیەی سێهەم لە سەدەی بیستەمدا بگەڕێنینەوە، چونکە لە ساڵی **١٩٣٧**دا (ئیدوین هـ. فۆرد) بیبلۆگرافیایەکی دانا بۆ رۆژنامەی بواری ئەدەب. فۆرد لە پێشەکیی کتێبەکەیدا دەڵێ: زاراوەی رۆژنامەی بواری ئەدەب دانراوە بۆ خزمەتی ئەو ئامانجانەی بیبلۆگرافیا کە مەبەستیەتی، کە دەکرێ پێناسەی بکەن بەوەی بریتییە لەو نووسینانەی دەکەونە ئەو ناوچەیەوە کە رۆژنامەوانیو ئەدەب لە یەك جیا دەکاتەوە. رۆژنامەنووسی بواری ئەدەبی وەك خاڵی بەیەکگەیشتن وایە لە نێوان رۆژنامەوانیو ئەدەبدا. رۆژنامەنووس ئەو هەواڵانە کۆ دەکاتەوە کە تەوژمە سیاسییو کۆمەڵایەتییەکان روون دەکەنەوە پاشان نووسەری سەروتار، قسە لەسەر ئەم هەواڵانە دەکات لە بازنەیەکی کورتدا، کاتێك ئەو تەوژمە سیاسیو کۆمەڵایەتییانە، یا ئەو هەڵوێستانە جێگیر دەبن لە فیکرو بۆچوونو هەستی خەڵکدا بە رادەیەکی تەواو، ئەوە دەبنە کەرەستەیەك هونەرمەند ئەدەبەکەی خۆی لێوە هەڵێنجێنێ.

لە رێگەی باسکردنی وێنە ئاساوە، یا وتار، یا ستوونێکی ئەدەبی، یا ستوونێکی توانج ئامێزو گاڵتەکردنەوە لەمیانەی کۆپلە شیعرو قسەکردنێکی رەخنەگرانەوە رۆژنامەوانیی بواری ئەدەب دەتوانێ جیهانی دەوروبەری پێکبێنێتو هەڵیسەنگێنێ، کەواتە رۆژنامەنووسی بواری ئەدەبی ئەو نووسەرەیە هەستێکی رۆژنامەگەرییانەی تەواوی هەبێ بۆ بەدیکردنی دیاردە خێرا گۆڕاوەکان لەم ماوە جوولآوەی ئەو سەردەمەدا کە تێیدا دەژین، هەروەها دەبێ لە هەمان کاتدا هەستێکی ئەدەبیی وای هەبێ کە بتوانێ کەرەستەی هەواڵ کۆ بکاتەوەو بە چاوو دەستێکی هونەرمەندانەوە دایبڕێژێتەوە.

سەبارەت بە سەردەمو کاتی ئێستا، زاراوەی (رۆژنامەگەریی بواری ئەدەبی)، بە مانا ئەو شێوازە رۆژنامەوانییەیە کە کارامەیی هەبێ لە بەسەرکردنەوەی هەواڵو شیکردنەوەیدا بە بەکارهێنانی تەکنیکی نووسینی چیرۆك. هەندێ جار رۆژنامەگەریی ئەدەبی دەردەکەوێ لە شێوەی ریپۆرتاژێکی رۆژنامەوانیدا، یا نووسینی بابەتێك لە گۆڤارێکدا، یا دانانی کتێبێك، بەڵام ئەرکە سەرەکییەکەی هەر راگەیاندن یا کاتی خۆش بردنەسەر یا رۆشنبیرکردنی خوێنەرە.

لەگەڵ ئەوەشدا نووسەر لێرەدا مەودایەکی فراوانتری هەیە لە سەربەستی سەبارەت بە بەکارهێنانی شێوازو خستنەڕووی بابەتەکەی، وەك ئەنجامێك بۆ ئەمە نووسینەکە زیاتر چێژ دەبەخشێ بە خوێنەرو زیاتر پاڵی پێوە دەنێ بۆ خوێندنەوە.

زاراوەی (رۆژنامەگەریی بواری ئەدەبی)، جمکی زاراوەیەکی ترە کە پێی دەگوترێ (رۆژنامەگەریی نوێ)، کە لە ساڵانی شەستەکاندا مشتومڕێکی فراوانی وروژاند. بە بێ گوێدان بە ناو، رۆژنامەوانی ئەدەبی تا ئێستاش ئەو هونەرمەندییە کە رووداوو دیاردەکان دەخاتە پاڵ یەك لەمیانەی یەك تێڕوانینەوەو جیهانی دەوروبەری لێکدەداتەوەو هەڵیدەسەنگێنێ. وەك (نورمان سیمز) ئاماژەی پێدەکا لە کتێبەکەیدا بە ناوی (رۆژنامەنووسەکانی بواری ئەدەب)، رەخنەگران پێناسەیەکیان دانەناوە بۆ رۆژنامەی بواری ئەدەبی، چونکە نووسەرەکان خۆیان لەوە تێگەیشتوون کە نووسینەکانیان پێویستیی بە فیکرو وردبوونەوەیەکی قووڵ هەیە، هەروەها پێویستیی بە داڕشتنو بنیاتنانو دەنگێکی تایبەتو وردیییەکی زۆر هەیە. لەگەڵ ئەو مەرجانەشدا، هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی بەرامبەر ئەو بابەتانەی دەنووسرێنو گەڕان بە دوای مانای شاراوە لە نووسینەکاندا، رۆژنامەی بواری ئەدەبیی هاوچەرخ جیا دەکەنەوە لەوانی تر.

وا دەردەکەوێ بۆچوونی فۆرد دەربارەی رۆژنامەگەریی ئەدەبی بەسەر گەلێك لە کارە رۆژنامەوانییەکانی جیهانی سێهەمدا جێبەجێ دەکرێ. بۆ نموونە لە وڵاتی چیندا، جۆرە نووسینێکی ئەدەبیی هاوشێوە هەیە پێی دەگوترێ (ئەدەبی رۆژنامەگەری). ئەم جۆرە نووسینە ئەدەبییە چینییە، ئەو چیرۆکانەش دەگرێتەخۆ کە باس دەکا لە هەندێ رووداوی راستیو گێڕانەوەی رووداوە مێژووییەکان لەلایەن هەندێ کەسەوەو ئەو کارە نموونەییانەی رۆژنامە شۆڕشگێڕییەکان ئەنجامیان دەدەن. لەگەڵ ئەوەشدا، واتاو تەکنیکی رۆژنامەگەریی ئەدەبیی رۆژاوا هەندێ نیشانەو رێڕەوی نوێیان خستووەتە بەردەم رۆژنامەنووسە ئەدەبییەکانی جیهانی سێهەم لە رێگەی هەوڵدانیاندا بۆ بەدیهێنانی سەکۆیەك کە زیاتر گوزارش بکا لە بیروبۆچوونەکانیان.

پیشەی رۆژنامەنووسیی ئەدەبی، وەك نورمان سیمز دەڵێ: پێویستیی بە چوونە قووڵاییو بنجو بناوانی بابەتەکەو بنیاتنانی چوارچێوەیەك بۆیو بە وردی سەرنجدانی بابەتەکەیە.



بە تەواوی خەریکبوونو چوونە ناو بابەتەوە، لەمیانەی بەسەرکردنەوەی چیرۆکە هەواڵەکاندا، رۆژنامەنووسی ئەدەبی، وردە وردە خۆی تەرخان دەکا بۆ ئەو بابەتەی کاری بۆ دەکا، ئەمەش بۆ ئەوەی هەموو شتێك دابنێ لە شوێنی خۆیداو لە دیدگایەکی راستەوە بۆ ئەوەی تا بۆی دەکرێ وردبێ لە کارەکەیدا. بۆ ئەوەی رۆژنامەنووس بەم شێوەیە بچێتە قووڵایی بابەتەکەوە، پێویستی بەوەیە چەند هەفتە یا چەند مانگ، رەنگە چەند ساڵێك خەریکی ئەو کارە بێت، ئەمەش راوەستاوە لەسەر ئەوەی ئەو نووسەرە خۆی ئامادە دەکا بۆ نووسینی بابەتێك یا دانانی کتێبێك. بۆ نموونە: جۆن میلز ماوەی پێنج مانگ لە گەڕاندا بوو لە شوێنە ترسناکەکانی نیویۆرکدا لەگەڵ پۆلیسێکی نهێنی بۆ ئەوەی بابەتێك بنووسێ لەسەر پۆلیسی نهێنی. هەروەها ترومان کابوت پێنج ساڵ خەریکی لێکۆڵینەوە بوو لەسەر مەسەلەیەکی کوشتن لە کانساس بە مەبەستی ئەوەی ئەو رووداوە سەرلەنوێ زیندوو بکاتەوە لە کتێبێکدا بە ناوی (لەگەڵ بڕیاری پێشوەختدا).

هەروەها تۆم ولف حەوت ساڵی رەبەقی بردەسەر لە چاوپێکەوتنو نامەگۆڕینەوە لەگەڵ فڕۆکەوانو ئەوانەی دەچوونە ئاسمانو ژنو کەسوکارەکانیان، جگە لە سەیرکردنو لێکۆڵینەوەی ئەرشیفەکانی ئاژانسی کاروباری ئاسمانیی ئەمریکا (ناسا)، بۆ ئەوەی باسی ئازایەتیو بوێریی ئەو فڕۆکەوانانەی سەرقاڵی راهێنان بوون بۆ گەشتە ئاسمانییەکان، لە کتێبەکەیدا، بکا بە ناوی (تاقمی تەواوو راست).

هەندێ رۆژنامەنووسی تر هەن زیاتر دەچنە ناو بابەتەکانەوەو بەشداری دەکەن لە رووداوەکەشدا، وەك چۆن (جۆرج بلمبتون) بوو بە ئەندامێکی تیمی تۆپی پێی (شێرەکانی دیترویت) بۆ ئەوەی باسی ئەزموونی یاریزانێکی تۆپی پێ بکات لە کتێبەکەیدا بە ناوی (پڵنگێك لە کارتۆن). هەروەها، هنتر تۆمبسون لەگەڵ هبلز ئینجلزدا سواری ماتۆڕ دەبوو کە تاقمێکی ماتۆڕسوار بوونو، ئەوەندەی نەمابوو گیانی خۆی لەدەست بدا لەم هەوڵەدا، ئەمەش لە کاتی دانانی کتێبەکەیدا کە بەنیاز بوو بینووسێ بە ناوی (فریشتەکانی دۆزەخ) کە چیرۆکێکی سەیرو ترسناکە. رۆژنامەنووسێکی تر بە ناوی (نورمان میلر) بەشداریی کرد لەو رێپێوانەدا کە لە ساڵی ١٩٦٧ لە واشنگتۆن ساز کرا، لە پێناوی ئامادەکردنی کتێبەکەیدا بە ناوی (سوپاکانی شەو).

لەم جۆرە حاڵەتانەدا کات وەك بەربەستو کۆسپێکی سەرەکی وایە بۆ رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم، چونکە رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم توانای ئەوەیان نییە ئەو هەموو کاتە بەرنەسەر لە بەدواداچوونی چیرۆکە هەواڵێك یا تەنیا بابەتێك وەك هاوکارە رۆژاواییەکان. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو حەزو ئارەزوو و دڵسۆزییە پاکەی ئەو رۆژنامەنووسانە هەیانە، رەنگە هەندێ لەو شتانەیان بیر بخاتەوە کە ئەوان بە دوایدا دەگەڕێنو بیرۆکەی وایان بۆ دابێن بکا لە ئەنجامدانی چیرۆكو گۆشەو بەدواداچوونەکانیاندا سوودی لێوەربگرن.

## چوارچێوەی بابەت

لە کاتێکدا کە دەبینین چوارچێوەی رۆژنامەگەری پەیوەندیی بە کاتەوە هەیە بە شێوەیەکی ئاسایی، بەڵام رۆژنامەوانیی بواری ئەدەبی زۆرجار شێوازێکی ئاڵۆزتر لەخۆ دەگرێ کە بابەتەکە نزیك دەکاتەوە لە چیرۆکی کورت یا رۆمانێکی گێڕانەوە. تۆم ولف، رۆژنامەگەریی ئەدەبی (یا وەك خۆی ناوی ناوە رۆژنامەگەریی نوێ) لەوەدا چڕ دەکاتەوە کە بریتییە لە بەکارهێنانی تەکنیکی چیرۆك لە چوارچێوەکەیدا کە بینا کراوە لەسەر دیمەن بە دوای دیمەنداو گفتوگۆکردنو بیروبۆچوون، هەندێ جاریش لەگەڵ بەکارهێنانی مۆنۆلۆژی ناوەوەی کەسەکانو باسێکی زیندوو و راستەقینەی ژیانیان وەك جۆرو شێوەی جلوبەرگو هەڵسوکەوتکردنی کەسیەتییەکان لەگەڵ باسی دوورودرێژی ئەو شتانەی دەوروبەریان. لەم حاڵەتەدا توانای چاوی رۆژنامەنووس بۆ بەدیکردنی شتە وردەکانو هەڵگرتنەوەیانو بەهێزیی سەرنجدانو شێوازی چاوپێکەوتنەکانو لێهاتوویی لە باری زمانەوانییەوە دادەنرێن بە مەرجو پێداویستییەکی سەرەکی بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکە.

بەلای (ولف)ەوە ئەم شێوازانە هێزو توانایەکی بێ وێنە دەبەخشن بە رۆمانی واقیعی. لەبەر ئەوەی کە زۆربەی رۆماننووسەکانی سەدەی بیستەم لە رۆژاوادا وازیان لەوە هێنا کە وەك (مێژوونووسێك بن بۆ مێژوو)و گرنگییان داوە بە ئەفسانەو سەرگوزەشتەکان. نووسەرانی رۆژنامەی نوێ، ئەو ئەرکەیان خستووەتە سەر شانی خۆیان کە رۆڵی (سکرتێرەکانی کۆمەڵگە ببینن). بەرهەمەکانی ولفو چەند کەسانێکی تر لە رۆژنامەنووسان کە لە کتێبەکەیدا کۆی کردوونەتەوە وێنەی شێوازە جۆراوجۆرەکانو ئەو بابەتە فراوانانەی ئەم جۆرە نووسینە ئەدەبییە



باسیان لێوە دەکا بخاتە پێش چاو جگە لەو گۆڕانکارییانەی هاتوون بەسەر شێوازی ژیاندا لە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە شەستەکاندا.

ئێستا شێوازی نووسینو هەندێ لەو رێگەیانەی رۆژنامەنووسە نوێیەکان داکۆکییان لێدەکردو لەو کاتەدا وا دەردەکەوت قاڵبێکی نوێگەرایەتییان بە بەردا کرابێ، بوونەتە سیمایەك بۆ نووسینی رۆژنامەوانیو هەموو کۆکن لەسەری. بۆ نموونە، سەرەتایەکی چیرۆك ئاسا لە نووسینەکەدا، یەکێکە لەو فێڵە زۆرانەی بەکار دەهێنرێن بۆ سەرنجڕاکێشانی خوێنەر لە رێگەی چیرۆکێکەوە وێنەیەکی ئەو کەسیەتییەیان بۆ دەکێشێ کە دەیانەوێ چاوپێکەوتنی لەگەڵدا بکرێ لەگەڵ باسکردنی رەوشتو هەڵسوکەوتەکانی... تا دوایی.

شێوازی بنیادنانی چیرۆك لە رۆژنامەی ئەدەبیدا دەبێ بابەتییانە بێ، واتە تەرخان بکرێ بۆ بابەتەکە یا لە شێوەی باگراوند یا گێڕانەوەدا بێ، وەك لە زۆربەی بەرهەمەکانی هنتر تۆمبسون، هەروەها لە رێگەی بەکارهێنانی ئەو فێڵانەوە کە لە گێڕانەوەدا بەکار دەهێنرێن وەك پەیوەندی، رووبەڕووبوونەوە، گێڕانەوەی بەرامبەر. نووسەر دەتوانێ لێکدانەوەیەکی کۆمەڵایەتیو بگرە سیاسیش بخاتە روو بۆ بیروبۆچوونو رووداوەکان.

لە راستیدا رۆژنامەنووس لە وڵاتە تازەپێگەیشتووەکاندا مێژوو دەنووسنەوە، لەگەڵ پەرەسەندنی گەشەکردنی وڵاتو هەندێ جار گۆڕانو نائارامیو ناجێگیریی سیاسەتی حکومەتەکانو تێکچوونی سیستمە سیاسییەکان، ژمارەیەکی زۆر لەو رۆژنامانە ون دەبنو کێشەکان زیاتر ئاڵۆز دەبن. ئیتر خێرا نووسینی رۆژنامەنووسەکان دەبنە تۆمارێك بۆ سەردەمە گۆڕاوەکان پێش ئەوەی کتێبێك دابنرێ دەربارەی ئەو مێژووانە.

## دەنگ

رەنگە ئەو دیاردەیەی کە زۆرترین مشتومڕ بەرپا دەکا لە رۆژنامەی بواری ئەدەبیدا، دەنگ بێت. ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە کە زۆربەی نووسینەکانی ئەو بوارە پەیوەندییان هەیە بە خودو لێکدانەوەوە. لەبەر ئەوەش کە رۆژنامەگەریی ئاسایی لە جیهانی یەکەمدا خۆی بە بابەتییانە دادەنێ، رۆژنامەی ئەدەبی روو دەکاتە بواری رەخنەگرتن. بەڵام لە جیهانی دووهەمو سێهەمدا دەبینین کە دەنگی رۆژنامەنووس یا ئەوەی چیرۆك دادەنێ دیاردەیەکی گرنگترە بۆ هۆکانی

راگەیاندن. لەبەر ئەوەش کە زۆربەی هۆکانی راگەیاندن هی دەوڵەتن یا پەیوەندییەکیان هەیە بە حزبێکەوە یا پابەندن بە گەشەکردنی ئابووریو نەتەوایەتییەوە، خودیەتی زۆر کات دەبێتە یەکێك لە حەقیقەتەکانی ژیان نەك تەنیا بابەتێك بێ بۆ مشتومڕکردن لەسەری. پێوەری دادپەروەریو هاوسەنگی لە کاتی باسکردنی بابەتە جۆراوجۆرەکاندا لە وڵاتێکەوە دەگۆڕێ بۆ وڵاتێکی تر، بەڵام دەنگی رۆژنامەنووس لە وڵاتانی جیهانی سێهەمدا دەنگێکی گرنگو زیندووە. دەنگی رۆژنامەنووس یا هۆکانی راگەیاندن — یا هەردووکیان — لە شێوەی پێشکەشکردنی زانیاری بە لێکدانەوەو شیکردنەوە جگە لەو بیروبۆچوونانەی پشت دەبەستن بە زانیاریو ئاگادارییەکی فراوان، نرخی هەر تەواو نابێ بەلای جەماوەرێکەوە کە رووبەڕووی تەوژمو شەپۆلی تازەگەریو پێشکەوتن بووەتەوە. چونکە زانیاریو بیروبۆچوونی تایبەت لەسەر بابەتەکان یارمەتیی خوێنەر دەدەن لەسەر تێگەیشتن لە بارودۆخی ئاڵۆزی بەردەوام گۆڕاودا.

## وردی

رەنگە جیاوازیی سەرەکی لە نێوان رۆژنامەگەریی بواری ئەدەبو چیرۆکە رۆمان ئاساکان، لەوەدا بێ کە رۆژنامەگەریی ئەدەبی حەقیقەت بخاتە روو لە رێگەی بەکارهێنانی هونەرو تەکنیکی نووسینی رۆمانەوە. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە حەقیقەتەکان جیاواز بن لەگەڵ یەکدا. لێرەدا پێوەر بریتییە لە وردی. رۆژنامەنووس دەتوانێ لە کاتی پێشکەشکردنی حەقیقەت یا لێکدانەوەو شیکردنەوەیدا خەیاڵو بۆچوونی خۆی بەکار بێنێ، ئەمەش بەو مانایە نییە کە تۆ بێیت حەقیقەتی وەهمی بۆ خۆت دروست بکەیتو بە نارەوا سوود لەو ئازادییە ئەدەبییە وەربگری لە تێکدانو مل بادانی حەقیقەتدا، تا وای لێبکەیت بگونجێ لەگەڵ ئەو مەبەستەدا کە تۆ دەتەوێ.

هەر لەم بارەیەوە پێمان وایە کە هەڵگرتنی دەفتەرێك یا ئامێرێکی تۆمارکردن گرنگییەکی زۆری هەیە بۆ رۆژنامەنووسو لە کاتی سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی دیمەنەکان، یا رووداوەکان یا ئەو گفتوگۆو قسانەی کەسیەتییەکان دەیکەن پێویستە لەسەر رۆژنامەنووس زۆر ورد بێو دووبارە دڵنیا بێت لەو یاداشتانەی نووسیونی یا ئەو شریتانەی تۆماری کردوون.



وەك (جۆن هیرسی) دەڵێ کە چەندین ساڵی بردووەتە سەر لە کارکردن لە گۆڤاری (تایم)دا، شتێك نییە پێی بگوترێ (بەدواداچوونو ریپۆرتاژی رۆژنامەوانیی بابەتییانە)، چونکە ژیانی مرۆڤ ئەوەندە خێرا گۆڕانی بەسەردا دێت، بە هیچ جۆرێك فریای ئەوە ناکەویت بیکەیت بە ریپۆرتاژێکی رۆژنامەگەری. ئەو کاتەی تۆ دەتەوێ لە کۆی دە حەقیقەت نۆ دانەیان تۆمار بکەیت، ئەوە زانیاریو بابەتەکەت بە بیروبۆچوونە تایبەتەکەی خۆت رەنگ کردووە. ئەوەی رۆژنامەنووسی ئەدەبی هەوڵی بۆ دەدا، تێپەڕ ناکا لە دان نان بەو حەقیقەتەداو دەبێ خودی بێت لەو هەوڵەدا کە دەیدا بە بەدەستهێنانی مەعنایەك لەم جیهانە زۆر ئاڵۆزەدا. ئەو لەبری ئەوەی تەنیا رووداوەکە وەك هەیە بیگوێزێتەوە هەوڵی ئەوە دەدا رووداوەکە لێك بداتەوەو ماناکەی شی بکاتەوە بۆ ئەوەی بگا بە (حەقیقەتی) زیاتر.

## رۆژنامەگەریو چیرۆکە رۆمان ئاساکان

کاتێك رۆژنامەنووس رووداوگەلێکی گەورە بە چاوی خۆی دەبینێ، یا چەند تێبینییەکی دیاریکراو دەردەبڕێ کە ناتوانێ لە ریپۆرتاژێکی رۆژنامەوانیدا گوزارشی لێبکاو بیانخاتە روو، لەم حاڵەتەدا چاری هەر ئەوەیە کتێبێك دابنێ لەسەر رووداوەکە، ئیتر لە شێوە گێڕانەوەدا بێ یا هەر شێوەیەکی تر.

لەو کاتەدا کە رۆماننووس (ترومان کابوت) بۆ یەکەمجار رۆمانەکەی خۆی بڵاو کردەوە بە ناوی (لەگەڵ بڕیاری پێشوەختدا)، سوور بوو لەسەر ئەوەی کتێبەکەی پەیوەندیی نییە بە رۆژنامەوە، بەڵکو جۆرێکی نوێیە لە نووسینی ئەدەبیو خۆی دایهێناوەو ناوی ناوە (رۆمانی جیا لە چیرۆك). بە بێ گوێدانە ناوەکە، ئەم رۆمانە وەك رۆمانە چیرۆك ئاساکان داڕێژراوەو دەتوانین وەك رۆمانە حەقیقییەکان بیخوێنینەوە، بەڵام رووداوەکانی ئەم رۆمانە بە راستی روویان داوە، نووسەر هەر ئەوەی کردووە رووداوەکانی سەرلەنوێ بنیات ناوەتەوە بە دەستی خۆی. ناوەرۆکی رۆمانەکەش باس لە تاوانێکی کوشتن دەکاو پاڵەوانەکانو ئەوانەی گومانیان لێدەکرێ. کتێبێکی لەم جۆرەش لەوە تێپەڕ ناکا کە لێکۆڵینەوەی حاڵەتێك بێو هۆیەك بێت بۆ لەسەر دوانو قسەکردنی کۆمەڵایەتی.

هنتر تۆمبسون، ئەم بیرۆکەیەی خۆی بەرەو مەودایەکی زیاتر بردو هات خەیاڵو حەقیقەتی تێکەڵ بەیەك کردو شێوازێکی تری هێنایە ئاراوە ناوی نا رۆژنامەگەریی (جونزو)، ئەمەش بریتییە لە جۆرە نووسینێك پڕیەتی لە شیکردنەوەو بیروبۆچوونی خودی نووسەر، ئەو بابەتە توانج ئامێزو گاڵتەجاڕییانەی لە هەڵمەتی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٧٢دا دەینووسی، زۆر زیرەکانەو خۆش بوون، بەڵام لە باری سیاسیی ئەوانەوە کە خۆیان پاڵاوتبوو بۆ ئەو هەڵبژاردنانە دارو بەردی ئەدان بەسەر یەکداو وێرانی دەکردن، ئەم بابەتانە کۆ کرانەوەو بوون بە کتێبێك بە ناوی (بەردێکی خلبووەوە).

هەندێ لە نووسەرانی جیهانی سێهەم، هیچیان بۆ نەماوەتەوە ئەوە نەبێ بەغیلی بەرن بەو برە سەربەستییەی رۆژنامەنووسی جیهانی یەکەم هەیانە لە دەربڕینی بیروڕاو بۆچوونەکانیاندا. هەندێ جاریش بارودۆخی کۆمەڵایەتیو سیاسیی وڵاتێك لەو جۆرانەیە کە رۆژنامەنووس سەرەڕۆیی بکاتو خۆی راستەوخۆ هەواڵەکە بنووسێ، ئەمەش لە رێگەی باسکردنی هەندێ حەقیقەت کە پەیوەندییان هەیە بە بابەتەکەوە لەگەڵ گێڕانەوەی قسەی بەرپرسان بە وردیو پاکییەوە، ئیتر واز لەوە بێنە کە هەواڵەکە بە شێوەیەك دابڕێژێ کە لێکدانەوەو شیکردنەوەی لەگەڵدا بێ. بەڵام تێکەڵکردنی حەقیقەتەکان لەگەڵ خەیاڵدا وەك (تۆمبسون) دەیکا ئەوە کارێکی زۆر ترسناکە بۆ نووسەر.

لەگەڵ ئەوەشدا رۆژنامەنووسانو ئەوانەی لە دەزگاکانی راگەیاندندا کار دەکەن، تایبەتمەندییەکیان هەیە لەو نەگەبتییانەدا کە تووشیان دەبێ ئەویش بریتییە لە پەنابردنە بەر فرتوفێڵو زۆرزانی، ئەوان دەتوانن خۆیان دەرباز بکەن لە سانسۆرچییەکانو خۆیان لا بدەن لەو کۆتو بەندانەی دەخرێنە سەریان، لەم بارەیەوە دەیانبینی چیرۆکو رۆمان دەنووسن لە شێوەی سەرگوزەشتەی خەیاڵیو ئەفسانەدا. دەشتوانن وێنەی کاریکاتێریو گۆرانیی میللیو شیعرو پۆستەری سەردیوار بەکار بهێنن. لەم بوارەدا شانۆی بووکەشووشە دەبێتە سەکۆیەك بۆ گوزارشکردن لە دەنگی زۆرلێکراوو چەوساوەکان. هەروەها شانۆی سەر شەقام وەك هۆیەك وایە کە لە رێگەیەوە دەتوانرێ رەخنەی سیاسیو کۆمەڵایەتی ئاراستە بکرێ.

بەهەرحاڵ رۆژنامەگەری وەنەبێ راستگۆتر بێ لە رۆمانە چیرۆك ئاساکان، چونکە هەردوو بوارەکە رەنگە وەك (هنتر) دەڵێ لەو کاتانەدا کە زۆر بە راستیو بە ئاشکرا قسە دەکات:



پۆلبەندکردنێکی دەسکردن)و هەردوو بوارەکە لە باشترین حاڵدا لە دوو ئامرازی جیاواز زیاتر نین کە یەك مەبەستیان هەیە.

## نوکتەبازیو قسەی خۆش

ئێمە زۆر کات بەو سیفەتەی کە لە بواری راگەیاندندا کار دەکەین ئەوە دێنینەوە یادی خۆمان کە ئەرکێکی گرانمان لەسەر شانە، کە ئەویش بریتییە لە ئاگادارکردنەوەی ئەو جەماوەرەی خزمەتیان دەکەینو تێیان دەگەیەنینو رۆشنبیریان دەکەین. ئیتر خەریکە ئەوەمان لەبیر بچێ کە هەندێ کات هەیە شێوازی نوکتەو قسەی خۆش کاریگەریی زیاتری هەیە لە گەیاندنی پەیامەکەدا.

لە راستیدا نوکتەو قسەی خۆشو توێکڵدار، لەوە گەورەترە کە شێوازێکی ئەدەبی یا گێڕانەوەیەك بێ نووسەری لێهاتوو بەکاری بێنێ کە لە بارودۆخێکدا دەژی لەسەر چەوساندنەوە راگیرابێ، چونکە نوکتەو قسەی خۆش دەبێ بە سەکۆیەك بۆ گوزارشکردنو دەربڕینی مەبەستو چەکێك بە دەستەوە بۆ زۆرلێکراوو چەوساوەکان. ئەوانەی کە لەژێر دەسەڵاتی ئیمپریالیزمدا ژیاون یا ئەزموونێکیان هەیە لە چەوساندنەوەدا، ناوەرۆکی دێڕەکان دەخوێننەوەو هەست بە ئاماژە توانج ئامێزەکانو چیرۆکە هێمادارەکان دەکەن وەك ئامرازێك بۆ بەردەوامی لە ژیانو مانەوەدا.

وەك (ئەمیرو دریجیز مونجال) دەڵێ: (پێکەنین چەکێکە چەوساوەکان بەکاری دەهێنن بۆ گاڵتەکردن بەوانەی دەیانچەوسێننەوەو بۆ ئەوەی ئۆقرەیان لێهەڵگرن). هەروەها مونجال دەڵێ، بەرەنگاربوونەوە لە رێگەی پێکەنینەوە مێژوویەکی دووروردرێژی هەیە لە ئەدەبی ئەمریکای لاتیندا، چ لە پیرۆو بەرازیل یا لە مەکسیكو ئەرژەنتیندا.

مونجال لەم بارەیەوە دەڵێ: (لاقرتێو توانج لە وڵاتە داگیرکراوەکاندا شێوازێکی ئەدەبییەو لە هەمان کاتدا رێگەیەکە بۆ پاراستنی یەکڕیزیی کۆمەڵگە). بەلای (مونجال)ەوە گەورەترین نووسەری ئەمریکای لاتین لە سەدەی بیستەمدا لەو بوارەدا (لویس بورجیز)ە، ئەو کەسەی هەموو قاڵبە فەلسەفییەکانی هەڵوەشاندووەتەوەو فەلسەفەی کردووە بە رۆمانی زانستیو، میتافیزیکی کردووە بە ئەدەبی فەنتازی. لە لیستی ئەو نووسەرانەی بواری نووسینی ئەدەبی

توانج ئامێزدا، ناویان دەرچووە، لە ئەمریکای لاتین، (کارسیا مارکیز) کە خەڵاتی نۆبڵی بواری ئەدەبی وەرگرتووە لەسەر کتێبێکی بەناوی (سەد ساڵ گۆشەگیری)، هەروەها نووسەری کوبایی (جلیرمو کابریدا ئینفانتا) لەسەر کتێبی (سێ پڵنگ لە دیلییەتیدا).

ئەدەبی وڵاتانی ئەمریکای لاتینی، دادەنرێ بە تەنیا وەك نموونەیەك بۆ ئەرکی بواری نوکتەو قسەی خۆش لە ئەنجامدانی رۆڵی خۆیدا، رەنگە جیاوازی هەبێ لە شێوەی دەربڕین لە کەلتوورێکەوە بۆ کەلتوورێکی تر، بەڵام پێکەنین دەمێنێتەوە وەك مەسەلەیەکی چالاكو کارا لە ژیاندا. هەندێ جار نوکتەو قسەی خۆش لە شێوەی لاقرتێکردن یا گاڵتەپێکردن یا لاساییکردنەوە بە گاڵتەپێکردنەوە (وەك پێکەنینی ئەو کەسەی خەنجەرەکەی شاردووەتەوە لەژێر عەباکەیدا) بۆ ئەو کەسانەی بوونەتە قوربانیی چەوساندنەوە. هەروەها نوکتەو قسەی خۆش لە توانایدایە گرژیی مرۆڤ کەم بکاتەوە یا ئارامییەك ببەخشێ بە باری دەروونیی ئافرەت یا پیاو پاش ماندووبوونی رۆژێکی تەواو کارکردن لە کێڵگە یا کارگە یا ماڵ یا نووسینگە، هەروەها یارمەتیدەرێکە بۆ مرۆڤ کە بیر لە کاروباری خۆی بکاتەوە لەو وڵاتانەدا کە لە باری سیاسیو ئابووریدا ئارامە.

ئێمە وەك چۆن دەتوانین نوکتە بەکار بێنین بۆ رابواردنو کات بردنەسەر، هەروەها دەتوانین بەکاری بێنین لە گەیاندنی پەیامە گرنگەکاندا، ئەمەش مانای پشتگوێخستنی ئەو ئەرکانە نییە کە دەنگوباسی فیلمە تۆمارکراوەکان دەیبینن. هەروەها جۆرە ئاساییەکانی نوکتەو قسەی خۆش بۆ کات بردنەسەرو رابواردن کە هۆکانی راگەیاندن ئەنجامی دەدەن، وەك ستوونی تایبەت بە نوکتەو وێنەی کاریکاتێر لە رۆژنامەکاندا لەگەڵ شانۆگەریی رادیۆو تەلەفزیۆن، ئەمانە دەبنە تەواوکەری ئەو بەرنامانەی پێشخستنو گەشەپێدانی وڵات کە دەوڵەت جێبەجێیان دەکا لە بواری تەندروستی یا بڵاوکردنەوەی گیانی لێبوردن لە نێوان ئەندامانی تیرەو خێڵەکان یا پەیڕەوانی ئایینە جیاجیاکان لەناو میللەتدا.

وڵاتانی ئەمریکای لاتین بە تایبەت وڵاتی مەکسیك سەرکەوتنێکی بەرچاویان بەدەست هێناوە لە پەرەپێدانی توانایاندا بۆ بەرهەمهێنانی چەند بابەتێکی تەلەفزیۆن لە بواری کات بردنەسەرو پێکەنینو خۆشیدا، لە رێگەی چەند زنجیرەیەکەوە کە پەیوەندییان هەیە بە بواری پێشکەوتنو گەشەکردنی نەتەوایەتییەوە بە ناوی (تلی نوفیلا). ئەم بابەتە بریتییە لە



شانۆگەرییەکی تەلەفزیۆنی کە لە ساڵانی پەنجاو شەستەکاندا بەرهەم هێنراو ئێستا بووە بە باو لە ئەمریکای لاتیندا.

لە لێکۆڵینەوەیەکدا لەسەر سەرکەوتنی ئەم شانۆگەرییە تەلەفزیۆنییانە (روجرز)و (ئەنتولا)، هەردووکیان ئاماژەیان داوە بەوەی کە ئەو بابەتانە دەبنە هۆی بزوتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی بەرەو چینە باڵادەستەکانی کۆمەڵگەو ئەو ئامانجو مەبەستە پەروەردەییانەو هیتر، سەرەڕای ئامانجی خۆشیو کات بردنەسەر لەنێو ئەو نیشانە تایبەتانەی ئەو زنجیرە تەلەفزیۆنییانەدا، ئەگەر بەراورد بکرێن لەگەڵ زنجیرە تەلەفزیۆنییەکانی ئەمریکادا ئەم زنجیرانە سەرنجی خەڵکێکی زۆریان راکێشاوە بەلای خۆیاندا، بە پێچەوانەی زنجیرە شانۆگەرییەکانی ئەمریکا کە جەماوەری بینەریان بە شێوەیەکی سەرەکی پێکهاتووە لەو ژنانەی کە بە رۆژ سەیری تەلەفزیۆن دەکەن.

کۆمپانیای (تلیفیرنا)ی مەکسیکی لە ساڵانی حەفتاکاندا گەلێك لەو زنجیرە تەلەفزیۆنییانەی بەرهەم هێنا کە باس لە بابەتگەلێ دەکەن گۆڕینو پێشخستنی کۆمەڵایەتییان کردووە بە ئامانجی خۆیان، هاوشان لەگەڵ ئەو پڕۆژەو هەڵمەتانەی دەوڵەت ئەنجامیان دەدا لەو بارەیەوە.

لەنێو ئەو زنجیرە تەلەفزیۆنییانەدا، زنجیرەی (وەرە لەگەڵم) کە ناوەرۆکەکەی باس لە هاندانی جەماوەر بۆ لەناوبردنی نەخوێندەواری، یاخود زنجیرەی (وەرە لەگەڵمدا) کە ناوەرۆکەکەی باس لە رێکخستنی کاروباری خێزان دەکا، هەروەها زنجیرەی (با بەیەکەوە بڕۆین) کە بەرەنگاری خراپ بەکارهێنانی منداڵان دەبێتەوە، بەگوێرەی ئەو لێکۆڵینەوەیە کە کۆمپانیاکە لە ساڵی **١٩٧٧**دا ئەنجامی داوە، واتە ئەو ساڵەی کە زنجیرەکە تێیدا بەرهەم هاتووەو بڵاوکراوەتەوە، ژمارەی ئەو کەسانەی کە پەیڕەوی رێنماییەکانیان کردووە لەو وڵاتەدا گەیشتووەتە ٥٦٠ هەزار کەس، هەروەها لێکۆڵینەوەکە باس لەوە دەکا کە بڵاوکردنەوەی زنجیرەی تەلەفزیۆنی (وەرە لەگەڵم) لە ماوەی ساڵێکدا بووەتە هۆی ئەوەی ژمارەی ئەو کەسانەی ناویان تۆمار کردووە لە پۆلەکانی نەهێشتنی نەخوێندەواریدا گەیشتووەتە یەك ملیۆن کەس.

سەرکەوتنی ئەم شانۆگەرییە تەلەفزیۆنییە پەروەردەییانە لە مەکسیك بەهۆی ئەو زنجیرە شانۆگەرییەوە بوو کە لە (پیرۆ) بەرهەمهێنراو لەناو بینەراندا زۆر دەنگی دایەوە لە ساڵانی

شەستەکاندا بە ناوی (ماریای باش)، کە لە چیرۆکی بەناوبانگی (سەندرێلا)وە وەرگیراوە، ناوەرۆکی چیرۆکەکە سەرگوزەشتەی کچێکە لە زنجەکاندا ژیاوەو دواتر دەبێتە کارەکەری ماڵێکی دەوڵەمەندو لە ئەنجامدا بەرگدرووی ژنان، ئەم چیرۆکە سوودێکی زۆری گەیاند بەو کۆمپانیایەی بەرهەمی هێناو هەروەها بووە هۆی فرۆشتنێکی زۆری مەکینەی جلوبەرگ دروون لە ئەمریکای لاتیندا، سەرەڕای ئەوەی بابەتێکی پەروەردەیی بەکەڵکی پیشکەش کرد بە بینەرانو بەشداریی کرد لە گەشەپێدانی ولاَتدا.

ئەنجامی سەرکەوتووانەی ئەو بەرنامە تەلەفزیۆنییە مەکسیکییانە بووە هۆی ئەوەی ولاَتانی جیهانی سێهەم چاوی لێبکەنو دەست بکەن بە بەرهەمهێنانی چەند شانۆگەرییەکی تەلەفزیۆنی. بۆ نموونە هیندستان دەستی کرد بە بەرهەمهێنانی شانۆگەریی تەلەفزیۆنیی (گەل) کە باس لە ڕێکخستنی خێزان دەکا. ئەم زنجیرەیە بۆ یەکەم جار لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٨٤دا نمایش کراو لە ئەنجامی ڕاپرسیدا لە سەد پلە نەوەد پلەی بەدەست هێنا، ئەم سەرکەوتنەش بووە هاندەر بۆ بەرهەمهێنانی چەند شانۆگەرییەکی تر. چەند دەوڵەتێکی تریش هەن پلانیان داناوە بۆ بەرهەمهێنانی ئەم جۆرە بابەتانە بە مەبەستی سوود لێوەرگرتنیان لە هێنانە دیی ئامانجی گەشەپێدانی ولاَت لە بواری ڕێکخستنی خێزانو یەکسانیی نێوان ژنو پیاودا.

ڕەنگە ئەوەی بووەتە هۆی سەرنجڕاکێشانی بینەران بۆ ئەم جۆرە شانۆگەرییە پەروەردەییانە بەگوێرەی بۆچوونی (ڕوجرز)و (ئەنتولا)، ئەو چیرۆکانە بن کە ڕووداوەکانیان بە خێرایی تێدەپەڕنو پڕن لە سۆز. بەلای جەماوەرەوە ئەو شانۆگەرییانە بە شێوەیەکی سەرەکی بابەتگەلێکن بۆ کات بەسەربردنی خۆش، ئەم بەرنامانە هەوڵی ئەوە نادەن بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ خەڵك فێری ئەوە بکەن کە چۆن کاروباری ناو خێزان ڕێکدەخەن یا چۆن بەشداری بکەن لە پرۆژەی لەناوبردنی نەخوێندەواریدا، چونکە ئەم بەرنامانە لێزانانەو بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ باسی ئامانجەکانیان دەکەن لە پرۆگرامو ڕێڕەوەکەیاندا، بۆ نموونە لە زنجیرەی وەرە لەگەڵمدا، دەرخستنی ڕۆڵە باش یا خراپەکان پشت دەبەستێ بەو هەڵسوکەوتانەوە کە حکومەت هانیان دەدا بۆ ڕێکخستنی کاروباری خێزان. لە زنجیرەی وەرە لەگەڵمدا هەوڵی ئەوە دراوە کە چەند کەسێك دەربکەون لەوانەی باری ئابوورییان مامناوەندییەو دەستکەوتیان سنووردارە لە پۆلەکانی نەهێشتنی نەخوێندەواریی تەمەن گەورەکان بەیەکەوە دانیشتوون.



لە ئەزموونی ولاَتی مەکسیکەوە دەتوانین ئەوە تێبگەین کە کارکردن لە بواری پەروەردەو فێرکردندا، نابێ بە شێوەیەکی وشكو بە قورسیو گرژی بکرێ. ویلیام سی. میلەر، ئامۆژگاریی نووسەرانی سیناریۆ دەکا لەوانەی حەز بە پێشکەوتن دەکەن لە بواری کارەکەیانداو دەڵێ: هەر بابەتێك بگری، خاڵێکی تێدایە دەکرێ بە سەرەتای پەردی سیناریۆ، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە لەسەر نووسەر کەمێك لە سەرگەرمیی خۆی کەم بکاتەوەو خۆی دوور بخاتەوە لەوەی ببێ بە ئامۆژگاریکەری خەڵك.

## لێزانیو لێهاتوویی کلیلی چوونە ناو بابەتەکەیە

کاتێك دەتەوێ نمایشنامەیەك یا شانۆگەرییەکی پەروەردەیی بەرهەم بێنی بۆ ڕادیۆ یا تەلەفزیۆن، دەبێ پەیامەکە ئاساییو ڕێکوپێك بێو بگونجێ لەگەڵ ناوەرۆکەکەدا، هەروەها دەبێ هەر گۆڕانێك دێت بەسەر کەسیەتیی ناو شانۆگەرییەکەدا، پشت ببەستێ بە شێوە گێڕانەوەیەك خەڵك باوەڕی پێبکەنو بگونجێ لەگەڵ ڕەوشتو سروشتی کەسیەتییەکاندا. ئەمەش، بە نموونە، وەك ئەوەی جوتیارێکی ئاسایی — پاش ڕەتکردنەوەو دوودڵی — بڕیاری دا لەسەر بەشداریکردن لە بەرنامەیەکی کشتوکاڵیدا کە حکومەت داوای کردووە، یا وەك ئەوەی دایکێك چاوپۆشی دەکا لە کچەکەی کە شووی کردووە بە کابرایەك لە چینە کۆمەڵایەتییەکەی خۆی نییە.

## قەوارەو چوارچێوەی چیرۆك

مرۆڤ ڕاهاتووە لەسەر گێڕانەوەی چیرۆكو سەرگوزەشتە هەر لە سەردەمانی پێش مێژووەوە. پیاوانی خێڵ باسی منداڵێکیان گێڕاوەتەوە کە ئازایانەو بێ ترس بەناو دارستانێکدا گوزەری کردووەو خۆی ئامادە کردووە بۆ یەکەم ڕاو لە ژیانیدا، پیاوی پیریش کە لەژێر دار هەنجیرێکی هیندیدا دانیشتووە باسی گەنجێك دەگێڕێتەوە کەوتووەتە ڕێ بۆ شاخێکی دوور بۆ ئەوەی مەشق بکا لەسەر دەستی پاڵەوانێکی زۆرانبازی ئەفسانەیی بەناوبانگدا. مامۆستا (ئەلویانج)یش ئەفسانەی (ڕامایانا)مان بۆ دەگێڕێتەوە کە تیایدا پاڵەوانی ئەفسانەکە سەرکەوتووە بەسەر هێزی خراپەدا لە شەیتانەکان بە یارمەتیو کۆمەکی خوا. بە بێ ئەوەی گوێ بدەین بە جۆرو

شێوە لە ئێستاداو لە رابوردوودا، بەردەوام ئامانجێك هەبووە لە پشت ئەم چیرۆكانەوەو پەیامێك هەبووە لە شوێنێكدا. ئەفسانە، قسەی پڕوپووچو بێ بناغە، سەرگوزەشتە میللییەكان، چیرۆكی خەیاڵی، پەندی پێشینان. ئیتر هەر ناوێكیان هەبێ، ئەمانە هەڵگرێكی باشی جۆرەها رەوشتو نموونەی هەڵسوكەوتی شارستانین.

زۆرجار ئێمە وەك رۆژنامەنووس، نووسەران، بەرهەمهێنەرانی بەرنامەكانی رادیۆو تەلەفزیۆن، بە پلەی یەكەم چیرۆك دەگێڕینەوە. ئەمەش چونكە سەرنووسەران، بڵاوكەرەوەكان، بەرهەمهێنەران، یا بەڕێوەبەرانی بەرهەم دەبێ لە سەرەتادا نووسینو چیرۆكەكان بكڕن، لەو كاتەدا ئێمە ناچارین سەرنجی خەڵك راكێشینو هەوڵی ئەوە بدەین ئەوەمان لەكیس نەچێ، ئەگەر نا گەوهەری پیشەكەمان لەدەست دەدەین.

بەو سیفەتەی ئێمە كارمەندانی بواری راگەیاندنین لە پێناوی بەرەوپێشبردنی میللەت، یا پێشخستنی وڵاتێكی تازە سەربەخۆیی بەدەستهێناو، هەمیشە كار دەكەین بۆ ئەوەی قەوارەیەكی رۆشنبیریی توندوتۆڵ دروست بكەین بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەگەری هێرشی كەلتووری لەلایەن دەوڵەتە پێشكەوتووەكانەوە. یەكێك لەو رێگەیانەش یارمەتیمان دەدا لەو ئەركەدا ئەوەیە پەند وەربگرین لەو جۆرە شیعرو چیرۆكە جیایانەی لە كەلتووری خۆماندا هەیە. ئێمە پێویستمان بەوەیە جەماوەری خۆمان بناسین، هەروەها پیویستمان بە دۆزینەوەی چاكترین رێگەیە كە بمانگەیەنێ بەو سەرچاوانەو چۆنیەتیی گواستنەوەی پەیامەكەمانە لە رێگەی ئەوانەوە.

رەنگە گرنگ بێ كە ئێمە بێین لە بارودۆخی كۆمەڵایەتیی خۆمان بكۆڵینەوە بۆ ئەوەی لە پێكهاتەی بیروبۆچوونی میللەت تێبگەین. لەگەڵ ئەوەشدا هەروا گرنگە رابوردووی خۆمان بێنینەوە پێش چاوی خۆمانو پەند وەربگرین لە مێژوو و دابونەریتی خۆمان. پەندی پێشینانو ئەو سەرگوزەشتانەی پەیوەندییان هەیە بە ئەخلاقو رەوشتەوە، كەرەستەیەكی بەكەڵك بن بۆ رێكخستنی چەند بیروبۆچوونی تایبەت لە قاڵبێكدا كە جەماوەر بتوانێ لێی تێبگا. لە بواری بیروباوەڕو بەها ئەخلاقییەكانەوە، ئەوە وەڵامەكانیان لە دووتوێی ئەفسانەو سەرگوزەشتە فۆلكلۆرییەكاندایە. ئەم سەرچاوانە دەتوانن چەندەها بیروبۆچوون بخەنە بەردەست بۆ ناوەرۆكی چیرۆكەكان. هەروەها دەتوانرێ ئەمانە بەكار بهێنرێن وەك شتێكی هاوشێوە بۆ رووداوەكانی



هەواڵ یا باسكردنی ئەوانەی لە پشت هەواڵو رووداوەكانەوەن لە هەمان كاتیشدا بە سەرچاوەیەكی بەهادار دادەنرێن بۆ بابەتەكان لە باری شێوەو خستنەڕووەوە.

لە رۆژاوا، زانایانی بواری دەروونناسیی منداڵو پەرەدان بە تواناكانیان، ئەوەیان بۆ روون بووەتەوە كە منداڵ لە قۆناغی خوێندندا (قۆناغی سەرەتایی لە هەندێ سیستمی پەروەردەییدا) بەرەبەرە هەستێكیان لا دروست دەبێ بۆ چیرۆك دانانو رەوتێكی تایبەت دێننە پێش چاوی خۆیان بۆ رووداوەكانی ئەو چیرۆكەی گوێی لێدەگرنو بەرەو ئەوە دەچن كە لە چیرۆكەكە تێبگەنو بە شێوەیەكی باشتر بیگێڕنەوە، ئەگەر بە جوانی بۆیان بگێڕدرێتەوە. رەنگە لێكۆڵینەوەی پێكهاتەو ناوەرۆكی چیرۆكەكان لە بابەتە فۆلكلۆریو ئەفسانەو هونەری میللیو جۆرو شێوەكانی تری چیرۆك، بابەتێكی گونجاو بن بۆ ئەوانەی لە بواری راگەیاندنی دەوڵەتانی جیهانی سێهەم دەكۆڵنەوە.

بۆ نموونە (دان بن عاموس) لە لێكۆڵینەوەیەكی فراواندا لەسەر بابەتە فۆلكلۆرییە میللییەكانی ئەفریقیا، ئەو ئەركانەی دەستنیشان كردووە كە جۆرە جیاجیاكانی چیرۆكەكان جێبەجێ دەكەن لەگەڵ پەندی پێشینانو مەتەڵەكاندا. چەند لێكۆڵینەوەیەكی تری هەندێ توێژەر باسیان لە جۆری ئەو قەوارەیە كردووە كە چیرۆكە ئەفریقیاییەكان لەخۆیان گرتووە. رەنگە ئێمەش بتوانین چەند جۆرێكی تری نموونەیی پەرە پێبدەین بۆ ئەوەی بگونجێ لەگەڵ ئەو جەماوەرەدا كە خاوەنی چەندەها كەلتووری جیاوازن.

### ئەخلاقو رەوشتی پیشەی رۆژنامەگەری

نوكتەو قسەی خۆش تەنیا بۆ كات بەسەربردنی خۆش نییە، چونكە هەموو كاتێك مەبەستێك هەیە لە پشت هەر چیرۆكە هەواڵێكەوە، ئەمەش راوەستاوە لەسەر ئەوەی ئایا ئەو هەواڵە چیرۆك شێوەیە بەكار دەهێنرێ لەپێناوی مەسەلەیەكی داپۆشراوو شاراوەدا، یا لەبەر چەند هۆیەك كە خودپەرستیی تێدایە. ئەوەش ئاشكرایە كە وشەو نووسراو زیاتر بە پیرۆزی سەیر دەكرێن لەو كۆمەڵگەیانەدا كە نەخوێندەواری باڵی كێشاوە بەسەریاندا. واش چاوەڕوان دەكرێ لە وڵاتێكدا كە تەكنەلۆژیا دەپەرستنو بە پیرۆزی دادەنێن، ئەو دەنگانەی دەبیستن لە رادیۆوە، یا ئەو وێنانەی لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەكانەوە دەردەكەون حەقیقەتێكی تەواو بن.

پێویستە لەسەر رۆژنامەنووس‌و کەسانی بواری راگەیاندن خۆیان بپارێزن لەوەی لە ئەفسانەو خەیاڵی بە توانایی خۆیاندا نوقم بن، چونکە ئەخلاق‌و رەوشت بریتییە لە کەسیەتی‌و رۆشنبیری‌و پێوەرێکی جێگیر نییە بۆ دیاریکردنی. هەروەها ئامرازێکی دیاریکراو نییە بۆ پێشکەشکردن یا دەرخستنی پەیامێکی تایبەت. عەقڵێکی کراوەو بەردەوامبوون لە گەڕان بە دوای هەستکردن بە پێداویستییەکانی کۆمەڵگەو بە خێرایی وەرگرتنی ئەو بیروبۆچوونانەی تایبەتن بە چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵگەو خزمەتکردنی مرۆڤایەتی‌و پارێزگاریکردن لە سەروەریی کەسیەتیی رۆژنامەنووس، چەند خاڵێکی رێ پیشاندەری گونجاون لەم بارەیەوە.

دەبێ هەر ئەوەشت لەیاد بێ کە لە جیهانێکی هەمیشە گۆڕاوو نائارامدا، خەڵك چاویان بڕیوەتە هۆکانی راگەیاندن بۆ بەدەستهێنانی زانیاری‌و ئامۆژگاری‌و ئاراستەکردن‌و یارمەتیی مەعنەوی‌و گیانی، چەند وشەیەکی هاندان بۆ چاکەو ئەو هەواڵانەی بیروباوەڕی لەیەك بوردن‌و لەیەك گەیشتن‌و خۆشەویستی‌و ئاشتی، ئەوانەی کە هیوا دەبەخشنە مرۆڤ بەشێکن لەو شتانەی پاڵنەرن لەم بوارەدا.



## سەرچاوەکان

1. Edwin H. Ford, A Gibliography of Literary Journalism, (Minneapolis, Minn.: Burgess Publishing Company, 1973).
2. When the term "The New Journalism" cught on in the mid-1960s, it referred to writings by magazine journalists such as Jimmy Breslin, Gay Talese, Terry Southern, Tom Wolfe, Joan Didion, Gail Sheehy and Tom Gallagher, among others; and novelists such as Norman Mailer, James Baldwin and Truman Capote. Because of its subjective style, and some of the writers' unconventional usage of the English language and punctuations, "The New Journalism" is also called "personal journalism", or "parajournalism" by its critics.
3. Norman Sims, The Literary Journalists (New York: Ballentine Books, 1984), pp. 3-25.
4. See Chapter 3 of this Handbook for a survey and comparison of the press systems and news concepts of the First, Second, and Third Worlds.
5. Sometimes fictitious names of people and geographical locations are employed to protect the anonymity of the people involved.
6. See Chapter 5 of this Handbook for a definition of Revolutionary journalism.
7. Features and excerpts can be found in Tom Wolfe, & E. W. Johnson, eds. The New Journalism (New York: Harper & Row, 1973).
8. Tom Wolfe, "Part One: The New Journalism", in Tom Wolfe, & E. W. Johnson, eds., The New Journalism, pp. 3-37.
9. Wolfe, & Johnson, The New Journalism. Features and excerpts contained in the anthology are some of the finest examples of the New Journalism and literary

journalism, to life of servicemen in Vietnam; from sports to politics; and from high society to recial conflicts.

10. Roy Paul Nelson, Articles and Features (Boston, Mass.: Houghton Mifflin Company, 1978).

11. In James E. Murphy, The New Journalism: A Critical Perspective, Journalism Monographs, vol. 34 (Lexington, Ky.: The Association for Education in Journalism, 1974), p. 23. Murphy’s work contains a comprehensive history and analysis of the style and criticism of New Journalism.

12. Wolfe, p. 37.

13. The series of articles was later published as Fear and loathing: On The Campaign Trail 72 (New York: Fawcett Popular Library, 1973).

14. John Hellmann, Fable of Facts: The New Journalism as New Fiction (Urbana, Ill.: University of Illinois Press, 1981), provides an analysis of the different perspectives on journalism and fiction.

15. Hunter S. Thompson, The Great Shark Hunt (New York: Summit Books, 1979), p. 106. Some of Thompson’s examplary works are published in the collection, apart from the ones contained in Wolfe & johnson’s anthology.

16. Emir Rodriguiz Montegal, “Tradition of Laughter”, Review: Latin American Literature and Arts, vol. 35, July-December, 1985, p. 3-6.

17. Ibid.

18. Ibid., Monegal quoted one of Borges’ favorite passages found in Chaucer.

19. Everett M. Rogers & Livia Antola, “Telenovelas: A Latin American Success Story”, Journal of Communication, vol. 35:4, Autumn, 1985, pp. 24-35.

20. Ibid., p. 30.



21. Ibid., pp. 31-32.

22. Ibid.

23. Ibid., pp. 33-34.

24. Ibid.

25. William C. Miller, Screenwriting: for Narrative Film and Television, (New York: Hastings House, 1980), p. 146.

26. Rogers & Antola, p. 30.

27. Miller, p. 146.

28. The Wayang Kulit, the shadow play, is a popular art form in Malaysia and Indonesia. Sacred tales from the Hindu epic, the Ramayana, are transmitted through the Wayang masters (called Tok Dalang) who hold high esteem among the people.

29. Aimée Dorr, “When I Was A Child I Thought As A Child”, in S. W. Withey & R. P. Abeles, eds., Television and Social Behavior: Beyond Violence and Children, (Hillsdale, N. J.: Lawrence Erlbaum Associates, 1980), pp. 191-230.

30. Dan Ben-Amos, “Introduction: Folklore in African Society”, in Bernth Linfors, eds., Forms of Folklore in Africa: Narrative, Poetic, Gnomic, Dramatic (Austin, Tex.: University of Texas Press, 1977), pp. 1-34.

# بەشی دوازدەهەم

# چاوگێڕانێکی سەرتاپا بە ئەرکی نووسیندا

**نووسینی: وارین ك. ئاجی**

نووسینی بابەت ئەرکێکە زۆر کەس لەوانەی کار دەکەن لە رۆژنامەدا هاوبەشن تیایدا، نووسینی بابەتێك لەو کاتەوە دەست پێدەکا کە یەکێك لە نووسەرانی رۆژنامە هەواڵەکە دەنووسێتو چاوی پیا دەگێڕێتەوە پێش ئەوەی بیدا بە رۆژنامەکە بۆ بڵاوکردنەوەو بەوەش کۆتایی دێت بۆ دوایین جار هەڵەکان راست دەکرێنەوە پێش ئەوەی بخرێتە ژێر چاپەوە، بەڵکو ئەگەر کات هەبوو هەر بەردەوام دەبێ. لە هەموو ئەم ماوەیەدا یارمەتیدەرانی سەرنووسەر هونەری رۆژنامەوانیی خۆیانی تێدا بەکار دێنن. رادەی لێهاتوویش لە ئەنجامدانی کارەکاندا جیاوازیی نێوان رۆژنامەیەكو رۆژنامەیەکی تر دیاری دەکات کە یەکێکیان خوێنەرێکی زۆر رادەکێشێ بۆ خوێندنەوەیو ئەویتریان کەسانێکی کەم دەیخوێننەوە.

سەرنووسەرانی رۆژنامەکان لە هەموو شوێنێکدا رێبازی رۆژنامەکە دیاری دەکەنو سەرپەرشتیی هەموو کارەکان دەکەن. یاریدەدەرێکی سەرنووسەر، (یا زیاتر) بەگوێرەی قەوارەی رۆژنامەکە، بڕیار دەدا ئەم بابەتە بڵاو دەکرێتەوەو ئەو بابەتە بڵاو ناکرێتەوە. یارمەتیدەری سەرنووسەر بۆ پێداچوونەوە بۆ جاری دوایین چاوی پێدا دەگێڕێتەوەو ورد دەبێتەوە لە بابەتەکان. ئەم بەشەی کتێبەکەمان تەرخان کردووە بۆ باسکردنی ئەو ئەرکانەی لەسەریەتی ئەنجامیان بدا.



## ئەرکەکانی یارمەتیدەری سەرنووسەر بۆ پێداچوونەوە

یارمەتیدەری سەرنووسەر بۆ پێداچوونەوە بە شێوەیەکی سەرەکی دەبێ ئەم ئەرکانەی خوارەوە جێبەجێ بکا:

❊ گەڕان بە دوای هەڵەکانداو راستکردنەوەیان.

❊ گەڕان بە دوای هەر ناکۆکییەك کە هەبێ لەنێو هەواڵەکەداو سەرلەنوێ نووسینەوەی هەواڵەکەو راستکردنەوەی.

❊ راستکردنەوەی هەڵەی ژمارەو هێما دانان، (بەکارهێنانی خاڵو دانانی مەودا لە نێوان وشەکاندا) لەگەڵ راستکردنەوەی هەڵەی زمانەوانیو رێنووسو هەڵەی ژمارەو ناوو ناونیشان.

❊ دەسکاریکردنی هەواڵەکە بە جۆرێك بگونجێ لەگەڵ رێبازی رۆژنامەکەدا.

❊ کورتکردنەوەی هەواڵەکە بە شێوەیەك هەر وشەیەك جێگەی سێ یا چوار وشە بگرێتەوەو یەك رستە گوزارش بکا لەوەی کە بڕگەیەك دەیگەیەنێو هەوڵ بدرێ قەوارەی هەواڵەکە وا لێبکرێ کە بگونجێ لەگە ئەو رووبەرەی لە بەردەستدایە لە رۆژنامەکەدا.

❊ خۆپاراستن لە تۆمەتدانە پاڵ خەڵكو ناوزڕاندنو هەموو ئەوانەی کە عەقڵی تەواو پەسەندی ناکەن.

❊ جوانکردنی هەواڵەکە بە دانانی چەند مانشێتی لاوەکی بەگوێرەی پێویست.

❊ نووسینی مانشێت بۆ هەواڵەکە.

❊ لە هەندێ رۆژنامەدا، یارمەتیدەری سەرنووسەر بۆ پێداچوونەوە، بابەتێك دەنووسێ بە ناوی (وشەی وێنەکان)، لەگەڵ هەندێ کاری هونەریی تردا کە تایبەتن بە نووسینی هەواڵەوە.

❊ پاش ئەوەی رۆژنامەکە خرایە ژێر چاپەوە، زۆر بە وردی چاوێك دەگێڕێ بە چاپی یەکەمی رۆژنامەکەدا، ئەمەش وەك خۆپاراستنێکی زیاتر لە هەڵەو راستکردنەوەیان ئەگەر کات هەبوو.

## پابەندبوونی یارمەتیدەری سەرنووسەر بە چەند ئەرکێکی ترەوە

یارمەتیدەری سەرنووسەر بۆ پێداچوونەوە چەند ئەرکێکی سەرەکیی تری لەسەر شانە، بەرامبەر بە خوێنەرو بەرامبەر بە رۆژنامەکەو بەرامبەر بەو رۆژنامەنووسەی هەواڵەکەی نووسیوەو ئەم دەچێتەوە پیایدا.

## ئەرکەکانی بەرامبەر بە خوێنەر

پێویستە لەسەر یارمەتیدەری سەرنووسەر بۆ پێداچوونەوە، ئاگاداری ئەو تایبەتمەندییە گشتییە بێ کە پەیوەندیی بە تەمەنو رادەی خوێنەواریو رادەی ژیانو جۆری تایبەتیی ژیانی خوێنەرانی سەرەکیی رۆژنامەکەوەو بەگوێرەی ئەو تایبەتمەندییانە هەواڵەکە بنووسێو دایبڕێژێ. خوێنەرانی رۆژنامە لە زۆر وڵاتانی جیهانی سێهەمدا، ئەو هاووڵاتییانەن کە لە شارەکاندا دەژین لەگەڵ ئەو خوێنەوارانەی کە لە چینە مامناوەندیو باڵاکانی کۆمەڵن. ئەم خوێنەرانە دەتوانن بە ئاسانی لەو هەواڵانە تێبگەن کە تا رادەیەك ئاڵۆزن. لەگەڵ ئەوەشدا باشترین جۆری نووسینی رۆژنامەگەری ئەوەیە کە نووسینێکی سادەو ئاسان بێ. یارمەتیدەری سەرنووسەر دەبێ هەوڵ بدا پابەند بێ بەوەوەو ئەو بنەمایە جێبەجێ بکا کە لە رۆژنامەگەریی نوێدا کاری پێدەکرێو بریتییە لە پابەندبوون بە نووسینی روونو ئاشکراو خۆشەوە بۆ ئەوانەی دەیانەوێ خزمەتی ئەو خوێنەرانە بکەن کە بەشێکی باش خوێنەوارییان بەدەست هێناوە بەڵام یارمەتیش دەدا بۆ فراوانکردنی بازنەی خوێنەران تا ئەوانەش بگرێتەوە کە بەهۆی ئەوەوە خوێنەوارییان تەواو نییە وازیان لە رۆژنامە خوێندنەوە هێناوەو توانای ئەوەیان نییە لەو چیرۆکە هەواڵانە تێبگەن کە بڵاو دەکرێنەوە لە رۆژنامەکەدا.

هەر بەو رادەیەش گرنگە، یاریدەدەری سەرنووسەر بۆ پێداچوونەوە پابەند بێ بە خوێنەری رۆژنامەوە، لەو بارەیەوە کە پەیوەندیی هەیە بە دەسکاریو چاککردنی ئەو بابەتانەی خراپ نووسراون یاخود شتێکی وایان تیا نییە سەرنجی خوێنەر رابکێشن. هەڵەیەکی باویش هەیە بریتییە لە نووسینی هەواڵێك لەگەڵ پێشەکییەکی واقیعیی ئاساییدا، لە کاتێکدا باشتر وایە پێشەکییەك بنووسرێ سەرگوزەشتەو چیرۆکی تێدا بەکارهێنرابێو بابەتێکی لەخۆ گرتبێ کە



جێگەی گرنگیپێدانی مرۆڤ بێ وەك ململانێو رەفتاری نامۆو... هیتر. ئەم جۆرە بابەتانە زۆرجار شاراونەتەوە لە دووتوێی چیرۆکە هەواڵەکاندا، هەروەها دەبێ ئەوە بکرێ بە بنەمایەکی کارپێکراو لە هەموو هۆڵێکی نووسەراندا، سەرنووسەران تەنیا خەریکی ئەوە نەبن کە هەڵەی زمانەوانی راست بکەنەوەو مانشێتەکان بنووسن، بەڵکو ئەرکی سەرەکییان ئەوەیە دەسکاریی نووسینەکان بکەنو باشتریان بکەن، بەم شێوەیە خوێنەران سوودمەند دەبن لەم دەسکاریو هەموارکردنە.

خۆگونجاندن لەگەڵ بارودۆخی ژیاندا کێشەیەکی مرۆڤایەتییە لە جیهاندا. لەبەر ئەوە یارمەتیدەری سەرنووسەر پێویستە لەسەری بەگوێرەی توانا زۆر لە چیرۆکە هەواڵەکان دابڕێژێتەوە بۆ ئەوەی گرنگی بدا بەو شتانەی سوودیان هەیە بۆ خوێنەران، نەك هەر تەنیا سوودی ئەوەی لێوەربگرن کە ئاگادار بن لە رووداوەکان یا کات بەرنەسەر. بۆ نموونە دەبێ لەوە تێبگەن کە چۆن دەتوانن ئەو باجو سەرانەیەی خراوەتە سەریان کەمی بکەنەوە؟، چۆن خێزانەکەیان دەپارێزن لە نەخۆشی؟، یاریدەدەری سەرنووسەر زۆرجار ئەو جۆرە هەواڵانە هەڵدەبژێرێ کە گرنگی دەدا بەو زانیارییانەی زۆرترین خوێنەر رادەکێشێ بۆ خوێندنەوەیو یارمەتییان دەدا بۆ چارکردنی ئەو کێشەو گرفتانە، هەوڵی یارمەتیدانی خوێنەران لەسەر ئەوەی تێکەڵ بن لەگەڵ هەواڵەکە، یەکەم بنەمایە بۆ دەستەی نووسەرانی باش.

گەلێك لە یاریدەدەرانی سەرنووسەران بۆیان دەرکەوتووە کە لەو کاتانەدا کارو ئەرکەکانیان بە باشترین شێوە ئەنجام دەدەن، ئەوە بخەنە پێش چاویان کە بۆ یەك کەس دەنووسن نەك بۆ جەماوەرێکی فراوانی نەناسراو لە خوێنەران.

## ئەرکەکانی یارمەتیدەری سەرنووسەر بەرامبەر رۆژنامەکە

یارمەتیدەری سەرنووسەر بۆ پێداچوونەوە، ناو نراوە بە دڵی رۆژنامە، چونکە ئەو کەسەیە لەو دەرگایەدا راوەستاوە کە رۆژنامەنووسو خوێنەری هەواڵ دەگەیەنێ بەیەك، بەو سیفەتەی کە دادوەری دواییینە لەسەر شێوازو مانابەخشینو جوانیی نووسینەکە. راستگۆیی رۆژنامەش بە زۆری لەسەر ئەو سێ پێوەرە راوەستاوە.

مەبەست لە کورتکردنەوەو بەکارهێنانی نازناوو دانانی ژمارەو پەیڕەویکردنی یاسای زمانو هەڵبژاردنی (فۆنتی) گونجاو بۆ مانشێتەکانو شتی لەو جۆرانە ڕێکخستنو جوانکردنی نووسینەکەیە، خوێنەران متمانەیان نامێنێ بەو رۆژنامەیە کە پێویستی بەو ڕێکخستنەو هەندێ پێوەری تر هەبێ لەم جۆرە کارانەدا.

## ئەرکی یاریدەدەری سەرنووسەر بەرامبەر نووسەری هەواڵ

پابەندبوونی یاریدەدەری سەرنووسەر بۆ پێداچوونەوە بەرامبەر بە نووسەری هەواڵ ئەوەیە بە هەر شێوەیەك بۆی دەکرێ جوانکاری بکا لە نووسینەکەدا، بەڵام بە بێ ئەوەی دەسدرێژی بکاتە سەر شێوەی دەربڕینی تایبەت بە نووسەرەکە. رۆژنامە بەرهەمی کاری کەسانێکی زۆرن، گرنگترین ئەو هۆیانەش کە خەڵك رادەکێشن بۆ خوێندنەوەی ئەوەیە کە هەمەڕەنگ بێت. لەسەر یاریدەدەری سەرنووسەر پێویستە کە خۆی رابگرێ بەرامبەر ئەو ئارەزووەی هەیەتی بۆ گۆڕینو دەسکاریکردنو زۆر پێویست نەبێ نابێ دەسکاریی چیرۆکە هەواڵەکە بکا.

## ڕەوشتی رۆژنامەنووس

ئەو رەوشتانەی رۆژنامەنووس جیا دەکەنەوە هەر یەك شتن، ئیتر لە وڵاتێکی پێشکەوتوودا بێ یا وڵاتێکی تازەپێگەیشتوو. (هارۆلد ئیفانز) سەرنووسەری پێشووی رۆژنامەی تایمزی لەندەنی، لە کتێبێکیدا بە ناوی (زمانی ئینگلیزیی تایبەت بە رۆژنامەنووس)، لەم رەوشتانەی کۆڵیوەتەوە. ئەم رەوشتانە، وەك خراونەتە بەردەم سیمینارێکی تایبەت بە مامۆستایانی رۆژنامەگەری بریتین لە:

* رەوشتە مرۆڤایەتییەکان، وەك سۆزداری، وردبینی، زۆرزانی، خەیاڵی بەپیت، حەزکردن لە قسەی خۆشو نوکتەبازی.
* عەقڵو هۆشێکی ڕێکوپێكو هاوسەنگ کە توانای شت لە یەك جیاکردنەوەی هەبێتو توانای ئەوەی هەبێت شت ببینێت بەگوێرەی دوورییەکەی.
* خوێن ساردو هێمن بێتو توانای کارکردنی هەبێت لە بارودۆخی پەلەدا بە بێ سەرلێشێوانو لەکیسدانی توانا لەسەر کاری ورد.



* خێرایی بیرکردنەوە لەگەڵ وردیدا.
* دڵو ویژدانی زیندوو بێتو بە ئارەزووەوە کار بکات، بەزەیی نەیەتەوە بە کەسدا، بە مەرجێك بە ڕێبازێکی راستدا بڕوات.
* توانای هەبێ لەسەر بڕیاردانو پێداچوونەوە بە بڕیاردا.
* توانای هەبێ لەسەر تێگەیشتن لە حەقیقەتو خەیاڵو بتوانێ بە شێوەیەکی پەسەند گوزارشیان لێبکا.
* توانای هەبێ لەسەر خۆگونجاندن، واتە توانای ئەوەی هەبێ سەیری شت بکا لە دیدی خوێنەرانەوە، بە بێ گوێدانە هەستی خۆی.
* شارەزایی هەبێ لەسەر گرنگترین بنەماکانی یاسای تۆمەت دانەپاڵ خەڵكو ناوزڕاندنو یاسا تایبەتەکانی مافی مرۆڤ.
* لەشی توانای ئەوەی هەبێ بەرگەی ژیانێکی سەخت بگرێ کە ناچاری دەکا زۆربەی کات دانیشێو باج بدا لە مێشكو تەندروستیو بینایی چاوانی.
* گیانی کاری هەرەوەزیی تێدا بێ، چونکە رۆژنامە گرنگترین بەرهەمێکە بۆ کاری هەرەوەزی.

## ئەو کەرەستانەی یاریدەدەری سەرنووسەر پێویستیەتی

ئەو کەرەستانەی یاریدەدەری سەرنووسەر بۆ پێداچوونەوە پێویستیەتی چەند کەرەستەیەکن لە هەموو جیهانداو بریتین لە فەرهەنگو کتێبێکی سەرچاوەی زانیاری (موسوعە)و کتێبێك لەسەر یاسای زمانو نەخشەی جیهانو وڵاتان، کتێبێك وتە بەناوبانگەکانی تیا کۆ کرابێتەوە، رابەری تەلەفونات، ناوی شارەکان. هەروەها دەبێ ئەم کەرەستانە هەموو لە بەردەستدا بن بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە سەریان. ئەمانە دەکرێ لە کتێبخانەی رۆژنامەکەدا دابنرێن.

هەموو ئەم کەرەستانە پێویستن ئامادە بکرێن، چونکە یاریدەدەری سەرنووسەر بۆ پێداچوونەوە، دەبێ بگەڕێتەوە سەریان بۆ دڵنیابوون لە ناوەرۆکی هەواڵەکانو ناکرێ هەر پشت ببەستێ بە خەیاڵو هۆشی خۆیەوە لەم جۆرە کارانەدا، زۆرجاریش یاریدەدەر پەنا دەباتە بەر ئەم سەرچاوانە بۆ پێداچوونەوەی هەواڵ.

لە گەلێك لە ولاّتە تازەپێگەیشتووەکاندا، کە هێشتا رۆژنامە بە شێوە ئاساییەکەی جاران دەردەچێ‌و چاپ دەکرێ (واتە بە پیتی قورقوشم)، یاریدەدەری سەرنووسەر پێویستی بە چەند کەرەستەی دیکە هەیە وەك قەڵەمی رەش، لاستیك، قەیچی — مقەست، لەزگە بۆ ئەوەی بەکاربهێنرێ لە لکاندنی پارچەکان بەیەکەوە، رەنگە پێویستیشی هەبێ بە ئامێرێکی نووسین. بابەتەکان بە دەست دەنووسرێن، هەروەها مانشێتەکان لای سەرووی لاپەڕەکانەوە دەنووسرێن یا لای سەرەوەی هەواڵەکەوە. هەواڵەکان هەموو کۆ دەکرێنەوەو چاوی پیا دەگێڕدرێتەوە. پاشان پیتە قورقوشمەکان ریز دەکرێن لە قالبێکداو دەست دەکرێ بە چاپکردن، لە زۆر ولاّتیشدا لەبری ئەم کارە بە ئۆفسێت چاپ دەکرێ.

لە زۆر شوێنی جیهاندا بەکارهێنانی ئامێری ڤیدیۆ لە دەرکردنی رۆژنامەدا بلاّو بووەتەوە، لەو رۆژنامانەدا کە ئەم جۆرە ئامێرانە بەکار دێنن، هەواڵەکان لەسەر شاشەی ئامێرەکە دەنووسرێن‌و هەر لەوێوە دەگوێزرێنەوە بۆ سەرۆك بەشەکان‌و پاشان رەوانەی دیسکی سەرەکی دەکرێن. لەوێ یاریدەدەری سەرنووسەر بۆ پێداچوونەوە، هەواڵەکە وەردەگرێ‌و چاوی پیا دەگێڕێتەوەو مانشێتی بۆ دەنووسێ‌و بڕیار دەدا بە چ فۆنتێك بنووسرێ‌و ستوونەکەی چەندە پان بێ، ئەمەش بەهۆی بەکارهێنانی چەند دوگمەیەکی تایبەت لە ئامێرەکەدا، دواهەنگاو یاریدەدەری سەرنووسەر دەست دەنێ بە دوگمەیەکداو هەواڵەکان رەوانەی چەند ئامێرێك دەکا بۆ کۆکردنەوەیان.

بەهۆی زۆری‌و گرانیی نرخی ئەو ئامێرانەوە، دەزگاکانی بلاّوکردنەوە لە هەندێ ولاّتدا چەند ئامێرێکی نووسینی کارەباییان کڕیوە بۆ هۆڵی دەستەی نووسەران لە رۆژنامەکەیاندا. لەم حاڵەتەدا رۆژنامەنووسەکان هەواڵەکانیان بەم ئامێرانە دەنووسن بە بەکارهێنانی شریتی رەش‌و کاغەزی سپی، پاشان ئەم هەواڵە نووسراوانە، بە ئامێرێکی تایبەت دەپشکێنرێن‌و پاشتر دەخرێنە سەر کۆمپیوتەرو ئەویش ئامێری کۆکۆدنەوە کار پێدەکا.

لەبەر ئەوەی کە پێویستە راستکردنەوەو هەڵەچنی بە وردی بنووسرێ لە نێوان دێڕەکاندا کە بە ئامێری نووسین نووسراون‌و ئەمەش کارێکە کاتێکی زۆری دەوێ، رۆژنامەنووسان‌و سەرنووسەران بۆیان دەرکەوتووە کە بەکارهێنانی ئەم تەکنەلۆژیایە توانایان کەم دەکاتەوە لە پێداچوونەوەدا.



## ئامادەکردنی هەواڵ بۆ بلاّوکردنەوە

پێویستە لەسەر یاریدەدەری سەرنووسەر بۆ پێداچوونەوە، یەکەم جار هەواڵەکە بخوێنێتەوە بە تەواوی بۆ ئەوەی بزانێ نووسەر دەیەوێ چی بڵێ، پاشان لەسەریەتی وەك هونەرمەندی پەیکەرتاش بە (ئەسکەنە)کەی خۆی دەست بکا بە رێککردن‌و جوانکردنی بابەتەکەو شتە زیادەکانی لێبکاتەوەو ئەو شوێنەی پێویستی بە درێژەپێدان هەیە درێژەی پێبداتو ئەوەی پێویستی بە کورتکردنەوە هەیە کورتی بکاتەوەو چی هەڵەی نووسین هەیە راستیان بکاتەوە تا ئەو کاتەی ئەو نووسینە شێوەیەکی زۆر ورد دەگرێ بەخۆیەوە.

## ناواخنی زیاد

زۆر دەگمەنە چیرۆکە هەواڵێك هەبێ، نەتوانرێ بکرێ بە بابەتێکی سادە. نووسەر بە چاوێکی وردبینەوە، ئەو وشەو رستانە کە گرنگ نین لایان دەباو هەمیشە لە خۆی دەپرسێ، ئایا ئەم وشانە پێویستن؟ دەکرێ ئەم هەواڵە وەك خۆی بمێنێتەوە، یاخود باشتر نابێ ئەگەر ئەو وشانە لاببرێن؟

ئەو رستەیەی باسی کارێکی تیا کراوە، لە سەرەتادا کارەکە باس دەکرێ‌و بە دوایدا بکەرەکە، ئەم شێوەیە یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی خوێنەر بە جوانی لێی تێبگا. بەلاّم ئەگەر تۆ بێی باسی رەوشت‌و شوێن‌و کات‌و نیمچە رستە بەکار بێنی ئەوە کەمتر خوێنەر لە بابەتەکە تێدەگا. هەروەها پێویستە رستەکان کورت بن، لەگەڵ ئەوەشداو بۆ جۆراوجۆرکردنی بابەتەکەو هەندێ جار لە ناچاریدا، ئەوە رستەکان درێژ دەبنەوەو زیاتر ئاڵۆز دەبن.

گەلێك لە نووسەران پابەندن بەو بۆچوونەوە کە دەڵێ هەر رستەیەك دەبێ لەسەر یەك بابەت بێ. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە خۆت دوور بگری لە لابردن‌و قرتاندنی هەندێ شت‌و ئەو مانایەی نووسەر مەبەستی بووە بیگۆڕێ. قسەدانە پاڵ خاوەنەکەی لە نووسینەکەدا، بە شێوەیەکی لەڕادەبەدەر نموونەیەکی ترە بۆ ناواخنی — حشو — زیاد. راستە ئەگەر قسەی یەکێك بگێڕێتەوە دەبێ بڵێی فلاّن سەرچاوە ئەمەی گوت، بەلاّم هەندێ نووسەر راهاتوون لەسەر ئەوەی هەر لە خۆوە وشەی (گوتی) تێهەڵکێش بکەن لە نووسینەکانیاندا، ئەمەیە دەبێ لاببرێ.

## کورتکردنەوەو درێژەدان بە نووسین

وەك چۆن لە گفتوگۆدا روو دەدا، زۆر نووسەر هەیە ئەوەی کە دەیانەوێ بیلێن دوو جار یا زیاتر دووبارەی دەکەنەوە بۆ دڵنیابوون لەوەی، ئەوەی کە مەبەستیانە بیخەنە روو و بزر نەبێ، ئەمەش بە زۆری بەهۆی ئەو گوشارەوەیە دەکەوێتە سەریان یا بەهۆی کەمتەرخەمییەوە. لەبەر ئەوەی پێویستە لەسەر یارمەتیدەری سەرنووسەر ئاگای لە خۆی بێ‌و هەر دووبارەبوونەوەیەك یا درێژەپێدانێك لابەرێ لە نووسینەکاندا.

کورتکردنەوەو درێژەدان بە نووسین بە زۆری لە شێوەی دووبارەکردنەوەی وشەیەك یا زیاتر دەبێ کە پێویست نییە، بۆ نموونە، منداڵێکی بچوك، "زارۆکێکی بچوك"، یا "بە تەواوی وێران کرا" یا "پلانەکانی دوارۆژ".

لە واقیعدا ناواخنی زیادە یا کورتکردنەوە، تەنیا دوو نموونەن لەو هەڵە زۆرانەی یارمەتیدەری سەرنووسەر بۆ پێداچوونەوە، بەرپرسە لێیان ئەگەر راستیان نەکاتەوە، هەر وڵاتێکیش بگری، زاراوەی تایبەتی خۆی بۆ گوزارشکردنو دەربڕینو زاراوەی ناو خەڵکی ئاساییو داڕشتنی بێتامو بیرۆکراتییانە شتی تری لەو بابەتانە کە هەواڵەکان گیریان خواردووە بە دەستییانەوە، هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا کە چەند مەرجو بناغەیەکی جیهانی دانراون بۆ نووسینی جوانو چاك. هەروەها یەکێك لە فەرهەنگە ئەمریکییەکان وا پێناسەی (نووسینی رۆژنامە)ی کردووە کە برتییە لە (نووسینی بەپەلە)و، ئەو نووسینانەی بە پەلە دەنووسرێن، رەنگە لە باری داڕشتنو یاسای زمانەوانییەوە رێکوپێكو تەواو بن. ئەگەر ناتەواویشی تێدابێ ئەوا چاوپێاگەڕاندنەوەکە وای لێدەکا کە ناتەواویی تێدا نەهێڵێ.

## نووسینی مانشێت

باش چاوگێڕانەوە بە بابەتەکانی رۆژنامەکەدا بۆ دڵنیابوون لە وردیو کورتیی نووسینو رێکوپێکیی شێواز، ئەرکی دووهەمی یاریدەدەری سەرنووسەر، بریتییە لە نووسینی ناونیشانو مانشێتی نووسینەکان.



ئەرکی مانشێت:

مانشێتی جوانو پەسەند:

* سەرنجی خوێنەر رادەکێشێ.
* پوختەیەکی هەواڵ دەخاتە بەرچاو.
* یارمەتیی خوێنەر دەدا لەسەر زانینی ناوەرۆکی لاپەڕەکە.
* وێنەی بارودۆخی رووداوەکەت بۆ دەکێشێ.
* یارمەتی دەدا لەسەر دیاریکردنی شێوازی رۆژنامەکە.
* هەست بە جۆراوجۆری (پۆنت) دەبەخشێ بە خوێنەر.

لەگەڵ ئەوەدا کە ناونیشانو مانشێتەکان پێی دەگوترێ (جامخانەی رۆژنامە)، بەڵام لە راستیدا ئەرکێکی لەوە زیاتر دەگرێتە ئەستۆی خۆی، چونکە سەرچاوەیەکی گەورەیە بۆ بەدەستهێنانی زانیاری، ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە کە کەسانێکی کەم هەن کاتی ئەوەیان هەبێ، یا حەز لەوە بکەن هەموو شتێکی ناو رۆژنامەکە بخوێننەوەو رەنگە خۆیان ئەو بڕیارە بدەن کە کام بابەتو کام هەواڵ شایەنی ئەوەیە زیاتر گرنگیی پێبدرێ.

ئیتر جیاوازیی قەوارەو شێوە مانشێتەکانو هەڵبژاردنی شوێنی بڵاوکردنەوەی هەواڵەکە، لەسەر لاپەڕەی یەکەم یا لاپەڕەکانی تر، ئەوە ئەرکێکی مانادارە، ئەمانە هەموو گرنگیی هەواڵەکە روون دەکەنەوە بۆ خوێنەران. بە شێوەیەکی گشتی، ناونیشانو مانشێتە گەورەکان ئاماژەن بە گرنگیی هەواڵو بەکارهێنانی پیتی گەورەو فرتوفێڵە چاپەمەنییەکانی تر، ئاماژەن بەوەی کە ئەو هەواڵە لە بناغەدا لەبەر خۆشییەکەیەتی نەك لەبەر گرنگییەکەی.

## مانشێتەکان

* پێشبڕکێ دەکەن لەگەڵ یەکتریدا بۆ ئەوەی هانی خوێنەر بدەن بۆ خوێندنەوەی هەواڵەکانو رەنگە هەواڵی باش بخرێتە پشتگوێ ئەگەر مانشێتەکە نەتوانێ سەرنجی خەڵك رابکێشێ بۆ خوێندنەوەی.

* پێکهاتەی کەرەستەیەکی رۆژنامەوانیی سەرنجڕاکێش پێشکەش دەکا، مانشێت بە هەموو جۆرەکانییەوە شتێکی پێویستە بۆ ئامادەکردنی چەند لاپەڕەیەکی سەرنجڕاکێش‌و هاوسەنگ‌و جوان.
* حاڵەت‌و کەسیەتییەکی جێگیر دەکا بە بەر رۆژنامەکەدا، چونکە بەکارهێنانی بەردەوامی چەند شێوازێکی تایبەتی لە رۆژنامەدا کەسیەتییەکی خوو پێوەگیراوی پەسەند دەبەخشێ بە رۆژنامەکە.
* یارمەتیدەرە بۆ برەودان بە رۆژنامەکە، بە تایبەت ئەوانەی کە لە فرۆشگە تایبەتەکان یا لەسەر شۆستەکان دەفرۆشرێن.

## نووسینی مانشێت‌و ناونیشانی هەواڵ

ئەو لێهاتووییانەی پێویستن بۆ نووسینی مانشێتێکی سەرکەوتوو ئەمانەن:

١) باش تێگەیشتن لەو هەواڵەی دەتەوێ ناونیشانەکەی بۆ بنووسی.

٢) سەرمایەیەکی باشت هەبێ لە وشەو زاراوەی زمان.

٣) هەست‌و توانایەکی بەهێزو تەواوت هەبێ بۆ پێکهێنانی رستە.

٤) چاوێکی وردبینت هەبێ‌و خۆت بپارێزی لە بەکارهێنانی هەندێ رستەی وا کە بە ئاسانی مانا نەدەن بەدەستەوە.

دەبێ مانشێتەکە وەربگێڕێ لەو زانیارییانەی نزیکن لە سەرەتای هەواڵەکەوەو وشە سەرەکییەکانی بە جۆرێك هەڵبژێررێت کە بگونجێن لەگەڵ ئەو رووبەرەدا کە بۆی دانراوە، شتێکی ئاساییە کە کار بە دوای ناودا دێت‌و هەردوو لە دێڕی یەکەمدا دادەنرێن ئەگەر بکرێ. یاریدەدەری سەرنووسەر دەبێ هەوڵ بدا تێبگا لەو مانایە کە زاڵ بووە بەسەر هەواڵەکەدا. چاکتریش وایە وشەی کورت‌و سادە بەکاربهێنرێ لە ناونیشانەکانداو دەبێ خۆی دوور بگرێ لە بەکارهێنانی وشەی بریقەدارو دروستکراوو نابێ لە ناونیشانەکاندا وشە کورتکراوەکان بەکار بهێنرێن، هەروەها پێویستە ئەو کار (فعل)انەی بەکار دەهێنرێن بخرێنە قاڵبی ئەو کارانەوە کە لە داهاتوودا ئەنجام دەدرێن. هەروەها نابێ ناوی کەسەکان ببرێت لە مانشێتەکەدا، مەگەر کاتێك کە کەسانێکی ناودارو دەرکەوتووبن.



هەروەها پێویستە ناونیشانی بابەتەکە روون‌و ئاشکرا بێ‌و دوور بێ لە رستەو وشەی وا کە مانای شاراوە بێ. لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە ناونیشانەکە بەگوێرەی ئەو شوێنە بێ کە بۆی دانراوە، واتە نە درێژتر بێ‌و نە کورتتر بێ لەو رووبەرە.

## نووسینی ئەو هەواڵانەی لە ئاژانسەکانی دەنگوباسەوە دێن

دەنگی ئەو ئامێرانەی بروسکەکانی ئاژانسەکانی دەنگوباس وەردەگرن کە سەعات بە دوای سەعات بە وردی‌و بێ دابڕان بڵاو دەبنەوە، هەستێکی ورووژاندن‌و ئامادەکاری دروست دەکەن لە هۆڵی نووسەراندا لە هەموو گۆشەیەکی جیهان، چونکە ئەو بروسکانەی ئەو ئامێرانەی چاپیان دەکەن خۆبەخۆ لەسەر ئەو لوولە کاغەزانە کە کۆتاییان نایەت، بەرجەستەی جیهانێکی پڕ لە جموجۆڵ دەکەن هەر لە بەیروت‌و لەندەن‌و لیماو مۆسکۆوە تا هەزاران شاری تر.

بەرەبەرە ئەم ئامێرە بروسکەنێرانە، دەگۆڕدرێن بە ئامێری کۆمپیوتەرو ڤیدیۆ، وەك چۆن ئەم ئامێرە بروسکەنێرانە شوێنی شێوە کۆنەکانی بروسکە ناردنیان گرتەوە کە لەسەر (خاڵ‌و پۆلیس) راوەستابوون. لەو هۆڵانەی نووسیندا کە زیاتر پێشکەوتوون لەباری تەکنەلۆژیاوە، ئەوا بروسکەکان راستەوخۆ لە ئاژانسەکانی دەنگوباسەوە دەگوێزرێنەوە بۆ ئەو کۆمپیوتەرەی هەیە لە رۆژنامەکەدا، ئەمەش بۆ ئەوەی هەواڵەکان بنووسرێن لەسەر شاشەی ڤیدیۆ کە بە شێوەیەکی خێراتر لە جاران، چەند ئامێرێکی چاپکردنی کارەباییش هەن زۆر بە خێرایی کار دەکەن بۆ ئەوەی بەکار بهێنرێن ئەگەر کۆمپیوتەری رۆژنامەکە پەکی کەوت.

بەهۆی لاوازی‌و کەمیی سەرچاوەی داراییەوە، یا بەهۆی دژایەتیکردن لەلایەن سەندیکاکانی کرێکارانەوە — وەك لە زۆربەی رۆژنامەکانی پورتوگالدا — بە سەدان رۆژنامە هێشتا نەگەیشتوونەتە رادەی بەکارهێنانی تەکنەلۆژیای نوێ لە کارداو تا ئێستا ئەو رۆژنامانە، بروسکە لە رێگەی ئامێری بێتەل، یا بەهۆی ئەو ئامێرە بروسکەنێرانەوە کە خێراییان نزیکەی شەست‌و شەش وشەیە لە خولەکێکدا. لە هەندێ هۆڵی دەستەی نووسەراندا بروسکەکان لەگەڵ شریتی کونکراوەدا دەنێردرێن‌و ئەم شریتانە بەکار دەهێنرێن لە کارپێکردنی ئامێرەکانی چاپدا. ئەم بەشەی خوارەوە قورسایی خستووەتە سەر چۆنیەتیی کارکردن لەگەڵ ئەو بروسکانەی ئامێرە ئاساییەکان دەینێرن.

هەموو ئاژانسێکی دەنگوباس، هەواڵەکانی خۆی دەکا بە دوو بەشەوە، راپۆرتی بەیانیانو راپۆرتی ئێواران، ئەوانەی بەیانییان دەنێردرێن بۆ رۆژنامەکانی ئێوارەو ئەوانەی ئێواران دەنێردرێن بۆ رۆژنامەکانی بەیانیان، ئەم راپۆرتانە هەموو کاتێك بە لیستێك دەست پێدەکەن کە گرنگترین ئەو هەواڵانەی تێدایە کە دەیاننێرن، لەگەڵ پوختەیەکی ئەو چیرۆکە هەواڵە سەرەکییانەی کە لە بەردەستدان، یاخود ئەو هەواڵانەی کە لە چەند سەعاتێکی داهاتوودا دەنێردرێن. ئەم لیستە دە تا دوانزە هەواڵ لەخۆ دەگرێ. بەرپرسی نووسینی هەواڵ پاش ئەوەی ئاگادار بوو لەو لیستە دەتوانێ نەخشەی رۆژنامەکە دارێژێو شوێن دابنێ بۆ ئەو هەواڵانەی چاوەڕوانە بگەنە دەستی.

زۆربەی ئەو هەواڵانەی ئاژانسەکانی دەنگوباس دەینێرن دوای ئەوەی کە لە لیستەکەدا پێشتر ئامادەی پێکردوون، بەم شێوەیە پۆلبەند دەکرێن. فلاش — واتە بروسکەیەکی کورت دواتر درێژەکەی دەنێردرێ — هەواڵی ئاسایی، هەواڵی بە پەلە، ئەم جۆرە ناولێنانە، کە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر جیاوازە، نووسەری هەواڵ ئاگادار دەکاتەوە لەو هەواڵە گرنگانەی کە تازە روویان داوەو هێشتا لە گۆڕاندان.

ئەو هەواڵنووسانەی کە بروسکەیان لە چەند ئاژانسێکەوە بۆ دێت، ئەو هەواڵانە هەڵدەبژێرن کە بەدڵیانەو بەراوردیان دەکەن لەگەڵ ئەو هەواڵەی لە بروسکەکانی تریشدا هاتوون، یاخود لە هەموو بروسکەکاندا چی زانیاری هەیە لەو بارەیەوە کۆیان دەکەنەوە. لەم حاڵەتەدا نووسەری هەواڵ ناوی ئاژانسەکە لا دەباو لەبری ئەوە لە سەرەتای هەواڵەکەوە دەنووسێ ئاژانسەکانی دەنگوباس.

لە کاتێکدا کە بروسکە هەواڵەکان دەست دەکەن بە هاتن، یا بە تەواوی یا لە شێوەی چەند بەشێکی جیاجیای یەك لە دوای یەك کە پێشەکیی نوێو دەسکاریو شتی زیادی خراوەتە سەر، لەم حاڵەتەدا نووسەری هەواڵ جیایان دەکاتەوە لە چەند کۆمەڵێکدا یا لە چەند دۆسیەیەکدا بەگوێرەی بەکارهێنانی چاوەڕوانکراو یا بەگوێرەی شوێنەکانیان لە لاپەڕەکاندا. ئەو هەواڵانەی لە لاپەڕەکانی ناوخۆدا بلاو دەکرێنەوە لە پێشدا دەست دەکرێ بەوانەو هەواڵە گرنگەکان هەڵدەگیرێن لە چاوەڕوانیی ئەو گۆڕانەی دێت بە سەریاندا لە کاتێکی دواتردا. هەر هەواڵێکیش کە دەگات چەند نیشانەیەکی لەگەڵدایە ئەوە روون دەکەنەوە کە چەندە هەواڵەکە سەرەکییە



لەگەڵ ژمارەیەك وشە، یەك یا زیاتر کە ناوەرۆکی بروسکەکەو سەرچاوەکەیو ئەو کاتەی کە تیایدا نێردراوە، دیاری دەکەن.

یاریدەدەری سەرنووسەر بۆ پێداچوونەوە کە خەریکی رێکخستنی هەواڵێکی تایبەتە، هەموو ئەو بروسکانە وەردەگرێ کە پەیوەندییان هەیە بە هەواڵەکەوە تا بابەتەکە بخاتە سەر شێوەی دواجاری خۆی. هەروەها ئەگەر پێویستی کرد هەواڵەکە کورت دەکاتەوە بۆ ئەوەی بگونجێ لەگەڵ ئەو رووبەرەدا کە بۆی دانراوە.

بەڵام پێداچوونەوەی ئەو هەواڵانەی بە شریت دەنێردرێن ئەوە زەحمەتەو کاتێکی زۆری دەوێ، چونکە هەواڵەکە هەمووی زۆرجار دەبێ دەسکاری بکرێو چی شتی زیادەی تێدایە لا ببرێ، ئەم گۆڕانکارییانەش بە دەست دەکرێ بە بەکارهێنانی چەند هێمایەکی تایبەت. ئەو رۆژنامانەی ئەم سیستەمە بەکاردێنن ناچارن واز بێنن لە بەشی زۆری ئەو ئاسانکارییانەی کە لە سیستەمەکانی تردا هەن.

یەکێك لەو ئەرکە گرنگانەی دەکەوێتە سەر شانی نووسەری ئەو هەواڵانەی لە ئاژانسەکانی دەنگوباسەوە پێی دەگەن، ئەوەیە کە دەبێ چاو بگێڕێتەوە بەو بروسکانەدا بۆ گەڕان بە دوای هەواڵە ناوخۆییەکاندا.

سەبارەت بەو سیستمانەی کە راستەوخۆ هەواڵو زانیارییەکان دەنێرن بۆ کۆمپیوتەری رۆژنامەکە، ئەوە نووسەری هەواڵ هەوڵ دەدات پوختەیەکی تەواوی هەواڵی ئاژانسەکە بگاتە دەستی. ئەم پوختەیە دەگوێزرێتەوە بۆ کۆمپیوتەری رۆژنامەکە بە خێرایی هەزارو دوو سەد وشە لە خولەکێکدا. بەهۆی ئەو ئامێرانەوە کە هەن لە کۆمپیوتەرەکەدا، دەکرێ چیرۆکە هەواڵەکان بە تەواوی بخرێنە سەر شاشەی ڤیدیۆ لە بەردەمی نووسەرەکەدا. لەم حاڵەتەدا کاری نووسەر زۆر ئاسانترە لەوەی کە هەواڵەکان وەربگرێ لە رێگەی ئامێری بروسکەنێرەوە. چونکە لەبری ئەوەی پێشەکی بنووسێو رستەکان راست بکاتەوە سەرلەنوێ، چیرۆکە هەواڵێکی تەواوو ئامادەکراو دێتە بەردەستی هەروەها شاشە جیاجیاکانی کۆمپیوتەر وایان کردووە کە نووسەرەکان بتوانن هەموو هەواڵە بەشبەشەکان کە لە ئاژانسەکانەوە وەردەگیرێن کۆیان بکەنەوەو بیانبەستنەوە بەیەکەوە.

## سەرچاوەکان

1. From remarks by K. Finkel of the Dallas (Texas) Times Herald at Journalism Educators Seminar sponsored by the American Press Institute, Reston, Virginia, USA, October 7-12, 1984.

2. Floyd K. Baskette, Jack Z. Sissors and Brian S. Brooks, 3rd edition, The Art of Editing (New York: Macmillan Publishing Company, 1982), p. 14.

3. Adaptation distributed at Journalism Educators Seminar sponsored by the American Press Institute, Reston, Virginia, USA, October 7-12, 1984.

4. Warren K. Agee and Nelson Traquina, “A Frustrated Fourth Estate: Portugal’s Post-Revolutionary Mass Media”, Journalism Monographs, February, 1984, p. 19.

# بەشی سێزدەهەم

# نووسینی هەواڵ بۆ رادیۆ

**نووسینی: فیرنون أ. ستون**

تێبینییەك لە نووسەری کتێبەکەوە: لەگەڵ ئەوەدا کە بەشی سیانزەو چواردە، چەند نموونەو روونکردنەوەیەکیان بەکارهێناوە کە تایبەتن بە ئەمریکاوە بەڵام زانیاریی زۆریشیان تێدایە بۆ ئەوانەی هەواڵ ئامادە دەکەن بۆ رادیۆ لە هەموو گۆشەیەکی جیهاندا. هەر لەبەر ئەوەو بەهۆی داواکاریی بێژەرانی رادیۆ لە جیهانی سێهەمدا، ئەم بابەتە جوانەشمان بۆ زیاد کرد کە د. ستون بەخشیی پێمان پاش ئەوەی رووخسەتمان لێوەرگرت.

**کێ گرنگی دەدا بە مەسەلەکە؟**

وا دیارە پەیوەندییەکی پێچەوانە هەیە لە نێوان پێویستیی گۆڕینو ئەو هەوڵەی دەدرێ لەپێناوی گۆڕینو پێشخستنی پرۆسەی نووسینی هەواڵی رادیۆدا. چەند نووسەرێکی لێهاتوو لە دەزگاکانی رادیۆو تەلەفزیۆن لە ئەمریکا، وەك (جۆن چانسلۆر) لە تەلەفزیۆنی (ئێن. بی. سی)و (ولترکرۆنکایت) لە تەلەفزیۆنی (سی. بی. ئێس)و (هارتی ریزۆنر) لە تەلەفزیۆنی (ئەی. بی. سی)، هەمیشە خەریکی پوختکردنو دارشتنەوەی ئەو هەواڵانەن کە دەینووسن. هەندێ کەس، (ئیدوین نیومان)ی تەلەفزیۆنی (ئێن. بی. سی)یان وا باس کردووە کە (نووسەرێکە شێوازێکی هەست بەرزی ویژدان زیندووە)، چونکە بەردەوام خەریکی ئەو دەقانەیە کە دەینووسێ، بۆ ئەوەی رستەی بێ نرخو وشەی زیادیان لێ لابەرێ، بە مەبەستی گەیشتن بە شێوازێکی دارێژراوی سادەو ئاسان.

لەلایەکی ترەوە هەندێ نووسەری خراپ دەبینین، زۆرجار لایان وایە کە نووسەری لێهاتوون تا رادەی پێویستو بەڵگە دەهێننەوە لەسەر ئەوەی شێوازی نووسین شتێکی گرنگ نییە. لەو ماوەیەدا کە خولی راهێنان کرابوویەوە بۆ ئەوانەی لە بواری خوێندنەوەی هەواڵی تەلەفزیۆندا

کاریان دەکرد کە زۆر پێویستیان بە یارمەتیو دەسگرتن هەبوو، بۆم دەرکەوت کە ئەوانە چەندە پەرۆشن بۆ بەدەستهێنانی زانیاریو ئامۆژگاری لەسەر چۆنیەتیی وێنەگرتنێکی باش بۆ فیلمێکی هەواڵ، یا چۆنیەتیی چاوپێکەوتنێکی بێ گرێو گۆڵ، یا کارێك وا لێبکرێ کە بەلای بینەرانەوە جوان بێ، بەڵام لا ناکەنەوە بەلای ئەوەدا کە برێکی باش گرنگی بدەن بەباشکردنو پێشخستنی ئەو مەسەلەو شێوازە سەرەکییانە کە لە هەموو شت زیاتر پێویستیان پێیەتی، ئەویش بریتییە لە شێوازی نووسین.

تەنانەت نووسینی هەواڵ لە دەزگاکانی رادیۆو تەلەفزیۆندا هەندێ جار بە وردی نانووسرێن، بەڵام زۆرجار وێرانو (سامناکن) لەسەر ئاستی ناوچە ناوخۆییەکان، برۆ بۆ هەر ناوچەیەك لە ئەمریکادا، گوێ بگرە لە هەر رادیۆیەکی ناوخۆیی، یاخود سەیری تەلەفزیۆنە ناوچەییەکان بکەو گوێ لەو هەواڵانە بگرە کە بڵاوی دەکەنەوە، هەر سەرت سوڕ دەمێنێ لەو حاڵەی نووسینو خوێندنەوە تووشی بووەو پرسیار لە خۆت دەکەی، تۆ بڵێیت ئەو نووسینە باشانەی شایستەی ئەوە بن گوێیان بۆ راگیرێ بووبن بە پاشماوەیەکی سەردەمانی رابوردوو.

ئەو رێوشوێنانەی پاشتر باسیان دەکەین بۆ رێنماییکردنی خەڵك ئەوە بەو خەیاڵە نووسراون کە تا ئێستا کۆمەڵە ژنو پیاوێك مابن لەوانەی لە بواری رۆژنامەگەریی بیستراودا کار دەکەن — یا بەتەمای ئەوەن —و رازی نابن بەوەی پلەیان مامناوەندی بێتو نەگەنە پلەی سەرکەوتنو لەبری ئەوە هەوڵ دەدەن بۆ ئەوەی ئەو سەرکەوتنە بەدی بێننو ئامادەشن بۆ ئەو هەوڵدانە وەك ئەوەی (ئیدوین نیومان) کردی.

رەنگە رەخنە لەخۆگرتنو بەخۆداچوونەوە بەس نەبێ، لەبەر ئەوە رێنوماییکردنی نووسەرێك یا مامۆستایەکی بەتوانا زۆر گرنگە بۆ زۆربەی ئەوانەی لە سەرەتادان، ئەوانە توانای ئەوەیان هەیە بە خێرایی شت وەرگرنو بە ئاسانی دەتوانرێ ئەو رێڕەوە خراپەی فێری بوون لە مامۆستایەکی پیشەیی بەتەمەنەوە (کە بە زۆری نووسەری نیمچە توانان)، بسڕێتەوەو نەهێڵرێ. هەندێ لە هاوکارانم لە چەند زانکۆیەکی تردا، ئەوەیان بۆ دەرکەوتووە کە ئەو خوێندکارانەی ئاستیان زۆر نزمە، بە زۆری لەوانەن کە هەندێ خووڕەوشتی خراپ فێر بوون لە دەزگا ئاست نزمەکانی رادیۆو تەلەفزیۆنداو، بەلایانەوە زۆر زەحمەتە، ئەوە لە مێشکیاندا فڕێ



بدەن کە مامۆستای کۆچکردوو (ئالان جاکسۆن) لە دەزگای (سی. بی. ئێس) کاری دەکرد، پێی دەگوت شێوازی خراپو ناشیرین لە نووسینو بەرنامەدانانی هەواڵدا.

ویلیام سمول، جێگری سەرۆکی تەلەفزیۆنی (سی. بی. ئێس)و بەڕێوەبەری بەشی هەواڵ، دەڵێ: "نووسینی باش — لەگەڵ ئەوەدا کە دەگمەنە — ناوەرۆكو گەوهەری ئەوەیە کە تەلەفزیۆن دەیەوێ پێشکەشی بکا بە خەڵك". ویلیام سمولو کەسانی تر لە بەرپرسانی بەشی هەواڵ لە رادیۆو تەلەفزیۆنەکاندا، بەردەوام دەگەڕێن بە دوای کۆمەڵە نووسەرێکدا کە توانای ئەوەیان هەبێ جوان بنووسن، دیارە ئەو جۆرە نووسەرانە کاتێکی زۆر بەسەر نابەن پێش ئەوەی کاریان دەسکەوێ. نووسینی هەواڵ بە شێوەیەکی باش بۆ بواری رادیۆو تەلەفزیۆن پاداشتی خۆی هەیە، رازیبوونی لە خۆ کە بەرهەمێکی ئاشکرای خۆدەرخستنە شتێکی کەم نییە لەناو پاداشتەکاندا.

## نووسین بۆ گوێ

رەنگە نووسینی هەواڵ بۆ رادیۆو تەلەفزیۆن جۆرە جیاوازییەکی هەبێ لە نووسین بۆ رۆژنامە. ئەو شێوە نووسینەی دەنووسرێ بۆ رادیۆ نەك هەر رێگە نادا، بەڵکو پێویستی بە جۆرە گوزارشێکە کە ئاساییە بەلاتەوە، مەبەستم شێوەی گفتوگۆی رۆژانەی ئاساییە.

ئێمە فێری قسەکردن دەبین پێش ئەوەی فێری نووسین ببین، زۆرتریش قسە دەکەین زیاتر لەوەی دەینووسین لە پەیوەندیی رۆژانەماندا لەگەڵ کەسانی تر. ئەوەندە هەیە زۆرجار وشە ئەو سروشتەی خۆی بزر دەکا کاتێك کە نووسەر بیر دەکاتەوە لە نووسینی ستوونێکی مەودا دیاریکراوو لەو یاسا رۆژنامەگەرییانەی لە سەردەمانی رابوردووەوە ماونەتەوە. کەچی ئەو نووسەرەی بابەتێك دەنووسێ بۆ رادیۆ یا تەلەفزیۆن، لەبری ئەوە بیر لەوە دەکاتەوە کە ئەو بابەتەی دەینووسێو دەخوێنرێتەوە، چ سەنگودەنگێکی هەیە لەسەر گوێی ئەوانەی هەواڵەکەیان گوێ لێیە، ئاساییی ئەوەیە کە تۆ هەواڵەکە بەدەم بیلێیت لەو کاتەدا دەینووسیتەوە.

باسی ئەو دیاردە نامۆیانە ناکەین کە هەندێ ڕۆژنامە پەیڕەوی دەکەن لـەوەدا کـە نووسـەر ناوی خاوەنی قسەکە ناهێنێ تا دەگاتە کۆتایی ڕستەکە. تۆ کە دەتەوێ لە ڕادیۆ یا تەلەفزیۆندا ڕووداوێك بۆ کەسێك بگێڕیتەوە جێی گومانە بڵێیت:

ئەو خوێندکارانەی لە دەرەوەی ویلایەتەوە هاتوون، تاقمێکی گرنگ پێکـدێنن لـە زانکـۆی (ویسکونسن)دا، باتریك لوسی پارێزگار، ئەم لێدوانەی ڕاگەیاند ئەمڕۆ.

بەڵام ڕەنگە ئەوەت بەلاوە پەسەند بێت کە بڵێیت:

(باتریك لوسی)ی پارێزگار دەڵێت: ئـەو خوێندکارانـەی لـە دەرەوەی ویلایەتـەوە هـاتوون، تاقمێکی گرنگ پێکدێنن لە زانکۆی (ویسکونسن)دا.

یاخود بڵێیت:

ئەمڕۆ باتریك لوسی گوتی ئەو خوێندکارانەی لە دەرەوەی ویلایەتـەوە هـاتوون، تـاقمێکی گرنگ پێکدێنن لە زانکۆی (ویسکونسن)دا.

تۆ ئەو سێ ڕستەیەی پێشەوە بخوێنەرەوە بۆ هەرکەسێك بۆ ئـەوەی تێبگـەی لـە جیـاوازیی نێوانیان. ڕەنگە ئەو ڕستەیەی دواییینیان ئاسانتر بێت بۆ خوێنەرو گـوێگر باشـتر لێـی تێبگـا. ئەمە ئەو مەبەستانەیە کە زۆربەی ڕێنومایییەکان پێ دادەگرن لەسەریان لە کاتی نووسینی ئـەو هەواڵانەدا کە ئامادە دەکرێن بۆ ڕادیۆ، لەبەر ئەوە کەرەستەی هەواڵ دەبێ:

١) بێژەر بە ئاسانی بتوانێ بیخوێنێتەوە.

٢) گوێگر بە ئاسانی لێی تێبگا.

لەبەر ئەوەی لە زۆرکاتدا زەحمەتە ڕۆژنامە بە دەنگی بەرز بخوێنرێتەوە، ئایـا تـۆ پێویـستە لەسەرت، وەك لە نامیلکەیەکدا پێشنیار کراوە، هەموو ئەوانە لەبیر خۆت بەریتەوە کـە فێـری بوویت دەربارەی شێوەی نووسین بۆ بڵاوکردنەوە لە ڕۆژنامەیەکدا؟، بێگومـان نـەخێر، ئەمـەش لەبەر ئەوەی زۆربەی بنەما تایبەتەکان لەسەر نووسینی هەواڵ جێبەجێ دەکرێ بەسـەر هـەموو هۆکانی ڕاگەیاندندا.

بۆ نموونە، دەبێ ئەو وشانەی بەکار دەهێنرێن دیاریکراو بن لەگـەڵ پابەنـدبوون بـە یاسـای زمانەوانییەوە. هەروەها پێویستە داڕشتنی ڕسـتە بـە جۆرێـك بـێ بـە ئاسـانی خـەڵك لێیـان تێبگەنو چیرۆکەکە بە شێوەیەکی لۆژیکی بنیات نرابێت. وەك چۆن دەبێ سـەرەتای هەواڵەکـە



سەرنج ڕابکێشێ بۆ مەبەستی سەرەکی لە چیرۆکە هەواڵەکەدا، هەروەها دەبێ بیروبۆچوونەکان وەك یەکەی تایبەت دابنرێن یەك بە تەنیشتی یەکەوە بە جۆرێك کە بگونجێن لەگەڵ یەکـدا بـە گشتی، هەروەها پێویستە لە ڕستەکەدا سیفەت نزیك بێت لە خاوەنەکەیـەوە (موصـوف). لـە ڕستە درێژەکانیشدا کار لە بکەرەکە جیا نەکرێتەوە. دەبێ ئەوەش لەیاد نەکەین کـە نووسـەری باش دەبێ بە ڕوونی بیر بکاتەوە. هەموو جۆرە لەیەکگەیشتنێکیش لەناو خەڵکـدا ڕاوەسـتاوە لەسەر ئەم دوو بنەمایە، هەروەها بناغەن بۆ نووسینی باش لە هەموو هۆکانی ڕاگەیاندندا.

هەرجۆرە ئاڵۆزییو گلێمژکردنو تێکوپێکدان لە بیرکردنـەوە یـا نووسـیندا وا لـە خوێنـەری ڕۆژنامە دەکا کە بە زەحمەت لەو شتە بگا کە دەیخوێنێتەوە. ئەم حاڵەتە بۆ ئەوانـەی گـوێ لـە هەواڵی ڕادیۆ دەگرن گرانترە، چونکە خوێنەری ڕۆژنامە ئەگەر لـە بابـەتێك تێنـەگا، دەتوانـێ بگەڕێتەوەو جارێکی تر بیخوێنێتەوە تا شتێکی لێهەڵدەکرێنێ، بەڵام ئـەوەی گـوێ لـە ڕادیـۆ دەگرێ، ناتوانێ ئەوەی بێژەرەکە دەیڵێ جارێکی تر گوێی لێبگرێو شتێکی لـێ تێبگـا. لـەو هەواڵانەدا کە بڵاو دەکرێنەوە دەبێ بابەتەکە تەواو ڕوون بێو گوێگر کە بۆ یەکـەمجارو دواجـار دەیبیسێ بە ئاسانی لێی تێبگا.

ڕەنگە سوودمەند بێ ئەوەش بێنینەوە یاد، کە ئەو کەسەی گوێ لە ڕادیۆ دەگرێ، دڵـی بـە تەواوی لای هەواڵەکە نەبێ، واتە تەنیا (نیوە گوێگرێك) بێتو بیرکردنەوەی دابەش بووبـێ لـە نێوان بەرنامەی هەواڵو هاتوچۆی کاتە قەرەباڵغەکان، یا خـەریکبوون بـە ئیـشی ماڵـەوە، یـا خوێندنەوەی ڕۆژنامەی بەیانیان، یـا گفتوگۆیـەك لەگـەڵ یـەکێکی تـردا، یـا بـەهۆی ئەمانـە هەموویانەوە.

وەك چۆن خوێنەرانی ڕۆژنامە چاو دەگێڕن بە مانشێتە سەرەکییەکاندا بۆ دیـاریکردنی ئـەو هەواڵەی دەیانەوێ بیخوێننەوە، گوێگری ڕادیۆش چـەند وشـەیەکی سـەرەکی هەڵدەبـژێرێ کـە سەرنجی ڕابکێشن بۆ ئەو هەواڵەی پەرۆشە بـۆ ئـەوەی گـوێی لێبگـرێ، ئەمـەش واتـە ئەگـەر پێشەکیی هەواڵەکە بە شێوەیەکی ئاشکرا نەخرێتە بەرگوێ بـۆ ئاماژەکردنێـك بـە هەواڵەکـە، ئەوە ڕەنگە گوێگر گرنگی نەدا پێی تا بەشێکی زۆری هەواڵەکە تێدەپەڕێ.

ئێمە مادام ئەم روونکردنەوانەمان دانا لە پێش چاوی خۆماندا، با هەندێ لەو رێنومایییانە دیاری بکەین کە دەبنە هۆی ئەوەی کارەکە بێ ئەرك بێ بۆ ئەو کەسەی بە دەنگێکی بەرز دەیخوێنێتەوەو ئاسانتر دەبێ بۆ ئەو کەسەی گوێی لێڕادەگرێ.

## گرنگیدان بە ناوەرۆك لە هەواڵدا

ئەو رێبازەی پەیڕەوی دەکرێو بریتییە لە گێڕانەوەی هەموو ئەو بابەتانەی دەکەونە بەرچاو، بۆ هەواڵی رادیۆ، بێ کەڵكو ناتەواوە، چونکە کات ئەوەندە زۆر نییە بەشی ئەوە بکا. بۆ نموونە، ئەگەر ئێمە ئەو کاتە بخەینە لاوە کە دانراوە بۆ ئاگاداریو ریکلامە بازرگانییەکان لە کاتی خوێندنەوەی هەواڵدا، کە پێنج خولەك دەخایەنێ، ئەوە بە دەگمەن کاتەکە بەشی ئەوە دەکا کە پەنجا دێڕ بخوێنرێتەوە تیایدا — بێژەری ئاسایی مامناوەندی لە هەر خولەکێکدا پانزە یا شانزە دێڕ دەخوێنێتەوە —و تۆ ناچاریت لەو پەنجا دێڕەدا هەشت یا دە هەواڵ بخەیتە ناویەوە. لەبەر ئەوە پێویستە لەسەرت شەنو کەوێکی هەواڵەکان بکەیتو ئەوانەیان بڵاو بکەیتەوە کە زیاتر گرنگن.

پێویستە لەسەرت هەستێکی هەڵبژاردنی وردو ناسکت هەبێ زیاتر لەو هاوکارانەی کار دەکەن لە رۆژنامەکاندا، هەروەها پێویستە لەسەرت بە روونی گرنگی بدەی بە بەشی هەرە گرنگ لە هەواڵەکە بێ ئەوەی بچیتە قووڵایی بابەتە پلە دووەکانەوە چونکە گوێگران، تەنیا هەر ئەوەیان پێدەکرێ برێکی کەمی زانیاری وەربگرن لە ماوەیەکی دیاریکراوی کەمدا. لەبەر ئەوە دەبێ خۆت بپارێزی لەوەی هەوڵی ئەوە بدەیت بابەتی زیاد لە پێویست کۆ بکەیتەوە لە هەواڵەکەدا. بۆ تۆ باشتر وایە خاڵێك یا دوو خاڵی گرنگ بە تەواوی باس بکەیت، نەك هەوڵی ئەوە بدەیت پوختەیەکی تێکەڵوپێکەڵی شەش یا هەشت خاڵ باس بکەیت کە دەبێتە بارێکی قورس بەسەر گوێگرەوەو رەنگە لە راستیشدا سەرنەکەوتبی لە گەیاندنی هیچ شتێکدا بۆی.

لە هەمان کاتدا دەبێ خۆی بپارێزێ لە شێوازی تەنیا باسکردنی مانشێتە سەرەکییەکان، ئەو شێوازەی گوێگر وا لێدەکا پرسیار بکا ئایا هەواڵەکە پەیوەندیی هەیە بەوەوە. هەندێ جاریش بابەتەکە پێویستی بەوەیە زانیارییەك هەبێ لەسەر رابوردووی یا روونکردنەوەیەکی لەگەڵدا بێت، تەنانەت ئەگەر ناچاریش ببیت هەندێ زانیاریی تازە بخەیتە لاوە. جارێکی تریش



پێ دادەگرین لەسەر ئەوەی کە تۆ دەتوانی باشتر خزمەتی گوێگران بکەیت، ئەگەر راپۆرتێك پێشکەش بکەیت شتێك بدا بەدەستەوە لەبری ئەوەی دوو راپۆرت بنووسی بە خێرایی لاواز بنو گوێگران هیچ سوودێکی وەهای لێنەبینن.

## بەکارهێنانی بروسکەی ئاژانسی دەنگوباس، یا راپۆرتی رۆژنامەکان لە نووسیندا

تووتی ئاسا، هیچ هەواڵێك لە ئاژانسی دەنگوباس یا رۆژنامەکانەوە یەکسەر وەر مەگرە. بەڵکو بە شێوەی تایبەتیی خۆت بابەتەکە بخوێنەرەوەو بە رستەو وشەکانی خۆت دایڕێژەرەوە بە بێ ئەوەی سەرچاوەکە بەکاربێنی تەنیا وەك کەرەستەیەکی خاو نەبێ. رەنگە زۆر لەوانەی پێیان دەگوترێ (سەرلەنوێ نووسراونەتەوە) لە راستیدا لە چەند بڕگەیەك زیاتر نین کە (کۆپی کراون)، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم جۆرە کارانە بە دڵی ئاژانسەکان نینو خەڵك هان نادەن بۆ ئەنجامدانی شتی لەو جۆرە، بەڵام ئەو هەواڵانەی بڵاو دەکرێنەوە بە زۆری دوو یا سێ بڕگەی یەکەمی هەواڵەکەیان وەرگرتووە لەوەوە کە رۆژنامەکە لە ئاژانسەکانەوە وەری گرتووە بە بێ دەسکاریو گۆڕینێك شایانی باس بێ، جگە لە وشەیەك یا دوو وشە لێرە یا لەوێ، زۆرێك لەم هەواڵانە دەخوێنرێنەوە بە پلەیەکی تەواوو گونجاویشە لەگەڵ کاری بروسکە ناردندا، بەڵام ئەمە پێی ناگوترێ نووسینی هەواڵ بۆ رادیۆ.

رەنگە بەلاتەوە شتێکی گران بێت، بە تایبەتی ئەگەر هەواڵە سەرەکییەکە بخوێنرێتەوە، خۆت دەرباز بکەیت لە داڕشتنەوەی، ئەو فێڵەش کە زۆربەی نووسەرانی هەواڵ پەنا دەبەنە بەری، بریتییە لەوەی سەرچاوەی هەواڵەکە دەخەنە لاوەو ئەنجا خۆیان هەواڵەکە دەنووسن بەگوێرەی ئەوەی لە مێشکیاندایەو دەگەڕێنەوە سەر ئەو هەواڵەی کە لە بروسکە یا رۆژنامەکەدا هاتووە، تەنیا لەو حاڵەتانەدا کە بیانەوێ شتێکی تایبەتیی لێوەربگرن یاخود ناوێك یا شتێکی لەو جۆرە.

فێری ئەوە ببە کە بە وردی سەرچاوەکە بخوێنیتەوەو تێیبگەیت، بە تەنیا گرنگی بدە بە خاڵە سەرەکییەکانی، چونکە رەنگە ئەگەر تۆ بە وردی هەموو هەواڵەکە بخوێنیتەوە، ئەوەندە کاتت بۆ نامێنێتەوە کە هەواڵەکان بنووسیت. بۆ ئەوەی ببی بە نووسەرێکی خاوەن توانا لە بواری هەواڵدا، پێویستە لەسەرت کە دەسبەکار دەبیت، دەبێت زانیاریی پێشینەت هەبێ

لەسەر هەواڵەکە چونکە تۆ ئەو زانیارییانەت چنگ ناکەوێ لە دۆسیەی رۆژانەی هەواڵەکانو کاتی ئەوەشت نییە بگەڕێی بە دوایدا، یاخود دەبێ ئەو زانیارییانە نەبن لەوەدا کە رادیۆکە رۆژانە بڵاویان دەکاتەوە.

لەبەر ئەوە دەبێ تۆ خۆت ئامادە بکەیتو خەریکی خوێندنەوەی رۆژنامەو گۆڤارو سەرچاوەکانی تر بیت، بە جۆرێك لەگەڵ هەموو رووداوێکی جیهانو دەوروبەردا رێ بکەوێت. ئیتر ئەو رۆژنامەنووسانەی کە ئاگایان لە هیچ نییە لەوە زیاتر کە دەیخوێننەوە لە بروسکەکانی رادیۆدا (ئەمە بریتییە لە چاپکردنی مانشێتە سەرەکییەکانو هەندێ بڕگە کە بە درێژایی رۆژ بڵاو دەکرێنەوە)، ئەمانە لە زانیارییەکی سەرپێیی زیاتر هیچ شك نابەنو پلەیان لەوە کەمترە کە بنووسن یا هەواڵنامەیەك بنووسن بۆ بڵاوکردنەوە.

ئەگەر تۆ لە هەواڵێك نەگەیشتی، ئەوە ئەگەرێکی گەورە هەیە کە ژمارەیەکی زۆر لە گوێگرەکانیشت سەریان لێبشێوێو لێی تێنەگەن. ئەوە هەر نووسەری تەمەڵو بێ کەڵکە کە بروسکەکە وەك خۆی دەنووسێتەوە بە بێ ئەوەی هیچی لێ تێبگا، بەڵام نووسەری باش هەوڵ دەدا کە لە ماناکەی تێبگاو بە شێوەیەکی روونو ئاشکرا گوزارشی لێ بکا.

ئەی دەربارەی ئەوەی کە تۆ شت وەربگریت لە رۆژنامەیەکەوە بە بێ رەزامەندیی وەرگرتن؟ ئەمە لە سەدان هۆڵی نووسەراندا رۆژانە روو دەدا کە هەواڵیان تیا دەنووسرێ. ئەمەش وەنەبێ پێشێلکردنێکی مافی نووسەری بابەتەکە بێ، هەرچەندە ئەمە زۆرجار خۆی پێشێلکردنەو، زۆر لە دەزگاکانی رادیۆو تەلەفزیۆن بەردەوامن لەم کارەداو گوێی نادەنێ — چونکە هەواڵ، واتە ئەو زانیارییانەی پەیوەندییان هەیە بە رووداوەکەوە — بە مافی نووسەری بابەت دانانرێ، بەڵام نووسینەکە — بە مانای داڕشتنی بابەتەکە — بە مافی خۆی دادەنرێ. کاتێك نووسەری بابەتێك بۆ رادیۆ یا تەلەفزیۆن، نووسینێك بڵاو دەکاتەوە کە لە رۆژنامەیەکدا بڵاو کراوەتەوە وەك سەرچاوەیەکی زانیاریو پاشتر نووسینەکە دەخاتە لاوەو خۆی بە شێوەو نووسینی تایبەتی خۆی هەواڵەکە دادەڕێژێتەوە. ئەوە زۆرکات بە شتێکی ئاسایی سەیر دەکرێ، بەڵام ئەگەر نووسینەکەی بە تەواوی لەوەی رۆژنامەکە دەچوو بە بێ کەمو زیاد ئەوا ئەو دەزگای تەلەفزیۆن یا رادیۆیەی بڵاوی دەکاتەوە تۆمەتبار دەکرێ بە پێشێلکردنی مافی نووسەر یا سەرپێچییەکی



تری لەو جۆرە. ئەوەی جێگەی دڵخۆشییە بۆ پیاو، ئەوەیە کە ناوبەناو یەکێك لە دەزگاکان لە کاتی جێبەجێکردنی ئەو پێشێلییەدا پێی دەزانرێ.

وشەیەکی ئاگادارکردنەوە: ئەگەر نووسینێکت بڵاو کردەوە کە تۆمەتێك یا ناوزڕاندنی کەسێکی تێدا بوو و لە رۆژنامەیەك وەرتگرتبوو، ئەوا ئەو دەزگایەی تۆ کاری تیا دەکەیت، رووبەڕووی سزای یاسایی دەبێتەوە لەگەڵ ئەو رۆژنامەیەی بابەتەکەی بڵاو کردووەتەوە، چونکە تۆ ئەگەر باوەڕت بە هەواڵی سەرچاوەیەك هەبوو، ئەوا تۆش بەرپرسیار دەبی وەك ئەو.

## روونی

جێگرێك نییە بۆ شێوازی راستەوخۆی رستەو بنیاتنانی چیرۆکە هەواڵ. کاتێك ئەو هەواڵو رووداوە لە مێشکتدا ئامادە بوو، پێویستە لەسەرت بە شێوەیەکی راستەوخۆ بیگێڕیتەوە، دەبێ خۆت دوور بگری لە بەکارهێنانی رستەی قسەبڕ (الجمل الاعتراچیە) لە سەرەتای رستەدا، ئەگەر ویستت باسی رەگەزی سەرەکی بکەیت بە وشەی "ئەگەر" یا "بەڵام" ئەوا دەبێ رەگەزە سەرەکییەکە پێش بخەیتو دواتر باسی بکەیت.

دەبێ پێشەکیی نووسین سەرنج رابکێشێ بۆ رەگەزە سەرەکییەکە لە هەواڵەکەداو نابێ پڕی بکەیت لە چەند حەقیقەتێك. هەوڵی ئەوەش مەدە وشەگەلی (کێ، کەی، لەکوێ، بۆچی، چۆن) لە سەرەتادا بنووسی، چونکە تۆ بەمە گوێی گوێگر لەکیس خۆت دەدەی بەوەی ئەرکێك دەخەیتە سەر شانی کە لە توانایدا نییە.

پێویستە وشەکانی سەرەتای هەر بابەتێك زۆر بە روونی ئاماژە بدا بە گوێگر بە ناوەرۆکی بابەتەکە. رەنگە رستەیەکی دابەشکراو بتوانێ شتێکی باش لەسەر بابەتەکە بخاتە بەردەست.

نموونە: ئاژاوەی کرێکاران لە نیویۆرك ئەمشەو. کرێکارانی ترانزێت دەنگ دەدەن بۆ بەرژەوەندیی مانگرتن، ئەگەر... هتد.

بەڵام دەبێ تۆ زیادەڕەوی نەکەیت لە بەکارهێنانی ئەم شێوازو رێگەیەدا چونکە دەبێتە مایەی بێزاریو هەروەها بە بێ ئەوەی پێویست بێ کاتت لێ دەڕوا. رەنگە باشترین پێشەکی بۆ زۆربەی هەواڵەکان بەکارهێنانی یەك رستە بێ، وەك:

کرێکارانی ترانزێت لە شاری نیویۆرك، ئەمشەو دەنگ دەدەن بۆ ئەوەی مان بگرن ئەگەر... هتد.

خۆت دوور بگرە لەوەی لە پێشەکیی هەواڵدا قسەی کەسانی تر بگێڕیتەوە، یا خود پرسیار بکەی، چونکە هێنانەوەی راستەوخۆی قسەی خەڵك، وا لە گوێگر دەکا پرسیار بکا لە خۆی بۆ یەك دوو چرکە کە ئایا ئەم وشانە هی بێژەرەکەن یاخود هی کەسێکی ترن. هەروەها پێشەکییەك کە بە پرسیار دەست پێدەکات وەك ریکلامی بازرگانی وایە بۆ سابوون، یا پیشاندانی یارییەکان.

ئەو خاڵانەی دەتەوێ بیڵێیت دیاری بکە، هەر خاڵەی بە جیا. لە لایەکی هەواڵەکە لێبەرەوە پێش ئەوەی بچی بۆ لایەکی تری. بۆ نموونە: ئەوەی سەرۆکی ئەمریکا دەربارەی ڤێتنام گوتویەتی بیلێ‌و ئەنجا بچۆرە سەر قسەکانی لەسەر باج‌و دواتر باسی بەدواداچوونەکانی بکە کە پەیوەندییان هەیە بە سیاسەتی ئەمریکاوە دەربارەی ویلایەتی کالیفۆرنیا... هتد. باز مەدە بۆ پێشەوەو بۆ دواوە لە خاڵێکەوە بۆ خاڵێکی تر، چونکە ئەم جۆرە رەفتارە وا لە گوێگر دەکات دەروازەیەك بدۆزێتەوە بۆ چوونە ناو بابەتەکە جار لە دوای جار.

هەموو بابەتێکی گشتی پێویستیی بە وشەی کەمتر هەیە لە بابەتی تایبەت هەروەها تێگەیشتن لە بابەتە گشتییەکان ئاسانترە لە تایبەتەکان. پاشان ئەگەر پێناسەکردنێکی تایبەت هاتە رێت، یا چەند ژمارەیەك، یا شتێکی لەو جۆرە کە پەیوەندییەکی بەهێزی نییە بە هەواڵەکەوە، ئەوا خێرا لایبە. لە مەسەلەی مانگرتنی کرێکارانی نیویۆرکدا، دەتوانین تەواوی ناوی سەندیکا ناوچەییەکە بهێنین بەڵام زۆربەی گوێگران گرنگی نادەن بەوە، چونکە کە تۆ گوتت کرێکارانی ترانزێت ئەوە خۆی ماناکە بە تەواوی دەدا بەدەستەوە.

دەبێ تێکڕای ئەو وشانەی بەکاریان دێنی لە رستەیەکدا لە حەڤدە وشە تێنەپەڕێت وەك (فیلش) دەڵێ: لە راستیدا درێژیی رستەکە خۆی لە خۆیدا گرنگییەکەی کەمترە لە رەوتی ئەو مەسەلە فیکرییانەی بە ئاسانی دێنە پێشەوە هەر لە سەرەتای هەواڵەکەوە تاکو کۆتاییەکەی. بەڵام ئەگەر شارەزاییەکی تەواوت نەبوو لەو زمانەدا کە بەکاری دەهێنی، ئەگەری ئەوە هەیە نووسینەکەت بەرەو لاوازی بچێ کە رستەکان دەست بە درێژبوونەوە دەکەن.



دەتوانی رستەیەکی قورس دابڕێژی بە شێوەیەکی باش، ئەگەر بیکەی بە دوو بەشەوە، یا بیکەی بە دوو رستە یا زیاتر، بۆ نموونە:

رستەیەکی خراپ:

سەناتۆر جایلۆرد نیلسۆن رایگەیاند لە گوتارێکدا لە بەردەم کۆبوونەوەیەکی گشتیدا لە زانکۆی ویسکونسن کە دیموکراسیخوازە گەنجەکان رێکیان خستبوو دوێنێ لە مادیسۆن، دەبێ ئەمریکا واز بێنێ لە بۆردومانکردنی ڤێتنامی باکوور.

رستەیەکی باشتر:

سەناتۆر نیلسۆن رایگەیاند کە دەبێ ئەمریکا واز بێنێ لە بۆردومانکردنی ڤێتنام، نیلسۆن قسەی دەکرد لە کۆبوونەوەیەکدا کە دیموکراسیخوازە گەنجەکان سازیان کردبوو لە زانکۆی ویسکونسن لە مادیسۆن، دوێنێ.

لەگەڵ ئەوەدا کە ئەو کاتانەی تەرخان کراون بۆ رادیۆو تەلەفزیۆن دیاریکراون، بەڵام برێك دووبارەکردنەوەو درێژەپێدان، رەنگە یارمەتیدەر بێ بۆ گوێگر، چونکە دووبارەبوونەوەی ناوی سەرۆکی دەوڵەت یا هەر کەسێکی گرنگی تر لە رستەی داهاتوودا، دادەنرێ بە خزمەتێك بۆ ئەو گوێگرانەی کە دواکەوتن لە گوێ راگرتن‌و گرنگیدان بە هەواڵەکە. لە هەمان کاتیشدا یاریدەدەرە بۆ ئەوەی هەواڵەکە روونتر بێ تەنانەت بۆ ئەوانەش کە گوێگری وریان.

دڵنیابە لەوەی کە راناو یا ئەو ناوەی راناوەکەی بۆ دەگەڕێتەوە روون‌و ئاشکرا بێت. ئەگەر ئاڵۆزییەك رووی دا لە مەسەلەکەدا، ئەوە ناوەکە خۆی جارێکی تر باس بکەرەوە. خۆت دوور بگرە لە بەکارهێنانی وشەی (پێشوو) یا (دوایی) چونکە گوێگر ناتوانێ بگەڕێتەوە دواوە تا بزانێ کامیان هاتووە لە پێش ئەویترەوە، بەڵام وشەی (بە دوای یەکدا)، ئەوە هەر لەبیری خۆتی بەرەوەو پەنا مەبەرە بەر بەکارهێنانی.

## ناوو پـەێناسەکان

لە سەرەتای هەواڵدا ناوێك مەهێنە بەرگوێی خەڵك نەکەوتبێ چونکە ئەو ناوە نامۆیانە خێرا لەبیری خەڵکدا نامێنن. دەبێ رێگە خۆش بکەی بۆ گوێگر بۆ راهاتن لەگەڵ ئەو ناوەدا، بەهۆی باسکردنی چەند زانیارییەکەوە کە خەڵك بیناسن، واتە ناوەکە بناسێنە بە گوێگر.

## چەند نموونەیەك

- ※ یەکێك لە دادوەران لە جینز فیل ئەمرۆ رایگەیاند کە... .
- ※ کـچە خوێنـدکارێکی زانکـۆی جۆرجیـا کـە نـاوی دیانـا جـۆنزە کاندیـد کـرا بۆ... .
- ※ سەناتۆر ئۆلسن یاریدەدەرێکی ئیداریی دانا، کە ناوی ویلیام فینجان... .

بەهەرحاڵ تۆ دەتوانی ناوێکی ناسراو لە سەرەتای هەواڵەکەوە باس بکەیت، وەك سەرۆك کارتەر، یا سەناتۆر برۆکس مایەر، یا پارێزگار لوسی، لەم بارەیەوە ئەم جۆرە کەسانە نازناوێکیان هەیە لە پێش ناوەکانیانەوە.

زۆربەی ناوی ناوەڕاست لا دەبرێ لە کاتی ناوهێنانی ئەوانەدا کە هەواڵەکە دروست دەکەن (گەورە بەرپرسەکان). لە راستیدا ئەوانەی کە بە تەواوی ناسراون وەك کارتەر، یا برۆکس مایەر، یا لوسی (پارێزگاری ویسکونسن) ئەوە ناوی یەکەمیان زۆرجار لا دەبرێ. تۆ ئەگەر دڵنیا بوویت لەوەی زۆربەی گوێگرەکان ناوی یەکەم دەزانن ئەوە هیچ دوودڵی مەکە لە لابردنیدا، بەڵام ئەگەر دڵنیا نەبوویت لەوە ناوەکە بهێنە. هەروەها ئەگەر پێویستی هەبوو بە ناوهێنانی تەواوی کەسەکە ئەوە نابێ ناوی ناوەڕاست لا ببرێ، وەك ئەوەی بتەوێ ناوی قوربانیی رووداوێك بەری، یاخود ناوی کەسێك کە گومانی ئەوەی لێدەکرێ تاوانێکی کردبێ.

هەروەها دەبێ خۆت بپارێزی لەو جۆرە باسکردنەی رۆژنامەکان بەکاری دێنن و دەڵێن (جۆن جۆنز ٣٠)، بۆ رادیۆ راستترین باسکردن بۆ تەمەنی کەسەکان ئەوەیە کە بڵێیت: جۆن جۆنزی تەمەن سی ساڵان، ئەگەر گومانت هەبوو ئەم شێوەیە بەکار بێنە. لەگەڵ ئەوەشدا بۆ پیاو وا باشە ناوبەناو گوێ راگرێ بۆ ئەوانەی ئەم یەکجۆرییەی باسی تەمەنیان خستووەتە لاوە، بە بەکارهێنانی رستەیەکی جیاواز، بۆ نموونە: جۆن کە تەمەنی گەیشتووەتە سی ساڵ، یا بە شێوەی یەك لەدوای یەك ئەگەر چەند کەسێك بوون. رەنگە ئەو شێوەیەی کە رۆژنامە بەکاری دەهێنێ بە شێوەیەکی باشتر ئەوە بێ کە بڵێی: سێ منداڵی هەیە، جۆن شەش ساڵ، ئەدوارد چوار ساڵ، سۆزان دوو ساڵ.



پرسیار لێرەدا ئەوەیە، کام جۆر لەمانە گونجاوترن لەوانی تر. وەڵامەکەش ئەوەیە کە: ئەو کاتەی لە شێوازو جۆری قسەکردنەکەت یەك بن لەگەڵ ئەوەدا کە تۆ لەگەڵ کەسانی تردا قسە دەکەی.

## قسەدانە پاڵ خاوەنەکەی و وەرگرتن

دەبێ ناوی وتەبێژ روون و ئاشکرابێ و بخرێتە پێش قسەکانیەوە، چونکە ئەمە بەشێکە لەو گوزارش و دەربڕینە راستەوخۆیەی بە دەم دەکرێ (کێ، وتی، چی). وەك لە سەرەتاوە ئاماژەمان پێکرد، ئەوەی بووە بە باو لە رۆژنامەکاندا کە ناوی بێژەر دەخرێتە دواوە، جۆری قسەکردنەکە دەکا بە نائاساییی و دەبێ خۆتی لێ دوور بخەیتەوە.

زیادەڕەویش مەکە لە وەرگرتنی قسەدا، هەرچەندە ئەو قسانە بە شێوەیەکی راستەوخۆ نین یاخود زۆرجار لێکدەدرێنەوە. ئەمەش لەبەر ئەوەی تۆ دەتوانی بە شێوەیەکی کورتترو باشتر دایبڕێژیتەوە لە سەرچاوەی هەواڵەکە خۆی جوانتر، وەرگرتنی قسەی خەڵك بە وردی بە دەگمەن رێك دەکەوێ ئەوەندە گرنگ بێ، ناچار ببی وەك خۆی بیگێڕیتەوە. ئەگەر ماست فرۆشێك بۆ نموونە پێی گوتی: نرخی ماست هەر بەرز دەبێتەوەو تۆش هەر هەمان رستەو وشەت بەکارهێنا لە هەواڵەکەدا، ئەمە لە راستیدا دەبێ بە وەرگرتنێکی زۆر بێ ماناو بێ نرخ بە جۆرێك کە بە وەرگرتن ناونابرێ و ئەم جۆرە گواستنەوەیەی قسەی خەڵك هیچی لێ بەرهەم نایەت لە بێسەروبەری زیاتر لە هەواڵەکاندا. وەرگرتنی راستەوخۆ لە بوارێکی گەورەتردا دەبێ و رەنگە ئەگەر خۆت جارێکی تر دایبڕێژیتەوە وا روون و ئاشکرا نەبێ.

وەرگرتنێکی خراپ:

سەناتۆر لۆرنس ئۆبراین ئەمڕۆ لە واشنگتۆن گوتی: "ساڵ و نیوێك تێپەڕی و خەرج کرا بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵك رابکێشرێ بۆ گرنگیدان بە ستراتیژی باشوور بە بێ ئەوەی لە بەرژەوەندیی حکومەتدا بێ".

## وەرگرتنێکی روونتر

سەناتۆر لۆرنس ئۆبراین لە واشنگتۆن ئەمڕۆ گوتی: "کاربەدەستانی سەرۆك نیکسۆن ساڵو نیوێکیان بردەسەر بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵك راکێشن بۆ ستراتیژییەتی باشوور.. سەریش نەکەوتن".

ئەگەر رستەو وشەکانی سەرچاوەکە خۆی پڕ مانا بوونو رەوانبێژییەکی قووڵیان تێدابوو، یاخود دەبوونە هۆی ورووژاندنی مشتومڕ، لەو کاتەدا هەست دەکەیت بەوەی پێویستە لەسەرت بیانخەیتە نێوان دوو کەوانەوە، ئەوە بیکە، ئەوەشت لەبیر بێ کە گوێگر ناتوانێ ئەو دوو کەوانەیە ببینێ ئەگەر هەواڵەکە لە رادیۆدا خوێنرایەوە. بەڵام ئەگەر بێژەر کارامە بێ لە خوێندنەوەدا ئەوە خوێندنەوەی ئەو رستانەی وەرگیراون کێشەیەك دروست ناکەن بۆ ئەو. بۆ مسۆگەرکردنی دەسپاکیو لەو حاڵەتەدا کە بێژەرەکە وشەکان بخوێنێتەوە نەك رستەکان، ئەوە لەو کاتەدا پێویستە لەسەرت وشەکان کە وەرگیراون بە جیا دایانبنێی لە رێگەی شێوازی خۆتەوە لە نووسیندا.

ئەو بەرنامەیەی پەیڕەو دەکرا لە رۆژە سەرەتاییەکانی پەیدابوونی رادیۆدا "کەوانەیەك بکەرەوە، کەوانەکە داخە"، ئەوە ئێستا بەکار ناهێنرێن لە زۆربەی هۆڵەکانی هەواڵدا، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەوانەی بەو زاراوانە قسە دەکەن زۆر کەمن، چونکە ئێستا چەند شێوازێکی پەسەند هاتوونەتە کایەوەو لەبری ئەو جۆرە وشانە رستەی تر بەکار دەهێنرێن، وەك:

* ئەوەی سەناتۆر بە فێڵێکی گەورە ناوی بردبوو... .
* سەناتۆری ئەمریکی بەم شێوەیە باسی مەسەلەکەی کرد "میللەتێکە دابەش بووە بەسەر خۆیدا...".
* سەرۆك گوتیو ئەمەش دەقی قسەکانیەتی "ئەمە ناشیرینترین شتە کە لە درێژایی ژیانمدا بەرچاوم کەوتووە".
* پارێزگار گوتی "بە زۆرینەیەکی تەواو مەسەلەکە دەبەینەوە".

چەند شێوازێکی تر هەن رەنگە لەو کاتەدا هەواڵەکە دەنووسی بێن بە خەیاڵتدا، تۆ لەسەرتە ئەو شێوازە بەکار بێنی کە بە شێوەیەکی جوانتر دەگونجێ لەگەڵ هەر مەسەلەیەکدا بە جیا.



## کاتو وادەی کار

گوێگران چاوەڕێی ئەوە دەکەن لەو هەواڵانەی بۆیان دەخوێنرێتەوە کە هاوشان بن لەگەڵ رووداوەکاندا، تۆ بە بێ ئەوەی فێڵ لە خەڵك بکەی دەتوانی وا هەواڵەکان بخەیتە روو کە تازەن، ئەمەش بە بەکارهێنانی شێوازێکی تایبەت لە نووسینداو لە رێگەی بەدواداچوونی رووداوەکان، تەنانەت ئەگەر کەمێك کۆنتریش بن لەوەی کە تۆ چاوەڕوانی دەکەی.. وەك چۆن لە هەواڵەکانی بەیانیاندا کە زۆربەیان باسی ئەو رووداوانە دەکەن کە دوێنێ روویان داوە، بۆ نموونە: کاتێك کە رۆژنامەی بەیانیان دەڵێن:

* سەرۆك کارتەر دوێنێ دەستی کرد بە لێکۆڵینەوەیەك لەسەر... .

تۆ لێرەدا دەتوانی پەنا بەریتە بەر بەکارهێنانی کاری داهاتوو (الفعل المضارع) بۆ ئەوەی بەرگێکی نوێ بکەی بە بەر هەواڵەکەداو بۆ نموونە بڵێی "سەرۆك کارتەر لە مەسەلەی...... دەکۆڵێتەوە".

لە خۆت بپرسە ئێستا بارودۆخ چۆنەو کاتێکی زۆر گونجاوتر بەکار بێنە کە رەنگە جیابێ لە کاتو زەمانی رابوردوو کە رۆژنامەکان سوورن لەسەر بەکارهێنانی بە بەردەوامی. کە دێیتە سەر باسی راپۆرتی لیژنەکانو بودجەکانیان، کاتی داهاتوو بەکار بێنە، چونکە ئەم بەڵگەنامانە وەك بابەتی ئەدەبی وان لەوەدا کە مێژوویەکی تۆمار کراون، بەم شێوەیە تۆ دەتوانی بڵێیت وەك نموونەیەك:

راپۆرتی لیژنەکە باسی گوللە هاویشتنو تەقەکردن دەکاو (مەڵێ باسی کرد) بە کارێکی ناڕەوای دادەنێو دەڵێ ئەو تەقەکردنە، پەرچە کردارێکە زیادەڕەویی تیا کراوەو هیچ پاساوی نییەو راپۆرتەکە تاوانەکەی دەخاتە ئەستۆی پۆلیس (مەڵێ خستییە).

هەر بەو شێوەیە، بیروباوەڕو بیروبۆچوون بە گشتی لە شەوو رۆژێکدا ناگۆڕێن، لەبەر ئەوە تۆ وردترو تەواوتر دەبی ئەگەر بنووسی:

سەرۆکی شارەوانی باوەڕی وایە (نەك باوەڕی وابوو) کە کۆمپانیای مادیسۆن وا دەردەکەوێ (نەك وا دەرکەوت) لە باری ئابوورییەوە بەرەو سەرکەوتن دەچێ.

بەکارهێنانی کاتی داهاتوو یارمەتیت دەدا لەوەدا کە خۆت دەپارێزی لە دووبارەکردنەوەی چەند وشەیەکی وەك (دوێنێ)و (ئەمڕۆ) لە زۆرێك لەو بڕگانەدا کە لە هەواڵەکەدا هاتوون. لە

دەنگوباسەکانی پاشنیوەڕۆو ئێوارەدا رەنگە وشەی ئەمڕۆ گونجاو بێت، بەم شێوەیە پێویستت نابێ بە دووبارەکردنەوەی وشەگەلی دوێنێو ئەمڕۆ لە هەموو هەواڵێکدا.

ئەو کاتەی کە سەر لە خەڵك دەشێوێنێو هەڵیدەخەڵەتێنێ، ئەو کاتانەیە کە ئەگەری تێکەڵبوونی هەواڵی ئەمڕۆ هەیە لەگەڵ هەواڵی دوێنێدا، کە بریتییە لەو ماوەیەی دەکەوێتە کاتژمێرە سەرەتاییەکانی بەیانیو ئێوارە. لە کاتێکیشدا مەترسیی ئەوەت هەبوو کە گوێگر وا بزانێ هەواڵی دوێنێ، ئەمڕۆ رووی داوە، ئەوە دەبێ کاتەکە بە تەواوی دیاری بکەیت.

خۆیشت بپارێزە لەوەی هەواڵێك بگێڕیتەوە کە بیستو چوار کاتژمێر تێپەڕ بووبێ بە سەریدا، چونکە ئەوە پێی ناگوترێ هەواڵ. رەنگە کاتی گوێگر یا بینەران بەفیڕۆ بدەیت، کاتێك لەو هەواڵەدا کە کاتژمێر دەی بەیانی هەواڵێکیان بۆ بخوێنیتەوە کە چەند کاتژمێر پێش ئەوە لە رۆژنامەی بەیانیدا خوێندبێتیانەوە، ئەمەش بە زۆری ئەو کاتانە روو دەدا کە هەواڵنووسەکان خۆیان ماندوو ناکەن بە خوێندنەوەی رۆژنامەی بەیانیانەوە.

هەروەها دەبێ ئاگاشت لەوە بێ کە ئەو هەواڵانەی لە بروسکەکانی ئاژانسەکانەوە دێنو لە ریزی کاری داهاتوودا دانراون، هەواڵێکن کە ئەمڕۆ روویان داوە ئەگەر بە تەواوی دڵنیا نەبیت لەوە، وای دامەنێ کە ئەمڕۆ روویان داوە، یەکێك لەو لایەنە ساختەکارییانەی رۆژنامەنووسان کە گوێگرو بینەرانیان تووش دەکەن ئەو هەواڵانەن کە دوێنێ روویان داوەو ئەوان بڵاوی دەکەنەوە بۆ خەڵك وەك ئەوەی ئەمڕۆ روویان دابێ.

کاتێکیش وشەی (دوێنێ) بەکار دێنی دەتوانی دوای بخەی بۆ رستەی دواتر، بۆ نموونە:

سەرۆك کارتەر داوای لە ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان کرد هاوکار بن بۆ چەسپاندنی ئاشتی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، کارتەر لە بەردەم ئەو ئەندامانەدا دوێنێ گوتی کە...... .

لە کۆتاییدا بڵێ (دوێنێ)و (ئەمڕۆ)و (سبەی)، مەڵی (دووشەممە)و (سێشەممە)و (چوارشەممە).

## هەڵبژاردنی باشترین وشەکان

خۆت بە دوور بگرە لە وشەی قورسو ئاڵۆز، ئەگەر وشەی ئاسانت دەست کەوت، بۆچی بڵێیت (یەك ملیۆن دۆلار بەلای نزیکەوە)، لەبری (نزیکەی ملیۆن دۆلار) کە هەمان مانا دەگەیەنێ! بۆ ئەوەی وشەکانت سادەو ئاسان بن دەتوانی لەبری (دەستی داوەتە فلان کار) بڵێ (دەستی کرد بە فلان کار)و، لەبری ئەوەی بڵێی (خەریکی کڕینیەتی) بڵێ (دەیکڕێ)، ...... هتد.



مانای وشەکان تێکەڵ مەکە، دزیکردن جیایە لە گیرفانبڕین، دز بە هەڕەشەو زۆر پارەت لێدەسێنێ، بەڵام گیرفانبڕ پارەکەت لێدەستێنێ بە بێ ئەوەی ئاگات لێی بێ. بۆ نموونە نابێ بڵێی ئەو گیرفانبڕە پێنج هەزار دۆلاری لە یەکێ لە بانکەکان دزی، یاخود بڵێی، ئەو دزە گیرفانی ژنێکی بڕی پاش ئەوەی فرسەتی لێهێنا، دز دزەو گیرفانبڕ گیرفانبڕەو بەس. لە کاتێکدا مەسەلەکە پەیوەندیی بە بیروبۆچوونەوە هەبێو لای هەموو کەس مەسەلەکە ساغ نەبووبێتەوە، مەڵێ (ئاماژەی کرد بەوە)، یا (تێبینیی کرد)، یا (جەختی کردەوە لەسەر ئەوە).

بۆ نموونە:

بەرپرسەکە گوتی (نەك تێبینی ئەوەی کرد) ئەو خوێندکارانەی لە دەرەوەی پارێزگاوە هاتوون خراپترین ئاژاوەچین.

خۆت بپارێزە لە بەرکارهێنانی هەندێ رستەی سەرزارو ئەو جۆرە ناوانەی خەڵك بەردەوام بەکاریان دێنن، چونکە ئەو ناوانە وەك (هیپز)، (هەڵۆکان)و (کۆترەکان)، زیاد لە پێویست سادە کراونەتەوەو زۆرجار زیان دەگەیەنن لەبری ئەوەی خزمەت بکەن بە جۆرە کەسانێك کە لەو جیهانەدا دەژین، بەڵام هەندێ وشەی باو هەیە وەك (گرژی روو لەزیادبوون) یا (چەند هێرشێکی بەربڵاو) یا (بەڵگەی بێدەنگ)، ئەمانە زیانیان نییە، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانی پلەی نووسینەکەی خۆت بەرز بکەیتەوە ئەگەر سەربکەوی لەوەدا کە بەکاریان نەهێنی.

لە نووسینەکانتدا هێما دابنێ بۆ چۆنیەتیی وتنی هەندێ وشەی قورس کە بەلای بێژەرەکانەوە قورسو نامۆن، هەرچەندە بێژەرەکان ئێستا دەتوانن ناوی سایگۆن، هایفۆنگ، هانۆی، بە تەواوی بڵێن بەڵام رەنگە سەریان لێبشێوێ ئەگەر چەند ناوو وشەی تریان بەرچاو بکەوێ وەك Panta کە شارێکە لە هیندستانو دەبێ بخوێنرێتەوە پونتا نەك پانتا... هتد.

## ژمارەکان

ژمارەکان بە شێوەیەك بنووسە تا ئەوپەڕی رادە ئاسان بن بۆ بێژەرەکان بە وردی بیخوێننەوە، بێژەرەکان لە هەندێ رادیۆو تەلەفزیۆندا هەموو ژمارەکان بە پیتی ئەلفو بێ دەخوێننەوەو بەم جۆرە خۆیان دەپارێزن لەوەی بکەونە ئەو هەڵانەوە کە پەیدا دەبن لە نووسیندا بەهۆی ئامێری نووسین یا کۆمپیوتەرەوە، بەڵام نووسینی ژمارەیەکی گەورە وەك ٣٦٥ بە پیت

رەنگە سەر لە بێژەر بشێوێنێ لە کاتی خوێندنەوەدا، زۆرێك لە بێژەرەکان پێیان باشترە ژمارەکان بەکار بێنن نەك ئەوەی بە پیتی ئاسایی بیانخوێننەوە.

بۆچوون بەرامبەر ژمارە بەکارهێنان لە هۆڵێکەوە بۆ هۆڵێکی تر جیاوازەو رەنگە سەرلێشێواندنی بەدواوە بێت، ئێمە تەنیا رێنومایی ئەوە دەکەین کە تەنیا گۆڕانکارییەکی کەم بکرێ لە شێوازی رۆژنامەوانیی ئاساییدا.

ژمارە زۆرەکان نزیك بکەرەوە کاتێك کە ژمارەی ورد گرنگو پێویست نەبێ، بۆ نموونە دەتوانی ئەم ژمارەیە ٥٤,١٣٦ دۆلار، بەم شێوەیە بنووسی ٥٤,٠٠٠ دۆلار، ئەگەر هەستت کرد دەبێ باشتر ژمارەکە بۆ گوێگر روون بکەیتەوە بنووسە (نزیکەی) ٥٤٠٠٠ دۆلار.

ئەگەر ئەو ژمارەیەی دەینووسی دوو سفر یا زیاتری لە بەردەمدا بوو دەبێ سفرەکان دیاری بکەیت، (سەدان یا هەزاران تا دوایی). بۆ نموونە بنووسە پێنج هەزار، مەنووسە ٥٠٠٠، هەشت هەزار نەك ٨٠٠٠، ١٥ ملیۆن نەك ١٥٠٠٠٠٠٠، بۆ ئەوەی بێژەرەکە ناچار نەبێ سفرەکان بخوێنێتەوە پێش خوێندنەوەی ژمارەکە.

ئەو ژمارەیەی رۆژنامەکان بەم شێوەیە بڵاوی دەکەنەوە (١,٧ ملیۆن دۆلار) لە رادیۆدا دەخوێندرێتەوە (یەك ملیۆن دۆلارو لەدەدا حەوت) یا یەك ملیۆنو حەوت سەد هەزار دۆلار، هەروەها ژمارەی (١,٥ ملیۆن دۆلار) دەبێ بە ملیۆنو نیوێك لە رادیۆ یا تەلەفزیۆندا.

لە دواییدا مێژوو و بەرواری رووداوەکان بەو جۆرە بنووسە کە دەتەوێ بخوێنرێتەوە، دەبێ بنووسی بیستو هەشتی فەبرایەر، نەك ٢٨ی فەبرایەر، حەوتی ئەیار نەك ٧ی ئەیار تا کۆتایی. ساڵەکان بە پیت مەنووسەو ئەوە بەسە بە ژمارە بیاننووسی وەك ١٩٧٢، نەك بنووسی هەزارو نۆسەدو حەفتاو دوو.

## لایەنی هونەری لە نووسیندا

ژمارەی ئاسایی دابنێ لە زۆربەی حاڵەتەکاندا، ئاگاشت لە دانانی هێڵێك بێت لە نێوان دوو شتی دژبەیەکدا. لە کۆتایی دێڕەکاندا بەشێکی وشە مەنووسەو ئەو بەشەی تری لە سەرەتای دێڕەکەی تردا بنووسیت، چونکە ئەوە رەنگە ببێتە هۆی راوەستانی بێژەر لە کاتی خوێندنەوەی وشەکەدا، بڕگەکان بە شێوەیەکی جوان رێك بخە، ئەگەر هەواڵێکت لە بەردەستدا بوو لەسەر



شەڕی ڤێتنام، سێ لایەنی شەڕەکەی لەخۆ گرتبوو، ئەوە چاکتر وایە سێ بڕگەی جیاواز بەکاربێنی.

هەر هەواڵێك لەسەر لاپەڕەیەکی جیاواز بنووسە، مەگەر لە حاڵەتێکدا کە دوو هەواڵت لە بەردەستدا بێ و، دڵنیا بیت لەوەی هەردووکیان یەك لە دوای یەك دەخوێنرێنەوە. ئەم شێوازە کارئاسانییە بۆ نووسەرو رێگەی دەداتێ گۆڕانکاری بکا لە هەواڵەکەداو چی تازە رووی داوە لەو بارەیەوە بیخاتە سەری.

هیچ کاتێك هەواڵنامەیەکی شێوێنراو یا پوخت نەکراو مەدەرە دەست بێژەرێکەوە بۆ خوێندنەوە. دەبێ زۆر بە وردی هەڵەبڕی بکرێت، چاکتر وایە ئەو دێڕەی دەسکاری کراوە هەر لە شوێنی خۆیدا جارێکی تر بە ئامێری نووسین بینووسیتەوە. نووسین بە دەستو بە خێرایی شێوازێکی ناپەسەندەو جوان نییە، چونکە ئەو کرێکارەی چاپخانەکە، کە پیتەکان کۆ دەکاتەوە چەند چرکەیەك رەنگە رابوەستێ بۆ خوێندنەوە، بەڵام بێژەر ئەو کاتەی نییەو ناکرێ رابوەستێ. ئەگەر لە وشەیەکدا هەڵەت کرد جارێکی تر هەوڵ بدە راستی بکەیتەوە. کە لێدەبیتەوە، ئەو وشانە رەش بکەرەوە بە قەڵەم، ئەگەر لاپەڕەیەکت لە بەردەستدا بوو دەسکاریی زۆر کرابوو و کاتیشت هەبوو جارێکی تر بە ئامێری نووسین بینووسەرەوە.

## راپۆرتو دەنگە تۆمارکراوەکان

دەبێ راپۆرتی دەنگیی پەیامنێرانو ئەو شریتانەی تۆمار کراون بە باشی گوێیان لێ بگیرێ، کە گوێگر گوێ رادەگرێ لە دەنگی ئەوانەی خاوەنی هەواڵەکەن (وەك سەرۆکی وڵاتو هیتر) رەنگە شتی زیاتریان تێدابێ لەوەی بێژەری هەواڵەکان دەیخوێنێتەوە، بە تایبەتی پێویستە خۆت بپارێزی لەوەی دوایین وشەی بێژەرەکە یەکەم وشەی شریتە تۆمار کراوەکە بێ. نموونە:

**پێشکەشکردنێکی خراپ:**

میستەر ویفیر، سەرۆکی زانکۆ رایگەیاند، ئەو یاسایەی پێشنیار کراوە بۆ زانکۆ، رەنگە زیان بگەیەنێ بە زانکۆی ویسکونسن.

ئەوەی کە سەرۆکی زانکۆ لە شریتەکەدا تۆماری کردووە:

ئەو یاسایەی پێشنیار کراوە، رەنگە زیان بگەیەنێ بە زانکۆی ویسکونسن.

**پێشکەشکردنێکی باشتر:**

میستەر ویفیر سەرۆکی زانکۆ دەربارەی پرۆژەی پێشنیارکراوی یاسای زانکۆ گوتی: ....... .

ئەوەی راپۆرتەکان دەبەستێ بەیەکەوە دەبێ کورتو گشتی بێ.

نموونە: کێشەیەکی نوێ لە ئەردەندا. هەواڵەکە لە بۆب ریچاردەوە هاتووە لە عەمان.

خۆت دوور بگرە لە چڕکردنەوەو درێژەپێدان لە قسەکردنی نێوان بێژەری هەواڵو پەیامنێرەکەدا، چونکە کاتەکە لەوە بەنرخترە، بێژەر بەفیڕۆی بدا لە گێڕانەوەی هەواڵێکدا، پاشان مایکرۆفۆنەکە واز لێبێنێ بۆ پەیامنێرێك، هەمان هەواڵ بگێڕێتەوە بە جۆرە وشەیەکی تر. ئەم حاڵەتە هەندێ جار روو دەدا، چونکە نووسەری هەواڵ یا سەرنووسەر بە تەواوی گوێیان لە شریتە تۆمارکراوەکە نەگرتووە پێش ئەوەی تێکەڵ بە هەواڵەکان بکرێ.

پاش ئەوەی شریتە تۆمارکراوەکە بڵاو کرایەوە، هەوڵی ئەوە بدە لە شوێنێکدا جارێکی تر ناوی دروستکەری هەواڵەکە دووبارە بکەیتەوە، چونکە سوودی هەیە بۆ ئەوانەی لە سەرەتاوە گوێیان لە هەواڵەکە نەبووە، یاخود ناوەکەیان هەر نەبیستووەو پێویستیان هەیە بەوەی بیناسن. باشتریش ئەوەیە قسەیەکی تری هەمان کەس باس بکەیت وەك ئەوەی بڵێیت بۆ نموونە:

سەرۆك ویفیر بڕیاری داوە لە هەفتەی داهاتوودا ئەم مەسەلەیە بخاتە بەرباسو لێکۆڵینەوە.

ئەم جۆرە ناساندنەی خاوەنی هەواڵەکە شتێکی پێویست نییە ئەگەر ئەو خۆی زۆر ناسراو بێت، وەك دەنگی سەرۆکی وڵات یا یەکێك لە هەرە بەناوبانگەکان، یا خۆت لەبەر ئەوەی قسەی تۆمارکراو زۆر کورت بێ، وەك پانزە چرکە یا کەمتر. دیارە مەسەلەکە پێویستی بە لەسەر رۆیشتن نییە کاتێك پەیامنێرەکە لە کۆتایی راپۆرتەکەدا ناوەکەی دێنێ.

دەکرێ کاتی داهاتوو بەکاربێنی، کاتێ راپۆرتە دەنگیی یەکێك لە پەیامنێرەکان پێشکەش دەکەیت، وەك ئەوەی بڵێیت بۆ نموونە (فیل جۆنز لە واشنگتۆنەوە قسەتان بۆ دەکات)، بەلام پێویستە کاتی رابوردوو بەکاربێنی کە دەتەوێ دەنگی خاوەن هەواڵەکە پێشکەش بکەیت. بۆ نموونە دەڵێیت (سەناتۆر بیرسی باسی هۆی دژایەتیکردنی خۆی کرد بۆ.......)، نابێ بڵێیت (سەناتۆر بیرسی باسی دژایەتیکردنی خۆی دەکا بۆ.......)، چونکە گوێگرەکان، بە هەڵە وا



دێ بە خیاڵیاندا کە سەناتۆر بیرسی راستەوخۆ ئێستا قسە دەکات، کەچی وا نییە چونکە دەنگەکە شریتی تۆمارکراوە.

کاتێك راپۆرتە دەنگی پەیامنێر تۆمارکراوبوو (کە شتێکی ئاساییە) مەنووسە (ئێستا دەگوێزینەوە بۆ لای.......)، یا (ئێستا روو دەکەینە لای.......)، چونکە بە هەڵە وا لە گوێگر دەکا وا بزانێ پەیامنێرەکە راستەوخۆ راپۆرتەکە دەخوێنێتەوە.

شتێکی شەرم ئاوەرە (لە باری پیشەییەوە هەرچەندە لە باری هونەرییەوە کارێکی تەواوە)، ئاماژە بکەی بەوەی ئەو بابەتەی بڵاوی دەکەیتەوە تایبەتە بە خۆتەوەو لە واقیعیشدا وا نەبێ. بۆ نموونە بێژەری دەزگایەکی راگەیاندن کە هاوبەشە لەو هەواڵانەی ئاژانسی (یۆنایتدبرس ئەنتەر ناسیۆنال) بڵاوی دەکاتەوە، لە باری هونەرییەوە مافی خۆیەتی، کاتێك راپۆرتێك بڵاو دەکاتەوە کە لەو ئاژانسەوە گەیشتووە بە دەستی بڵێ: (بای شامبرلین) پەیامنێری یۆنایتدبرس ئەم راپۆرتەی بۆ ناردووین، لێرەدا راست دەکا کە شامبرلین ئەو راپۆرتەی ناردووە بۆ رادیۆکەی ئەو، بەلام لە هەمان کاتدا هەر ئەو راپۆرتەی ناردووە بۆ سێ سەد رادیۆی تر.

لەمەش خراپتر ئەوەیە، وا بخرێتە روو، ئەو راپۆرتی تەلەفزیۆنو رادیۆیە کە یەکێك لە ئاژانسەکان بۆی دەنێرێ کە گوایا بە هەوڵی دەزگاکەی خۆی بەدەستی هێناوە. لە بێژەری یەکێك لە دەزگاکانی راگەیاندنی شاری (ویسکونسن)م بیستووە دەڵێ: پارێزگار بە رادیۆکەمانی راگەیاند کە....... . ئەم جۆرە دەزگایانەی راگەیاندن کە ئەم چۆرە فرتوفێڵە بەکاردێنن لەگەڵ گوێگرەکانیاندا، راستگۆیی خۆیان کەم دەکەنەوە لای ئەو گوێگرە زۆرانەی کە توانای ئەوەیان هەیە بە وردی بگەڕێن بە دوای راستییەکەدا، هەروەها کێشە بۆ خۆی دروست دەکا لەگەڵ (لیژنەی پەیوەندییەکانی فیدراڵ) ئەگەر دەزگای رادیۆ یا تەلەفزیۆنەکە لە ئەمریکادا بێ.

دەبێ ئەو راپۆرتە تۆمارکراوانەی بڵاو دەکرێنەوە ئاشکراو روون بنو خەڵك لێیان تێبگا ئەگەر بیەوێ ئەرکی پەیوەندییەکە بە راستی بگەیەنێ بە خەڵك نەك فڕوفێڵیان لێبکا.

ئەگەر یەکێك لەو راپۆرتانەی لە وڵاتانی دوورەوە دێن دەنگەکەی راستو ساف نەبوو بە جۆرێك بە زەحمەت دەتتوانی گوێی لێڕاگریو لەگەڵیدا بڕۆی، یاخود ئەو وشانەی لە دەمی خاوەن راپۆرتەوە دەهاتەدەر، ئاشکرا نەبوون وەك یەکێك دەمی پڕ کردبێ لە قوڕ، لە خۆت

بپرسە بڵاوکردنەوەی ئەو شریتە تۆمارکراوە شتێکی پێویستە؟ چونکە تۆ هیچ خزمەتێك بە گوێگرانی خۆت ناگەیەنیت ئەگەر شتێکیان بۆ بڵاو بکەیتەوە کە هیچی لێ تێنەگەن، ئەمە پێی ناگوترێ پەیوەندی. ئەوەشت لەبیر بێ کاتێك تۆ بڕیار دەدەیت کە ئەم شریتە تۆمارکراوە لە باری هونەرییەوە تەواوە، دەبێ ئەوە بزانیت کە گوێگر وەك تۆ لە شوێنێکی بێدەنگو ئارامدا گوێ لەو شریتە ناگرێ بەڵکو دەشێ لە شەقامێکدا گوێی لێبگرێ.

ئەگەر ئەندازیارێکی ئەو بوارە سەرپەرشتیی ئیشپێکردنی ئامێری تۆمارکردنەکە بوو، دەبێ دانەیەك لەوەی دەتەوێ تۆماری بکا بخەیتە بەردەستو ئەو شتانەی کە دەتەوێ بە روونی تۆمار بکرێ بۆی دیاری بکەیت، کە بریتییە لەو پێشەکییەی بێژەر دەیخوێنێتەوەو کاتی تۆمارکردنەکەو ئەو قسانەی کە لە کۆتایی شریتەکەدا دەگوترێ. دڵنیابە لەوەیش کە بێژەر دەبێ کاتی بڵاوکردنەوەی شریتەکە بزانێ لە هەواڵەکەدا.

## تۆ دەبێ پەیامنێری رۆژنامەش بیت

لە زۆربەی هۆڵەکانی دەستەی نووسەراندا، ئەوەی کە هەواڵ دەنووسێ، هەواڵنێری رۆژنامەشە. زۆربەی هەواڵەکان دەتوانرێ کۆ بکرێنەوە لە رێگەی تەلەفونەوە، بۆ نموونە ئەگەر (یانەی ئوتومبێلەکان لە شاری ویسکونسن)دا شەوی رابوردوو، هەڵمەتێکیان دەست پێکردبوو دژی (ترێلە) گەورەکان، ئەوا پەیوەندیکردن بە تەلەفون لەگەڵ گەورەپیاوانی بواری دروستکردنی لۆریو ترێلەکان، هەلی ئەوەت بۆ دەرەخسێنێ یەك پێشەکیی نوێو جوان بنووسی بۆ هەواڵەکانی نیوەڕۆ. یاخود ئەگەر خەریکی نووسینی بابەتێك بووی لەسەر ئەوەی کە کۆمەڵە دزێك چوونەتە سەر بانقێكو پۆلیس بە دوای یەکێك لەو دزانەدا دەگەڕێ، یا یەکێك لەوانە هێشتا باری تەندروستیی ناتەواوە، ئەوە دەتوانی پەیوەندی بکەی بە سەرچاوەی پۆلیس یا خەستەخانەوە، پێش ئەوەی هەواڵەکە بڵاو بکەیتەوە بە کاتێکی کەم، بۆ ئەوەی دڵنیا بیت لەوەی کۆتایی رووداوەکە بە چی گەیشتووە.

کاتێك خەریکی ئامادەکردنی ئەو هەواڵانەی ئاژانسەکانی دەنگوباس ناردوویانە، ئاگات لەو گۆشەو ستوونانە بێت کە تایبەتییەکی گرنگیان هەیە بەلای گوێگرەکانتەوە. لیستی ئەو شایەتانەی بانگ دەکرێن بۆ بەردەم یەکێك لە لیژنەکانی کۆنگرێس، رەنگە کەسێکی تێدابێ لە



دانیشتوانی ئەو ویلایەتەی تۆی تێدا دەژیت. لە کاتی جیاکردنەوەی دەنگە لایەنگرو دژەکاندا لەسەر یاسایەکی تایبەت، هەوڵی ئەوە بدە بزانی هەڵوێستی نوێنەرانی ویلایەتەکەت چۆن بووە لەو دەنگدانەدا.

لەگەڵ ئەوەشدا کە نابێ شەش پرسیارە بەناوبانگەکە (چی، کەی، کێ، بۆچی، لەکوێ، چۆن) کۆ بکرێنەوە لە سەرەتای هەواڵەکەدا، بەڵام هەر سوودمەندو بەکەڵکنو، پێش ئەوەی کۆتایی بێنیت بە هەر چیرۆکە هەواڵێك لە خۆت بپرسە، ئایا وەڵامی ئەو شەش پرسیارەت داوەتەوە کە پەیوەندییان هەیە بە هەواڵەکەوە یا نا؟

ئەگەر یەکێك لەو پرسیارانەی راپۆرتی ئاژانسەکان بێ وەڵام مانەوەو لە هۆڵی نووسەراندا بۆت نەکرا وەڵامێکت دەست بکەوێت، ئەوە دەتوانیت بە تەلەفون پەیوەندی بکەی بە هەندێ سەرچاوەی ترەوەو وەڵامێکی لێوەربگری. ئەم جۆرە دەستپێشخەرییانەن کە دەبنە هۆی جیاکردنەوەی رۆژنامەنووسێکی بواری رادیۆو تەلەفزیۆنو ئەو نووسەرانەی وەك ئامێر کارەکانیان جێبەجێ دەکەن.

## بەرپرسیاریەتی

وردیو ئاگا لەخۆبوون شتێکی زۆر گرنگە لە هەواڵەکانی رادیۆو تەلەفزیۆنداو، نابێ پشت ببەستی بەوەوە کە ئەگەر هەڵەی تێدابوو، دواتر راست دەکرێتەوە، چونکە سەبارەت بە رادیۆ، ئەو راستکردنەوەیە رەنگە کەسانێکی کەم گوێیان لەو هەواڵە بووبێ کە هەڵەی تێدا کراوەو ئێستا راست دەکرێتەوە. هەوڵ بدە دڵنیا بیت لە هەر شتێك جێگەی گومان بێت. سەبارەت بە رۆژنامەنووسانی بواری رادیۆو تەلەفزیۆن، بەدەستهێنانی هەواڵی راست گرنگترە لەوەی یەکەم کەس بیت هەواڵەکەی دەست کەوتبێت.

جەخت مەکە لەسەر هۆو ئەنجامی هیچ رووداوێك تا بە تەواوی دڵنیا نەبیت لە راستییەکەی (ئەمەش شتێکە بە دەگمەن روو دەدا). من خۆم گوێم لە هەواڵێك بوو لە یەکێك لە رادیۆکانەوە لە یەکێك لە بڕگەکانیدا دەڵێ: شێوازی بەڕێوەبردنی هەڵمەتی هەڵبژاردنی تایبەت بە سەرۆك نیکسۆنو جێگرەکەی ئەجینۆ، بووە هۆی ئەوەی، وەك دەردەکەوێ، کە رێگە خۆش بکا بۆ ئەوەی کۆمارییەکان چەند کورسییەکی گرنگ بەدەست بێنن لە ئەنجومەنی پیراندا.

رەنگە هەواڵەکە راست بێت، رەنگە واش نەبێت. چونکە ئەوەی تۆ دەتوانی بیسەلمێنیو بەڵگەی لەسەر بێنیتەوە ئەوەیە کە کۆمارییەکان ئەو چەند کورسییەیان بەدەست هێنا، لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵەی نیکسۆنو ئەجینۆدا. ئەو مەسەلانەی کە ناکۆکی هەیە لەسەریان، دوو لایەن یا زیاتریان هەیە. باسکردنی ئەم جۆرە مەسەلانەو بڵاوکردنەوەی خاڵە گرنگەکان، وەك رۆژنامەنووسێك بەرپرسیاریەتییەکی پیشەییەو پابەندبوونێکی یاساییە خراوەتە ئەستۆی تۆ بەگوێرەی (بنەمای ویژدان). لەبەر ئەوەش کە ئەو کاتەی دیاریکراوە بۆ هەواڵەکان کاتێکی کەمە، ئاسان نییە بتوانی بیروبۆچوونی هەردوولا باس بکەیت، بە پێچەوانەی ئەوەی کە لە رۆژنامەکاندا روو دەدا، بەڵام ئەگەر بۆت کراو کاتێکت چنگ کەوت، باسی تۆمەتێکت کرد دژی کەسێك یا دەزگایەك، ئەوە هەوڵی ئەوە بدە کاتێك پەیدا بکەیت بۆ بڵاوکردنەوەی قسەی بەرامبەرەکەی، چونکە ئەمەیە بنەمای دادو ویژدان.

تێبینییەك دەربارەی نووسینی سەرنجڕاکێش کە بە دوای وروژاندنی خەڵکدا دەگەڕێ: هەندێ دەزگای راگەیاندن هەوڵ دەدەن بۆ وروژاندنی خەڵك زیاتر لەو رادەیەی رێگەی پێدراوە، ئەمەش لە رێگەی ئەوەوە هەواڵەکە پێشکەش دەکات بە شێوەیەك زۆر زیادەڕەویی تێدایە. لەو هەوڵەدا کە دەیدا بۆ ئەوەی هەواڵەکە زیاتر خەڵك بوروژێنێ، هەندێجار هەواڵەکە دەشێوێنێو ئەو کەسانەی ناویان دەبات تووشی لە روودامان دەکات. کاتێك گومانت هەبوو لە وردیی هەواڵێکدا، یا بە ویژدانەوە نەنووسرابوو، یا نەدەچوو بە عەقڵی مرۆڤدا، سەبارەت بە شتێکی خەیاڵی کە هاتووە بە مێشکتدا، ئەوە یەکسەر لایبەرەو بە شێوەیەك بنووسە خەڵك پاڵ پێوەبنێی بۆ خوێندنەوەی، کاتێکیش کە رووداوێکی سووك دەنووسی بە جۆرێك بینووسە خوێنەر زیاتر حەز لە خوێندنەوەی بکات. سەبارەت بە زۆربەی هەواڵەکان دەبێ راستەوخۆ بیاننووسی، چونکە ئەرکی یەکەمو سەرەکیی تۆ (راگەیاندنە)، نەك بۆ (کات بردنەسەرو خۆشی).

## کۆکردنەوەی هەواڵەکان

کە دەتەوێ چیرۆکە هەواڵێکی سەرەکی هەڵبژێری، ئەم سێ خاڵەی خوارەوەت لەبەر چاو بێ: گرنگیی هەواڵەکە، هاندانی خەڵك بۆ خوێندنەوەی، تازەیی. تازەیی هەواڵ زۆربەی کات لە پلەی یەکەمدایە سەبارەت بەو هەواڵانەی هەموو سەری سەعاتەکان دەخوێندرێنەوە، زیاتر لەو



هەواڵانەی دەخوێندرێنەوە لە بەرنامەی بەدواداچوونی هەواڵەکاندا کە بە درێژی باسیان دەکرێ. کاتێك تۆ لەسەرتە هەموو کۆتایی سەعاتێك شریتێکی هەواڵ پێشکەش بکەیت ئەگەر بێیت چیرۆکە هەواڵێکی سەرەکیی نوێ بخوێنیتەوە، ئەوە یارمەتیت دەدا لەوەدا کە گوێگرەکان هەست بەوە نەکەن کە گوێ رادەگرن لە هەمان راپۆرتە هەواڵ کە سەعات پاش سەعات دەیبیستن.

گرنگی بابەت پلەی یەکەمی هەیە لەو بەرنامانەی بەدواداچووندا کە درێژنو زۆرتر هەموو لایەنێکی هەواڵەکە شی دەکەنەوە. دوایین دەنگوباس لە ئێستگە ناوچەییەکانداو ئەو هەواڵانەی تەلەفزیۆنەکان بڵاوی دەکەنەوە لە ئێواراندا، لە پێشیانەوە هەواڵە سەرەکییەکانی ئەو رۆژەی تێیدا دادەنرێ تەنانەت ئەگەر لە بەیانیشدا رووی دابێ، ئەگەر ئەو دەزگایەی تۆ کاری تێدا دەکەیت، هەواڵێکی تایبەت بە خۆی هەبوو، یا ئەگەر شریتێکی تۆمارکراوی تایبەتی هەبوو، یا بە فیلمێك رووداوەکە گیرابوو، ئەوا ئەو هەواڵە پلەی یەکەمی دەدرێتێ لە بڵاوکردنەوەدا.

تۆ وەك نووسەرێك لە دەزگاکەدا، دەتوانی یارمەتیی گوێگر بدەی لە رێگەی رێکخستنی هەواڵەکانەوە، بۆ ئەوەی دەنگوباسەکە بە ئاسانیو بە بەردەوامی گوێی لێ رابگیرێ، واش باشترە کە هەواڵەکان دابەش بکرێن بەسەر چەند کۆمەڵەیەکدا، ئەو دابەشکردنەش دەکرێ باری جوگرافی لە بەرچاو بگیرێ تیایدا وەك هەواڵی جیهانی، نەتەوەیی، ناوچەیی، یاخود لە رێگەی دابەشکردنیاندا بەسەر چەند بابەتێکی تردا وەك، هەواڵی جەنگ، کۆنگرێس، کارکردن... هتد یا لە رێگەی تێکەڵییەکەوە لە هەردووکیان.

هەروەها پێویستە بەهای هەواڵەکان لە بەرچاو بگریو برگەکانی هەواڵەکە رێك بخەی. چونکە رێی تێدەچێ گرنگترین هەواڵێك کە بڵاوی دەکەیتەوە لە رۆژەکەدا هەواڵێکی ناوچەیی بێتو لەگەڵیدا هەندێ هەواڵی گرنگی جیهانیو نەتەوەیی جگە لە چەند هەواڵێکی ئاسایی ناوچەیی. دەتوانی شریتی هەواڵەکانت رێك بخەیت بە شێوەیەکی گونجاو لەسەر هەمان رێگەی سەرەوە.

هەندێجار پێویستیت دەبێ بە گۆڕانکاری لە بەرودواخستنی هەواڵەکاندا سەبارەت بە ژمارەیەکی زۆر لە هەواڵە گرنگەکان، هەرچەندە ئەو بەرودواخستنە خوێنەرو گوێگر وەڕس دەکا، بۆ نموونە: باسی کۆنگرێس، بودجەی وڵات، بودجەی وەزارەتی بەرگری، یاسادانان بۆ

نیشتەجێبوون، خۆپیشاندانەکانی دژ بە جەنگ لە هەموو گۆشەیەکی ولاّتدا، جارێکی تر گەڕانەوە بۆ باسی کۆنگرێس‌و پارێزگاریکردن لە خەڵك‌و....... هیتر.

ئەو وشانەی بەکاردەهێنرێن بۆ پەیوەستبوونی هەواڵێك بە هەواڵێکی ترەوە، یا لە هەواڵێکەوە بگوێزرێتەوە بۆ هەواڵێکی تر، دەکرێ سوودیان هەبێ، ئەگەر چەند هەواڵێکت لە بەردەستدا بوو لەسەر شیکاگۆ یا برمنگهام رەنگە لە هەواڵێکەوە بچیت بۆ هەواڵێکی تر، بۆ نموونە بڵێی "لە برمنگهام"، بەلاّم زۆر زیادەڕەوی مەکە لە بەکارهێنانی شوێنی سەرچاوەی هەواڵەکە وەك پێشەکییەك‌و پابەند بە سادەییەوە لەو وشانەدا بەکاریان دێنی بۆ پەیوەستکردنی هەواڵێك بە هەواڵێکەوە. هەندێ وشە هەن بەکاردەهێنرێن لەو بوارەدا ئەوەندە دەسکردن باشتر وایە خۆت بپارێزی لە بەکارهێنانیان، نموونەی ئەو جۆرە وشانە وەك: "ئەگەر لا بکەینەوە بەلای..." یاخود "لەمیانەی ئەوەوە".

(ئیدوین نیومان) کە لە (N.B.C) کار دەکات دەڵێ: گەڕامەوە سەر ئەو شریتی هەوالاّنەی کە لە ڕۆژانی سەرەتایی کارکردنمدا وەك پەیامنێرێکی رادیۆ ئامادەم کردبوون، بۆم دەرکەوت وشەی (لەو ماوەیەدا) کە بەکارم هێناوە بە زۆری لە زۆر کاتدا هیچ پێویستییەك نەبووە بۆ بەکارهێنانی.

ئەو ڕووداوو هەوالاّنەی کۆتاییان هاتووە (واتە ئەوانەی کە تۆ چاوەڕوانی هیچ گۆڕانێك ناکەیت بێت بەسەریاندا)، دەبێ لە پێشەوە بیاننووسیت بۆ ئەوەی پێش بلاّوکردنەوەی هەواڵەکان کاتی ئەوەت بەدەستەوە بێت خەریکی ئەو هەوالاّنە بیت کە گۆڕانیان دێت بەسەردا. ئەگەر بە پێچەوانەوە کارت کرد، ئەوە توانات لەسەر نووسین‌و پێداچوونەوە، کە پێویستە لەسەرت بیکەیت، کەم دەبێتەوە.

## چوارچێوەی عەقڵی – بەکارهێنانی عەقڵ

ئەو پێشنیارە زۆرانەی تر کە دەکرێ بیانخەینە ناو ئەم رابەرەوە کە تایبەتە بە نووسینی هەواڵ بۆ رادیۆ‌و تەلەفزیۆن، دەبێ هەر روویان بکرێتە ئەو دوو ئامانجەی باسمان کردن لە سەرەتای ئەم بەشەدا، کە یەکەمیان ئەوەبوو هەواڵ وا بنووسرێ کە بیژەر بە ئاسانی بیخوێنێتەوە، دووهەمیشیان ئەوەبوو گوێگر بە ئاسانی لێی تێبگا. ئەگەر تۆ گرنگیت دا بە



چەند خاڵێکی دیاریکراو کە یارمەتیت بدەن بۆ گەیشتن بەو ئامانجانە، ئەوە مانای وایە تۆ سوودبەخش‌و بەکەڵکی بە تایبەت بۆ ئەوانەی لە سەرەتای فێربووندان، بەلاّم تۆ دەتوانی ببی بە هەواڵنووسێکی رادیۆ‌و تەلەفزیۆنی سەرکەوتوو، ئەگەر بتوانی ئەم خالاّنە هەموویان کۆ بکەیتەوەو بیانکەیت بە یەك لە (چوارچێوەیەکی عەقڵیدا) کە پەیڕەوو پرۆگرامت دیاری بکا لە نووسیندا، ئەوەش بریتییە لە تێگەیشتنێکی بەردەوام لە، ئەوەی کە تۆ دەینووسی کردەیەکی دەماودەمە بۆ گواستنەوەی هەواڵەکان، واتە تۆ بابەتێك دەنووسیتەوە کە (گۆیاو قسەکەر) بێت.

تۆ بڵێی چ بیروبۆچوون‌و بیرۆکەیەك بە عەقڵتدا تێدەپەڕێت لەو کاتەدا کە دەتەوێ چیرۆکە هەواڵێك بنووسی بخرێتە ناو دەنگوباسەکانەوە. رەنگە بەم شێوەیەی خوارەوە بیر بکەیتەوە: تۆ چەند ڕووداوێکت لە بەردەستدایە بەشی دوو لاپەڕە، هەندێ تێبینی‌و بروسکەی ئاژانسەکانی دەنگوباست بۆ هاتووە درێژییەکەیان حەفتاو پێنج سانتیمەترە، بەلاّم ئەو کاتەی تەرخان کراوە بۆ هەواڵەکان، بواری زیاتر لە دە دێرت ناداتێ.

تۆ لەم حاڵەتەدا دەبێ بڕیار بدەی، یەکەم، هەواڵ چییە؟. ئەوەی کە بە ڕاستی گرنگ بێت چییە؟. ئەم دە دێڕەی لە بەردەستتدان چۆن بەکاریان دێنی‌و دەشزانی کە لەوە زیاترت بۆ ناکرێ کە گەوهەرو کرۆکی هەواڵەکان بنووسیت، پاشان لەسەرتە لە خۆت بپرسیت ئەم هەواڵە باسی چی دەکا؟، چی ڕووی داوە گوێگر بە گرنگی دابنێ؟، چییە گرنگترین ئەو زانیارییانەی دەبێ بگەیەنرێن بە گوێگر؟. ئیتر ئەو ناوە زۆرانەو ئەو وردەکاری یا باسکردنانەو ئەو ژمارانە لێرەدا کاتی باسکردنیان نییەو، کەمێکی زۆر کەم نەبێ لە گوێگرەکان کەس گوێیان ناداتێ‌و، مانەوەیان تەنیا بێسەروبەری دروست دەکەن لەو هەواڵەدا کە تۆ دەینووسی‌و لە پلەی ڕاستیی هەواڵەکە کەم دەکەنەوە.

پاش ئەوەی بڕیارت دا هەواڵ چییە، تۆ بە سادەیی دەیگەیەنی بە گوێگر. هەروەها دەینووسیتەوە بە هەمان وشەو شێواز کە بەکاری دێنی لەگەڵ کەسێکدا کە نامۆ بێ‌و گرنگیی تەواو نەدا بە خاڵەکان‌و تۆ تەنیا چل خولەك لە بەردەستتدایە بۆ ئەوەی پەیامەکەی خۆتی پێبگەیەنی. هەروەها پێویستە ڕستەی پێشەوەی هەواڵەکە سەرنجی گوێگر رابکێشێ‌و لە ناوەڕۆکی هەواڵەکە تێبگاو پاشان وردەکارییەکان دێن کە هەواڵەکە پێکدەهێنێ، بەو مەرجەی بە شێوەیەکی لۆژیکییانەو بە ئاسانی لە درێژەپێدانێك بچیتە سەر بابەتێکی تر، وەك چۆن لە

گفتوگۆدا پەیڕەوی دەکرێ، ئێستا ئەو هەواڵەی تۆ نووسیوتە بووە بە هەواڵێك خـەڵك حـەز لـە خوێندنەوەی دەکاو شتی لێوە فێر دەبنو بە ئاسانی بەدوایدا دەچن. کەواتـە تـۆ باسـی هـەواڵ دەکەیت بە بەکارهێنانی ئەو ئامێری نووسینەی بەکاری دێنی.

# بەشی چواردەهەم

# کۆکردنەوەی شریتی هەواڵ

**نووسینی: فیرنون أ. ستون**

(پۆل وایت)ی کۆچکردوو کە یەکێك بوو لە پێشەنگە کۆنە گەورەکانی بواری هەواڵ بۆ رادیۆ، خووی گرتبوو بەوەوە کە بڵێ بە خوێندکارانی رۆژنامە، کۆکردنەوەی شریتی هەواڵ، شێوەی (ردسکول هاوس) لەخۆ دەگرێ کە بریتییە لە: خوێندنەوە، نووسین، ژمارە.

لە خوارەوە روونی دەکەینەوە کە چۆن ئەو شێوەیە جێبەجێ دەکرێ بەسەر سێ هەنگاوە سەرەکییەکەدا بۆ ئامادەکردنی شریتی هەواڵ بە جۆرێکی وا بەردەوام مانا ببەخشێتو درێژەی رووداو بە ئاسانی بگەیەنێت بە گوێگر.

١) خوێندنەوە: هەموو بابەتەکانی هەواڵەکە بخوێنەرەوە، ناوخۆیی بێت یا هی دەرەوە. بابەتە جیاوازەکان هەریەك لە دۆسیەو شوێنی خۆیدا دابنێ بەگوێرەی ئەو ریزبەندییەی خۆت بەلاتەوە باشە. رەنگە هەندێ پۆلبەندی بەکار بێنیت وەك هەواڵی: ناوخۆیی، ناوچەیی، نەتەوەیی، دەرەوە، واشنگتۆن، ئاگرکەوتنەوە... تا دوایی‌و پێویستی بەوە ناکات زیادەڕەویش بکەیت تێیدا، بەڵکو تۆ ئەوەت لەسەرە بابەتەکان ریزبەندی بکەیت بە جۆرێکی وا یارمەتیت بدا لەسەر هەڵسەنگاندنی هەواڵەکانو دیاریکردنی ئەوانەی بلاوی دەکەیتەوە لە رادیۆکەدا.

٢) دیارە تۆ دەزانی چەند بابەتت پێویستە بۆ خوێندنەوە لەو کاتەدا کە دیاری کراوە لە رادیۆکەدا، پاش ئەوەی ئەو بابەتانەت دەستنیشان کرد کە بەکاریان دێنی، چەند دێڕێك دیاری بکە بۆ هەر هەواڵێك بۆ پڕکردنەوەی ئەو کاتەی بۆت دانراوە، بە پێشەکی‌و کۆتایی‌و ریکلامو ناوهێنانی ئەو ئیستگەیەوە کە هەواڵەکەی لێ بلاو دەکەیتەوە.



٣) نووسین: دەست بکە بە نووسینی هەواڵەکان بەگوێرەی ژمارەی ئەو دێڕانەی داتناوە بۆ هەر هەواڵێك، هەواڵەکە بخەرە ئەو قاڵبەوە کە تیایدا بلاو دەکرێتەوەو ئەگەر بۆت بکرێ هەواڵەکان دابەش بکەو ئەگەر گونجاوبوو چەند وشەیەك بنووسە کاتێك لە هەواڵێکەوە دەچیتە سەر هەواڵێکی تر، یا بۆ بەستنەوەی هەواڵەکان بەیەکەوە، پاش ئەوە شریتی هەواڵەکە پاکنووس بکە بە جۆرێك بە تەواوی رێك بکەوێ لەگەڵ ژمارەی ئەو دێڕانەدا کە پێویستن بۆ پڕکردنەوەی ئەو کاتەی دانراوە بۆ هەواڵەکە.

ئەمانەی سەرەوە باسکردنێکی سادە بوو بۆ پێویستییەکانی ئامادەکردنی شریتێکی هەواڵ. دیارە جگە لەم داڕشتنە میکانیکییە چەند هۆیەکی نەبینراوی تر هەن وەك بوونی توانای هەڵسەنگاندنی هەواڵو باسکردنی هەندێ زانیاریی پێشینە لەسەری‌و بارودۆخی ناوچەیی‌و سیاسەتی کارکردنی رادیۆ یا تەلەفزیۆنەکە، بەلأم ئەگەر توانیت ئەم رێڕەوە پەیڕەو بکەیت ئەوە رزگارت دەبێت لە سەرلێشێوانو پەشۆکان لە بەردەم ئەو کۆمەڵە هەواڵانەی کۆ بوونەتەوە لەلات، هەروەها دووریش دەکەویتەوە لە هەڵسەنگاندنی خێراو سەرپێیی لە دوا چرکەکانی پێش بلاوکردنەوەدا.

## پێوانەکردنی کەرەستەی هەواڵ

پێویستە لەسەر نووسەرو ئامادەکاری هەواڵ — بەگوێرەی بۆچوونی خۆی — بە وردی بزانێ شریتی هەواڵەکە وا لێبکا کە بگونجێ لەگەڵ ئەو کاتەی کار دەکات لە چوارچێوەکەیدا. ئەوەی پەیوەندیی هەبێ بە کاتەوە، شریتی هەواڵ دەپێورێ بە تێکڕای ژمارەی ئەو وشانەی کە بێژەر دەیڵێ لە خولەکێکدا. بۆ گەیشتن بە زانینی تێکڕای ئەو وشانە، زۆربەی نووسەران پەنا دەبەنە بەر ژماردنی ئەو دێڕانەی بە ئامێری نووسین نووسراون کە شریتی هەواڵەکەیان لێ پێکدێ.

وا دیارە تا ئێستا رێکەوتنێك نییە لەسەر ژمارەی ئەو وشانەی کە دەبێ بێژەر لە هەر خولەکێکدا بیخوێنێتەوە. یەکێك لە ئیستگە گەورەکان لە لێکۆڵینەوەیەکیدا بۆی دەرکەوتووە کە خوێندنەوەی سەدو حەفتاو پێنج وشە لە خولەکێکدا رێژەیەکی نموونەییە، هەندێ ئیستگەی رادیۆی تریش ژمارەیەکی کەمتریان داناوە کە سەدو پەنجا وشەیە. هەندێکی تریش رێژەی وشەکانیان گەیاندووەتە ژمارەیەکی زیاتر لە سەدو حەفتاو پێنج وشە.

ئەگەر بە نیاز بوویت بابەت بنووسی بۆ رادیۆ یا تەلەفزیۆن ئەوە دەبێ پەیڕەوی یاسای ئەو دەزگایانە بکەی سەبارەت بە ژمارەی وشەکان لە هەر خولەکێکدا. لە خوارەوە، رێگەیەك دەخەینە روو بۆ گونجاندنی هەواڵەکەو ئەو کاتەی دیاری کراوە بۆ بڵاوکردنەوەی. پەراوێزی ئامێری نووسینەکە دیاری بکە لەسەر ١٠و ٧٥. ئەم دیاریکردنە، بە شێوەیەکی مامناوەندی بۆ هەر دێڕێك دە وشەت دەداتێ‌و ئەو بێژەرانەی پشت دەبەستن بە راهاتنی خۆیانەوە، ١٥ یا ١٦ یا ١٧ دێڕ دەخوێننەوە لە هەر خولەکێکدا، تۆش دەتوانی هەواڵەکەو کاتی دیاریکراو بگونجێنی لەگەڵ یەکدا، بە تەنیا ژماردنی ئەو دێڕانەی نووسراون بە ئامێرەکە.

بۆ تەواوکردنی مەبەستەکانی ئەم بەشە، ئێمە وا دادەنێین کە ئەو رادیۆ یا تەلەفزیۆنە پێی باشە لە هەر خولەکێکدا شانزە دێڕ بخوێنرێتەوە لەبەر ئەوە تۆ پێویستیت بە هەشتا دێڕ هەیە بۆ پێنج خولەك‌و سەدو شەست دێڕ بۆ دە خولەك‌و دوو سەدو چل دێڕ بۆ پانزە خولەك. دیارە دەبێ ئەم ژمارانەش وتەی پێشەکی‌و کۆتاییی‌و ریکلامی بازرگانی‌و ناوی خودی ئیستگەکەش بگرێتەوە.

ئەم سیستمەی سەرەوە کە دانراوە بۆ گونجاندنی هەواڵ لەگەڵ ئەو کاتەی بۆی دیاریکراوە، کارێکی زۆر ئاسان نییە، چونکە هەندێ هەواڵ وشەی وایان تێدایە بە زەحمەت دەخوێنرێنەوەو هەندێ بڕگەی وای تێدایە کە دەبێ لەسەرخۆ بخوێنرێنەوە بۆ ئەوەی خەڵك لێیان تێبگا، لەبەر ئەوە هەندێ دەزگای رادیۆو تەلەفزیۆن پەنا دەبەنە بەر دوو رێگەی تر: یەکەمیان ئاماژەکردنە لەلایەن ئەو ئەندازیارەی سەرپەرشتیی تۆمارەکە دەکا یاخود لەلایەن نووسەری بابەتەکەوە. دووهەمیان پابەندبوونە بە کاتەکەوە لە دوا دوو یا سێ خولەکی کۆتایی بڵاوکردنەوەی هەواڵەکە.

## زمانی ئاماژەکردن

زمانی ئاماژەکردن بە شێوەیەکی پەربڵاو لە جیهاندا بەکاردەهێنرێ، ئەم جۆرە هۆی لەیەکگەیشتنە بەکاردەهێنرێ کاتێك بێژەری هەواڵ لە بەردەم مایکرۆفۆندایەو ناتوانێ هیچ قسەیەك بکا، لەم حاڵەدا نووسەری هەواڵ یا ئەندازیار دەیانەوێ زانیارییەك بگەیەنن پێی بەم شێوەیەی خوارەوە:



| ئەوەی دەیانەوێ بە بێژەری بڵێن | جۆری ئاماژەکردنەکە |
|---|---|
| * سەیرکردنێك بۆ ئەوەی بێژەر دەست بکا بە خوێندنەوە. | * بە پەنجەی دۆشاومژە (شایەتمان)، دەست دەبەی بۆ یەکێك لە چاوەکانت. |
| * ئێستا تۆ لە حاڵەتێکدایت قسەکانت بڵاو دەبنەوە. | * بە پەنجەی دۆشاومژە راستەوخۆ ئاماژە دەکەیت بۆ بێژەر. |
| * پەلە مەکە، لەسەرخۆ بە. | * هەردوو دەستت لەسەرخۆ لە یەك جیا دەکەیتەوە، وەك ئەوەی شتێك رابکێشی. |
| * خێرا بە. | * بە پەنجە ئاماژە دەکەیت بۆ بێژەر لەگەڵ سوڕانەوەی دەستتدا وەك سوڕانەوەی میلی سەعات. |
| * هەموو شتێك بە باشی دەڕوا. | * بازنەیەك پێکدەهێنی بە پەنجە گەورەو پەنجەی تەنیشتی‌و پەنجەکانی ترت هەموو کراوەن. |
| * دوو خولەکت ماوە. | * دوو پەنجە بەرز دەکەیتەوە. |
| * یەك خولەکت ماوە. | * یەك پەنجە بەرز دەکەیتەوە. |
| * نیو خولەکت ماوە. | * بە پەنجەکانت پیتی (T) دروست بکە. |
| * دەنگت دەرناچێ. | * بەنجەت بێنە بە قورگتدا وەك ئەوەی بیبڕێتەوە. |
| * دوورکەوەرەوە لە میکرۆفۆنەکە. | * دەستت بجووڵێنە، دوور لە دەموچاوت‌و بەری دەستت کرابێتەوە بۆ دەرەوە. |
| * نزیك بەرەوە لە میکرۆفۆنەکە. | * دەستت بجووڵێنە بەرەو دەموچاوت‌و بەری دەستت رووی لە دەموچاوت بێ. |
| * دەنگت بەرز بکەرەوە. | * هەردوو دەستت بجووڵێنە بەرەو سەرەوەو بەری دەستەکانت بەرز بکەرەوە بۆ سەرەوە. |
| * دەنگت نزم بکەرەوە. | * هەردوو دەستت بجووڵینە بۆ خوارەوەو بەری دەستەکانت روویان لە خوار بێ. |

ئەگەر بێژەر ویستی پرسیار بکا ئایا بەرنامەکە بەگوێرەی خشتەی کاتە دیاریکراوەکە دەڕوا یا نا؟، ئەوا پەنجەی دۆشاومژە دەبا بۆ لووتی، ئەگەر وەلامەکەی بەلێ بوو ئەوا ئەندازیارەکە یا نووسەری هەواڵ دەست دەدا لە لووتی، بەلام ئەگەر وەلامەکە نەخێر بوو، ئەوا ئەو کەسەی بەرپرسە لە ئاماژەکردن ئاماژەی تایبەت دەکا بۆ بێژەرەکەو تێیدەگەیەنێ.

## پابەندبوون بە کاتەوە

پابەندبوون بە کاتی دیاریکراوەوە، سەبارەت بە دوو یا سێ هەواڵی کۆتایی یارمەتیی بێژەر دەدا لەسەر رێك خوێندنەوەو خۆ دوورگرتن لە پەلەکردن لە خوێندنەوە یا خاوکردنەوەی لە ماوەی یەك خولەك یا چەند خولەکی کۆتایی، پابەندبوون بە کاتەوە، بە سادەیی مانای ئەوەیە نووسەری هەواڵ، دوو یا سێ هەواڵی کۆتایی بخوێنێتەوەو سەعاتێکی لە بەردەمی خۆیدا دانابێ‌و ئەو کاتە دیاری بکا کە پێویستە بۆ خوێندنەوەی هەر هەواڵێك‌و پاشان بێژەرەکە ئاگادار بکاتەوە لەو کاتە دیاریکراوەی پێویستە دەست بکا بە خوێندنەوەی هەواڵی یەکەم لەو هەوالانە بۆ ئەوەی بتوانێ لە ماوەی دیاریکراودا هەواڵەکان تەواو بخوێنێتەوە.

ئەو بابەتەی کە دەبێ پابەند بیت بە کاتەوە تیایدا، دەبێ ئامادە بکرێ‌و ئەو کاتەش کە دەیەوێ بۆ خوێندنەوەی، پێش ئەوەی دەست بکرێ بە خوێندنەوەی هەواڵەکە. لە خوارەوە باسی پابەندبوون بە کاتەوە دەکەین لە شریتی هەواڵدا.

١) دەست بکە بە ئامادەکردنی ئەو هەواڵەی پێویستی بە دیاریکردنی کاتە پێش هەموو شتێك. ئەم بابەتە دەبێ تەواو ببێ‌و کاتەکەشی بۆ دیاری بکرێ ئەگەر بتوانرێ پێش ئەوەی هەواڵەکان بنووسرێن.

٢) ئەو کاتە دیاری بکە بۆ خوێندنەوەی هەواڵەکە، ئەمەش بەهۆی ئەوەوە دەبێت کە سەعاتێك لە بەردەمتدا بێت‌و کاتەکە دیاری بکەیت‌و لە پەراوێزی لای راستی هەر هەواڵێکەوە بینووسیت.

٣) ئەو ماوەیەش بخەرە سەر کاتەکە، کە لە کۆتایی بەرنامەکەدا هەندێ شت دەخوێندرێتەوە.



٤) بە خەتێکی گەورە (لەلای سەرووی لاپەڕەی ئەو هەواڵەوە کە دەبێ بێژەر پابەندی کات بێت تیایدا) ئەو کاتە بنووسە کە بێژەر دەبێ دەست بکا بە خوێندنەوەی هەواڵەکەو کۆتاییپێهێنانی ئەگەر کات دیاری کرابوو بۆ کۆتاییهێنان.

## سادەیی لە رێکخستنی شریتی هەواڵدا

دارشتنی دەنگوباس پێویستیی بە سادەیی هەیە. لە پێشدا بە بابەتی زۆر گرنگ دەست پێدەکاو پاشان ئەو هەوالانەی گرنگییان کەمترە بە دوایدا دێن یەك لە دوای یەك، بە شێوەیەك وشەو رستەی پەیوەستکردنی هەواڵێك بە هەواڵێکی ترەوە بە کەمی بەکاربهێنرێ. بۆ ئەوەش گوێگر وا لێبکەیت کە بێدەنگ بێ تا کۆتایی هەواڵەکەو گوێی بۆ رابگرێ، دەبێ باسی کەش‌و هەواو هەندێ بابەتی خۆشی تێدابێ تا دوایی.

شریتی دەنگوباسی نموونەیی، دەبێ چەند بابەتێکی تێدابێ پەیوەندییان هەبێ بەیەکەوەو بە جوانی رێکخرابن، بە جۆرێك گوێگر لە هەواڵێکەوە بچێ بۆ هەواڵێکی تر بە بێ ئەوەی تووشی سەرلێشێوان ببێ، بەلام ئەم حالەتە نموونەییە بە دەگمەن روو دەدا، چونکە هەواڵەکان خۆیان بەم شێوەیە روو نادەن.

## دابەشکردنی هەواڵ‌و رستەی پەیوەستکردن بەیەکەوە

زۆر کەس لە نووسەرانی هەواڵ دوو رێگە بەکار دێنن بۆ یارمەتیدانی بێژەران لەسەر ئەوەی وا لە گوێگران بکەن لە بابەتێکەوە بچنە سەر بابەتێکی تر: یەکەمیان بەش بەشکردنی هەواڵەکان، دووهەمیان دێڕی گواستنەوە، یا ئەوەی کە ناو دەبرێ بە رستەی پەیوەستکردن. دابەشکردن — واتە کۆکردنەوەی هەواڵەکان لەسەر بنەمای بابەتەکان، یا شوێنی جوگرافی — یارمەتیی گوێگر دەدا لەسەر تێگەیشتن‌و هەلسەنگاندنی هەواڵەکان‌و بەها بۆ دانانیان، هەروەها یارمەتی دەدا لەسەر یەك بە دوای یەکدا هاتن‌و ئاسانیی هەواڵەکان.

رستەو وشەی پەیوەندیش، بریتین لە چەند وشەیەك لە نێوان هەواڵەکاندا، یارمەتیی بێژەر دەدەن بۆ ئەوەی گوێگر بتوانێ لە بابەتێکەوە بگوێزێتەوە بۆ بابەتێکی تر بە بێ ئەوەی تووشی بۆشاییەك ببێ‌و ئاگاداری‌و وریایی لەکیس بدا. هەندێ لە نووسەرانی هەواڵ ئەو دوو رێگەیە بە

باش دەزانن‌و بەکاریشیان دێنن، هەندێکی تریان بە پێویستی نازانن، وا دیارە کە رێکەوتنێکی تەواو هەیە لەسەر ئەوەی، شریتی هەواڵەکە چەندە درێژ بێ ئەو دوو رێگەیە زیاتر بەکارهێنانیان گرنگە. ئەوەشی دووپات کراوەتەوە ئەوەیە لە کورتەی هەواڵەکاندا کە خولەکێك یا دوو خولەك دەخایەنێ پێویستی کەمە بۆ بەکارهێنانی ئەو دوو رێگەیە.

## دابەشکردن

کاتێك خەریکی ئامادەکردنی شریتێکی هەواڵ دەبی، دەبێ بە بەردەوامی زیاتر لە هەواڵێکت لە بەردەستدا بێت کە باسی یەك بابەت بکەن. ئیتر هەواڵەکە لە یەك ناوچەوە بێت یا چەند ناوچەیەك، ئەگەر تۆ حەزت دەکرد لە دابەشکردنی هەواڵ، هەموویان کۆ دەکەیتەوە بۆ ئەوەی گوێگر گوێی بۆ راگرێ وەك یەك بابەت. بۆ نموونە، ئەگەر سێ ئاژاوەو پشێوی روویان دا لە زانکۆی ناوچەکەتداو ئەگەر تۆ هاتی ئەو سێ ئاژاوەیەت بەست بە یەکەوەو پێشەکییەکت بۆ نووسین، ئەوا تۆ یارمەتیی گوێگر دەدەیت لەوەدا کە لە گرنگیی ئاژاوەکان تێبگات. تەنانەت ئەگەر ئەو سێ ئاژاوەیە لە چەند ناوچەیەکی جیاجیای جیهاندا روویان دابوو، ئەوە تۆ دەتوانی یارمەتیی گوێگر بدەی — لە رێگەی کۆکردنەوەی هەر سێ رووداوەکە لە یەك رووداودا — لەوەدا کە بە شێوەیەکی باشتر تێبگا لە مانای یاخیبوونی خوێندکاران لە جیهاندا بە گشتی.

دەکرێ هەموو جۆرە هەواڵێك دابەش بکەیت بە جۆرێك باشیی دابەشکردنەکە دەربکەوێ لە لیستێکی درێژدا، تاوان، ئاژاوە، گۆڕانکاریی بواری خوێندن، مانگرتن، رووداوەکان، گەشتێکی ئاسمانی، جەنگ، ئەم جۆرە دابەشکردنە مانایەکی ورد دەبەخشێ، بە شێوەیەك یارمەتیی گوێگر دەدا لەسەر هەڵسەنگاندنی گرنگیی هەواڵ. زۆرجار هەواڵەکان بە هەمان شێوە دابەش دەکرێن لەسەر بنەمای جوگرافی، ناوخۆیی تایبەت بە وڵاتەکەوە، یا هەرێمەکە، یا نەتەوەیی، یا نێودەوڵەتی، کاتێکیش تۆ ئەمە دەکەیت، گوێگر لە ناوچەیەکەوە دەبەیت بۆ ناوچەیەکی تر، بە بێ ئەوەی ئەو گواستنەوەیە لە هەواڵەکانی دابڕێ.

هیچ ناکۆکییەکیش نییە لە نێوان دابەشکردن لەسەر بنەمای جوگرافی یا بابەتەکان، هەردووکیان لە یەك شریتی هەواڵدا بەکار دەهێنرێن. ئەگەر ئەم دوو رێگەیە بەکارهێنران بە لێزانینەوە، ئەوا چی بەربەست هەیە لە بەردەم گوێگرتن‌و تێگەیشتنندا دەیخەیتە لاوە.



## ئامۆژگاری‌و رێنوماییی ئالان جاکسۆن

ئالان جاکسۆن ئێستا لە هەفتەیەکدا، پانزە شریتی هەواڵ دەنووسێ‌و ئامادە دەکاو دەیخوێنێتەوە بۆ رادیۆی (سی. بی. ئێس)ی ئەمریکا. رادیۆکە دەربارەی ئەو دەڵێ: بە گوێچکەکانی شت دەنووسێ. ئەمەش یەکێکە لەو هۆیانە کە گوێگرانێکی زۆری هەیە.

جاکسۆن ئەوە دووپات دەکاتەوە کە هەواڵی رادیۆ، دەبێ تایبەتمەندیی هەبێ لەوەدا کە بە سادەیی‌و ئاسانی‌و یەك بە دوای یەکی بابەتەکاندا ئامادە بکرێ. دەڵێ: "ئەو بابەتەی بڵاوی دەکەیتەوە وای لێبکە یەك بە دوای یەکدا بێن‌و وای لێمەکە هەر بابەتێك باز بدا بەلایەکدا".

هەروەها ئەوە دووپات دەکاتەوە کە ئەم ئاسانکارییە دەتوانرێ بهێنرێتە دی بە نووسین‌و رێکخستنی هەواڵەکان. لێرەدا هەندێ لەو رێنوماییانە باس دەکەین:

ئەو بابەتەی (دەبیسرێت) دەبێ بە سادەیی‌و بە ئاسانی خەڵك وەریبگرێ‌و لێی تێبگا، بابەتەکە دەبێ پێشەکی‌و ناوەرۆك‌و کۆتایی هەبێ، شریتی دەنگوباسیش دەبێ بەو شێوەیە بێ. تۆ دەتوانی زۆر شت بکەی بۆ ئەوەی ئەو شریتی هەواڵەی ئامادەی دەکەیت بەو جۆرە بێت، ئەمەش لە رێگەی ئەوەوە کە گرنگی بدەی بە بەدواداچوونی هەواڵەکان. هەواڵ هەموو کاتێك بە جۆرێکی نموونەیی وا نین کە خەڵك چاویان لێبکا، بێگومان تۆ هەندێ حەز لەوە دەکەیت کە پێ داگری لەسەر دوو هەواڵ یا زیاتر، لەبەر ئەوەی کە گرنگن.

لەگەڵ ئەوەشدا تۆ دەتوانی لەلایەکی ترەوە، کاری ئاسایی خۆت وا لێبکەیت کە زۆر ئاسانتر بێ، ئەگەر گرنگی بدەی بە یەك بوار لە هەواڵەکاندا وەك جوگرافی، ناوخۆیی، تا لێدەبیتەوە. بۆ نموونە: بۆ پوختەیەکی رووداوەکانی کۆنگرێس نانووسی‌و ئەنجا بچیتە سەر باسێکی تر لەبری ئەوەی بێیت‌و بڕۆیت بەناو هەواڵەکانداو باز بدەیت بە بێ هیچ هۆیەکی ئاشکرا. دەبێ وازبێنی لەو ڕێڕەوە منالانەیە کە هەندێ بێژەری ناوچەیی وەك کەسێکی کەم عەقڵ پەیڕەوی دەکەن، کاتێك دێن لە شوێنێکی هەواڵەوە باز دەدەن‌و جارێکی تر دەگەڕێنەوە سەری، وەك: کابیتۆل، ئەنجومەنی نوێنەران، جارێکی تر، ئەنجومەنی نوێنەران، واشنگتۆن، پایتەخت، جارێکی تر واشنگتۆن.

دوو ئامۆژگاری هەن لەسەرتە پابەند بیت پێیانەوە بۆ ئەوەی بابەتی هەواڵەکانت سادەو ئاسان بن لەسەر گوێگر. یەکەم خۆت ماندوو مەکە بۆ گەڕان بە دوای وشە یا رستە بۆ

نووساندنی هەواڵەکان بەیەکەوە. دووهەم، خۆت دوور بگرە لە بەکارهێنانی وشەی دەسکردو سواو، ئەگەر وشەیەکی گونجاوو باشت دەستکەوت بەکاری بێنە بەو مەرجەی کاریگەری خراپی نەبێ لەسەر هەست. رستەی (لەمیانەی ئەوەدا) یەکێکە لەو وشانە، ئەم رستە سادە داماوە، رۆژێك لە رۆژان بەکەڵكو سوودمەند بوو، بەڵام ئێستا پاش بەکارهێنانی لە ماوەی سی ساڵی تەمەنی رادیۆدا بووە بە رستەیەکی سواو، بە جۆرێك وای لێهاتووە، گوێگر هەر لەگەڵ ئەوەی دەیبیستێ گرژ دەبێ. لە بەکارهێنانی رستەی (لەمیانەی ئەوەدا) رستەیەکی تری وا نییە نەتوانی بە شێوەیەکی باشتر بیلێیت بە بێ ئەو، چونکە کاتێك تۆ شتێك دەنووسی بۆ ئەوەی بگاتە گوێی خەڵكو بلێیت (لەیادتە؟)، ئەوە لێرەدا، لایەنێکی زیادت بۆ پەیدا دەبێ، بۆ ئەو کەسانە دەست ناکەوێ کە دەنووسێ بۆ چاپخانە، ئەو لایەنە زیادەیەش بریتییە لە توانای گۆڕینی پلەی دەنگ لە بەرزکردنەوەو نزمکردنەوەدا، ئەم شێوازە بواری ئەوەت دەداتێ لە بابەتێکەوە بچیتە سەر بابەتێکی ترو ئەوەش روون بکاتەوە کە هیچ پەیوەندییەك نییە لە نێوانیاندا یا بە پێچەوانەوە.

پاش هەموو ئەمانە، گۆڕینی پلەی دەنگ شتێکی تەواو گرنگە وەك سامانی زمانەوانی لە گفتوگۆکردنی رۆژانەتدا، کەواتە بۆچی لە بواری کاری رادیۆدا سوودی لێوەرنەگیرێ.
رێنومایییەکی تر هەیە، ئەوەیە، ئەو هەستکردنەی هەتە بە لۆژیكو ژیریی خۆت لەدەست مەدە ئەگەر دەتەوێ لەو هەوڵەدا کە دەیدەی بۆ ئەوەی بابەتی نووسینەکان سادەو ئاسان بن، نموونەیەکم هەیە لەو بارەیەوە، لە بەیانیی رۆژێکی یەکشەممەدا، بێژەرێکی گەنج هەواڵێکی بڵاو دەکردەوە دەربارەی تێکشکانی فرۆکەیەكو بە دوایدا هەواڵێکی تری بڵاو کردەوە، بەڵام ئەو دوو هەواڵەی بەستەوە بەیەکەوە بە شێوەیەکی خەماویو ئازاردەرو گوتی: هەواڵێکی تر هەیە هەر لەم بەیانییەدا لەسەر فرۆکەیەکی تر کە سەرۆك ئایزنهاوەری هەڵگرتبوو... هتد.

ئاگاداری یەك بە دوای یەکدا هاتنی هەواڵەکانت بکەو خۆت بپارێزە لە بەکارهێنانی نازناو، بۆ نموونە ئەگەر خەریکی ئەوە بوویت باس لە نیکیتا خرۆشۆف بکەیت لە هەواڵەکاندا، نابێ ئاماژەی بۆ بکەیتو بلێیت (نیکیتا خرۆشۆف سەرۆك وەزیرانی یەکیەتیی شوورەوی) لەو هەواڵەدا کە یەکسەر بە دوای هەواڵە پێشووەکەدا دێت، ئەمەش بۆ ئەوەی بابەتی نووسینەکەت بە سادەییو ئاسانی لە هەواڵێکەوە بچێتە هەواڵێکی تر.



بۆ روونکردنەوەی بابەتەکە، جارێك بیستم لە بێژەرێك هەواڵێکی دەخوێندەوە لە نیویۆرك دەربارەی گوتارێکی ریچارد نیکسۆن — کە ئەو کاتە لە پلەی جێگری سەرۆکی ئەمریکادا بوو — کە بەشێکی زۆری گوتارەکەی تەرخان کردبوو بۆ قسەکردن لەسەر خرۆشۆف، لە هەواڵی دوای ئەوەدا یەکسەر بێژەرەکە دەستی کرد بە قسەکردن لەسەر خرۆشۆفو وەك یەکەم جاربێ ئەو ناوەی بەرچاو کەوتبێ گوتی: (سەرۆك وەزیرانی یەکیەتیی شوورەوی نیکیتا خرۆشۆف گەیشتە...)، ئەم جۆرە وتار بڵاوکردنەوەیە کاریگەریی خراپ دروست دەکا لای گوێگرو لە توانای کەم دەکاتەوە بۆ تێگەیشتن لە هەواڵەکەو بەستنی بابەتەکان بەیەکەوە.

پێویستە لەسەر ئەو گەنجانەی حەز دەکەن لەوەی پلەیەك بەدەست بێنن لە بواری رۆژنامەی بڵاوکراوەدا، ئەوەیان لە بەرچاو بێ کە هەلی دەستکەوتنی پۆستێكو پاشان پێشکەوتن تیایدا، پشت دەبەستێ بە توانایان لە نووسینی بابەتەکاندا بە شێوەیەکی وردو خێرا، بە جۆرێك بەرەوخوار ببنەوە بۆ گوێی ئەوانەی گوێی لێدەگرن. دیارە ئەو نووسەرانەی دەیانەوێ حەقیقەتو راستی بنووسن لە هەموو شوێنێك جێگەیان دەبێتەوە.
رێنومایییەکانی جاکسۆن لێرەدا کۆتایی دێت.

## ئامێرەکانی پەیوەستکردن

دەکرێ ئامێرەکانی پەیوەستکردنی هەواڵێك بە هەواڵەکانی ترەوە بە شێوەیەکی کاریگەر بەکار بهێنرێن، ئیتر بابەتی هەواڵەکە دابەش کرابێ یا نا. ئامێری پەیوەندی تەنیا وشەیە کە دوو هەواڵ دەگەیەنێ بەیەكو هەندێ جار لە کۆتایی هەواڵێکدا دەنووسرێو هەندێ جار لە سەرەتای ئەو هەواڵەدا کە دێت بە دوایدا.

ئامێری پەیوەندی، بێژەر دەیلێیت بە بێ ئەوەی دووبارەکردنەوەکی تێدابێ چونکە ئەو ئامێرە هیچ شتێك زیاد ناکا لە هەواڵەکەو دەکرێ لا ببرێو هەواڵەکان وەك خۆیان دەمێننەوە بە بێ هیچ گۆڕانێك، بەڵام ئەگەر بە شێوەیەکی لێهاتووانە بەکار بهێنرێت ئەوا بەشداری دەکا لە بەردەوامیی هەواڵەکەدا، هەروەها ئەو هەستە دەبەخشێ بە گوێگر، کە گوێی راگرتووە لە پێشکەشکردنێکی تەواوی هەواڵەکان، نەك تەنیا گوێ دەگرێ لە کۆمەڵە هەواڵێك هەڵبژێردراون بە رێکەوتو بە بێ ئەوەی پەیوەندییەك هەبێ لە نێوانیاندا تیکەڵ کراون.

ئامێرەکانی پەیوەستکردن لە هەواڵەکانی رادیـۆو تەلەفزیۆنـدا، گفتوگـۆو نـاکۆکی بـەرپا کردووەو هیچ رێکەوتن‌و پێکهاتنێ نییە لە نێوان نووسەرانی هەواڵ‌و بێژەراندا دەربارەی سوودو کاریگەرییان، لە سەرێکەوە هەندێ بێژەری هەواڵی لێهاتوو هەن هیچ ئامێرێکی پەیوەسـتکردن بەکار ناهێنن‌و جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە دەتوانن گـوێگر لەگـەڵ خۆیانـدا راکێـشن لـە هەواڵێکەوە بۆ هەواڵێکی تر، تەنیا بە پشتبەستن بە توانـاو کەسـیەتیی خۆیـان‌و دەسـەڵاتیان بەسەر پلەی دەنگیاندا بۆ بەرزو نزمکردنەوەی، لەلایەکی ترەوە زۆر نووسـەرو بێـژەری وا هـەن کە لایان وایە بەکارهێنانی وشەو رستەی پەیوەندی شتێکی زۆر پێویستە، بە جۆرێك خـەڵك وا هەست بکا کە بەکارهێنانیان بێ جێیەو نائاساییە.

بەڵام ئێمە لامان وایە، ئەگەر ئامێری پەیوەستکردن بە لێزانییەوە بەکار بهێنرێن، یارمەتی دەدا بۆ ئەوەی گوێگر لە بابەتێکەوە بچێتە سەر بابەتێکی تر بە شێوەیەکی کاریگەرو ئاسـان. لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ ئاگاداری ئەوە بی کە نابـێ ئـامێری پەیوەسـتکردن بـەکار بێنـی ئەگـەر رۆڵێکی ئاسایی نەبێ‌و هەروا بە بێ پێویست بەکاری مەهێنە.

لە راستیدا زۆر لە ئێمە بە بێ ئەوەی ئاگامان لە خۆمان بێ ئەو ئامێرو هۆیانە بەکار دێنین لە گفتوگۆی رۆژانەماندا، چونکە ئێمە راهاتووین لەسەر ئەوە پێش ئـەوەی دەسـت بکـەین بـە باسکردنی ناوەرۆکی بابەتەکە لەگەڵ هاوکارێکماندا‌و هەندێ رستە بەکار دێنین وەك:

* لەبیرت نەچێ (لەم بارەیەوە)....... .
* ئەمە، ئەوەم بیر دەخاتەوە کە....... .
* وەك لە خەیاڵتە....... .
* و....... .
* بەڵام....... .
* لەگەڵ ئەوەشدا....... .
* دووبارە....... .

ئەم وشانەی سەرەوە هەموویان هۆی پەیوەستکردنن، چونکە بە شێوەیەکی ئاسایی دێن بـە دەمتدا کاتێك لە بابەتێکەوە دەچیتە سەر بابەتێکی تر، یا بیرۆکەیەکی تازە دێت بە خەیاڵتداو دەیخەیتە پاڵ بابەتێکی کۆنەوە.



نووسـەرە لێهاتووەکـانی رۆژنامـەکان، ماوەیـەکی زۆرە راهـاتوون لەسـەر ئـەوەی بڕگـەی گواستنەوە بەکار بێنن، هەروەها گەلێك لە نووسەرە لێهاتووەکانی رادیۆو تەلەفزیۆن، بڕگەکانی گواستنەوە بەکاردێنن بە شێوەیەکی باشتر بەهۆی خوێندنەوەی هەواڵەکانەوە.

بڕگەکانی گواستنەوە لە باری جوگرافییەوە:

دەتوانرێ ئامێرو هۆکانی پەیوەندی هەواڵ لە باری جوگرافییەوە بەکار بهێنرێن بـە جۆرێـك باشی‌و سوودەکانی دەربکەوێ. جاران لە هەواڵەکانی رادیۆدا نووسەر یا نووسەرانی هەواڵ، ئـەم بڕگە جوگرافیاییانەیان بەکار دەهێنا، لە رێی دابەشکردنی بابەتەکان یا هەواڵەکانەوە بەگوێرەی شوێنەکانیان‌و دواتر ناوی ئەو شوێنانەیان دەخوێندەوە، وەك لینکۆلن، نبراسکا، یـا واشـنگتۆن یا پاریس... هتد، تا ئێستاش چەند دەزگایەکی کەم هەن هـەر ئـەم شـێوەیە بـەکار دێـنن‌و، زۆربەی ئیستگەکان، بڕگە جوگرافییەکان بە جۆرێك تێهەڵکێش دەکەن کە بە شێوەیەکی رەهاو ئاسان بگونجێن لەگەڵ بڵاوکردنەوەدا.

کاتێـك شـوێنی رووداوی هـەواڵ بـەکار دێنـی وەك ئـامێرێکی پەیوەنـدی ئـەوە دەتـوانی یارمەتیی گوێگر بدەیت لە ناوچەیەکەوە بچێتە ناوچەیەکی تر بە ئاسانی‌و سـادەییەکی زیـاترو گرنگیدانێکی کەمتر. بۆ نموونە: کاتێك لە ئاژانسی دەنگوباسەوە، سێ بابەتی جیاواز وەردەگری دەربارەی چالاکییەکانی کەشـتیگەلی شـوورەوی لـە چـەند شـوێنێکی گرنگـدا سـەبارەت بـە ئەمریکا، رەنگە بە بابەتێکی سەرەکیی گرنگ دەست پێبکەی بەم شێوەیە:

"ئەمشەو ئاژانسەکانی هەواڵ گرنگییان داوە بەو چالاکییانەی رەنگە دژ بە ئـەمریکا بـن. لە (دەریای ناوەڕاستدا) چەند گەشتییەکی جاسوسیی ئەلکترۆنی بەردەوامن لە تەنگ هەڵـچنین بە گەشتییە جەنگییەکانی ئەمریکا کە خەریکی مانۆڕن. لە کەنەدا یـەکێك لـە راوچـییەکان، باوەڕی وایە کە دوو ژێر دەریایی شوورەوی بینیـوە بەرامبـەر بـە کـەنارەکانی (فـانکۆفر) لـە باشووریشەوە لە (پیرۆ)، هەندێ لە چاودێران دەڵێن، سـێ ژێـر دەریـایی شـوورەوی، خـەریکی کارکردنن لە ژێر دەریادا بەرامبەر کەنارەکان لە چەند رۆژێك لەمەوبەرەوە تا ئێستا".

بەم شێوەیە تۆ، یەکەم یارمەتیی گوێگر دەدەیـت کـە هەواڵـەکانی کەشـتیگەلی شـوورەویت بـۆ دەرخستووە، دووهەم، یارمەتیی دەدەیت لەوەدا کە تێبگا چۆن ئەم چالاکییانە بە شێوەیەکی بـەربڵاو

ئەنجام دەدرێن، کە لە شوێنێکەوە دەچێتە شوێنێکی تر وا لە گوێگر دەکەیت خۆی ئامادە بێ بۆ ئەوەی لە گەڵتدا بچێتە ئەو شوێنە.

کارێکی جوان نییەو — رەنگە هەر نەشکرێ — ئێمە بێین لیستێك دابنێین بۆ هەموو ئەو ئامێری پەیوەندییانەو باسی ئەوە بکەین کە هەریەك لەمانە لە چ شوێنێکدا بەکاردێن. کێشەیەکی زۆر هەیە دەربارەی بەکارهێنانی بڕگەی گواستنەوەو زۆرجار ئەو بڕگەو ئامێری پەیوەندییانە بەکەڵكو کاریگەرن، هەوەرها کاتی واش هەیە بەکارهێنانیان هیچ مانای تێدا نییە، ئەوانەی تازە هاتبنە بواری نووسینەوە، بە چاکی فێری ئەو بەکارهێنانە نابن لە رێگەی ئەزموونی نووسینو ئامادەکردنی شریتی هەواڵی رادیۆو تەلەفزیۆنەوە نەبێ.

رێنومابییەکی راست هەیە کە بریتییە لەوەی: خۆت تەنگەتاو مەکە بۆ گەڕان بە دوای وشەو رستەی پەیوەندیدا بۆ ئەوەی بە زۆر بیئاخنیتە نێوان هەواڵێكو هەواڵێکی ترەوە، ئەوانە تەنیا کاتێك بەکاربێنە کە زۆر ئاسایی بنو خۆیان هەڵقوڵێن لە ناختەوە.

بۆل وایت کە یارمەتیی دامەزراندنو بەسەرکردنەوەی هەواڵی رادیۆو تەلەفزیۆنی ئیستگەی (سی. بی. ئێس)ی داوە، راهاتبوو لەسەر ئەوەی بە خوێندکارانی بواری رۆژنامەوانی بڵێت: رێکخستنو ئامادەکردنی هەواڵ بە ئەندازەی نووسینی هەواڵەکە خۆی گرنگە. هەروەها دەیگوت پێیان کە یاساو پەیڕەوێکی باوەڕپێکراو نییە بۆ کاتێك کە پێویست بێ بۆ ئامادەکردنی شریتی هەواڵ، چونکە شریتێکی هەواڵ کە ماوەکەی دە خولەکە رەنگە کاری چوار کاتژمێری پێویست بێ، کورتەیەکیش کە ماوەکەی پانزە خولەك بێ رەنگە پێویستیی بە شەش کاتژمێر کارکردن هەبێت. وایت هەموو کات جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە زۆربەی نووسەرانی هەواڵ ئەوەندە بابەت دەنووسن کە زیاترە لەوەی بتوانرێ بەکار بهێنرێن. هەروەها دەیگوت هیچ دەقێکی نووسراو نییە نەتوانرێ چاك بکرێ لە رێگەی کورتکردنەوەیەوە.

# بەشی پانزەهەم

## رادیۆ: بەدیهێنەری پێویستییەكانی ناوچە گوندنشینەكانی جیهانی سێهەم

**نووسینی: أ. ل. هستر**

بێژەرەكانی وڵاتانی تازەگەشەكردوو، كە دەیانەوێ پێویستییەكانی دانیشتوان — كە زۆربەیان گوندنشینن — بهێننەدی، رۆڵێك دەبینن كە لە ئەركە هەرە قورسەكانی بواری پەیوەندیی جەماوەرە. ئەمە ئەنجامێكە بەشێكی زۆر لەو بێژەرانەی پێویستە لەسەریان چاری كێشەكانی كاركردن لەگەڵ خەڵكێكی گوندنشیندا بكەن، پێی گەیشتوون. من لەمیانەی ئەو گفتوگۆیانەدا كردوومە لەگەڵ رۆژنامەوانانی بواری رادیۆو تەلەفزیۆن، چەند هۆیەكی زۆرم دۆزیوەتەوە كە دەبنە مایەی ئەو نارەحەتییانەی رووبەڕوویان دەبێتەوە.

پێش هەرشتێك ئەو ئەركە پێویستیی بە دان بەخۆداگرتن‌و خۆماندووكردنە بۆ جێبەجێكردنی خزمەتێك لە بواری رادیۆدا كە یەكێك لە ئامانجە سەرەكییەكانی ئەوەیە بگاتە جەماوەری گوندنشین، شتێكی ئاساییە كە ئەوانەی بەو ئەركە هەڵدەستن تووشی نائومێدی بن، چونكە ئەوەی ئەمان چاوەڕێی دەكەن لەلایەن گوێگرانەوە، زۆرجار ئەوە نییە كە ئەمان دەیانەوێ، ئەمە جگە لەو بودجە كەمەی كە تەرخان دەكرێ بۆ ئەو دەسكاری‌و چاكسازییەی بێژەرەكان بە پێویستی دەزانن بكرێ. بەڵام ئەمانە هەموو چەند حەقیقەتێكن كە دەبێ رابێیت لەگەڵیاندا لە هەموو بوارێكی كاركردنی دەزگا دەوڵەتییەكاندا كە تازە سەربەخۆییان وەرگرتبێ. هەوڵدان لەپێناوی بەرێوەبردنی سیستمێكی پەسەند لە بواری رادیۆدا كارێكی قورسە، وەك زۆربەی ئەركە دەوڵەتییەكانی تر، كە پەیدا دەبن پاش شەڕوشۆڕو یاخیبوونی خەڵك‌و شۆڕش‌و نائارامیی بەردەوام. لەگەڵ ئەوەشدا، بێژەر دەتوانێ دڵنیابێ لەوەی ئەو



ئەركەی جێبەجێی دەكا یەكێكە لە ئەركە گرنگەكانی (رۆژنامەگەریی بواری گەشەكردن)، كە بە مانای ئەوەیە رۆژنامە لە خزمەتی میللەتدا بێت.

لەگەڵ ئەوەشدا كە سیستمی ئیستگەی كەرتی تایبەت، لە زۆربەی دەوڵەتانی جیهانی تازەگەشەكردوودا كەمە، بەڵام رۆڵێكی باش‌و چالاك دەبینێ لە گەیاندنی زانیاری‌و پەیام بۆ گوێگران لە لادێكاندا، لە ئەمریكای لاتیندا بە تایبەت چەند ئیستگەیەكی رادیۆی كەرتی تایبەت هەن كە زۆر كەمن، لەگەڵ ئەوەدا كە پاڵنەری سەرەكی بۆ دامەزراندنی رادیۆ لەلایەن كەرتی تایبەتەوە پەیداكردنی پارەو دەسكەوتە، بەڵام پێویستە لەسەریان لە زۆربەی ئەو وڵاتانەدا گرنگی بدەن بە جێبەجێكردنی پێداویستییە نەتەوەییەكان، بە هەمان رادەی گرنگیدان بە بەرێوەبردنی كارێكی سەركەوتوو لەو بوارەدا. ئێمە دەتوانین بڵێین پێشكەشكردنی بەشداریكردنێكی تەواو بە پێداویستییەكانی دانیشتوانی ناوچە گوندنشینەكان ئەركێكی جێبەجێنەكراو نییەبۆ ئیستگەكانی كەرتی تایبەت ئەگەر خاوەنەكانیان هەست بەوە بكەن كە ئەو گوێگرانە چەندە گرنگن.

### ئامانجەكانی ئەم بابەتە

مەبەست لە نووسینی ئەم بابەتە، دیاریكردنی هەندێ كێشەیە كە رووبەڕووی ئەو بێژەرانە دەبنەوە كە لەگەڵ جەماوەری ناوچە گوندنشینەكاندا هەڵسوكەوت دەكەن‌و هێنانەوەی چەند نموونەوەیەكە بۆ ئەو كارو ئەركە جوانانەی لە هەندێ وڵاتانی جیهانی سێهەمدا ئەنجام دەدرێن‌و بە كورتی باسكردنێكی پێویستی راهێنانی ئەو بێژەرانەیە كە خزمەتی جەماوەری ناوخۆیی دەكەن، لەگەڵ گرنگیدان بە خزمەتكردنی بواری رادیۆ كە ئاراستەی ناوچە گوندنشینەكان دەكرێ.

زۆربەی وڵاتانی جیهانی سێهەم رووبەڕووی ئەم كۆسپانە دەبنەوە. یەكێك لە كێشە هەرە گەورەكانیان، كۆنیی ئامێرەكانیانە كە كاری پێدەكەن‌و بەكەڵك نایەن‌و بە باشی كار ناكەن. شتێكی ئاساییە كە ئیستگەكانی رادیۆ لە جیهانی سێهەمدا لە كار دەكەون بۆ ماوەیەكی دوورودرێژ بەهۆی پەككەوتنی ئامێری پەخش یا ئامێرەكانی تر. تەمەنی زۆربەی ئەو ئامێری پەخشانە لە نێوان بیست تا سی ساڵدایە (تەنانەت ئەوانەش كە هی دەوڵەتن). ئەم ئامێرانە

ئەگەر هێشتا پەکیان نەکەوتبێ‌و کار بکەن، بە نیوە ناتەواو کار دەکەن. ئەم پەخشکردنە پچڕپچڕو ناڕێکوپێکە بواری رەخساندووە بۆ جەماوەری گوێگر کە رەخنەی لێبگرن.

هەروەها ناتەواوییەکی زۆر هەیە لە ئامێری تۆمارکردنی پێویست‌و کەرەستەی ستۆدیۆو میکرۆفۆنی باش‌و لە کارنەکەوتوو... هتد، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا، بێژەرانی ولاّتانی جیهانی سێهەم ئەرکەکانیان بە شێوەیەکی باش بەڕێوە دەبەن. من خۆم بە گوێی خۆم بیستوومە کە بەهۆی گێژەڵووکەیەکەوە تاوەرێکی پەخشی رادیۆ کەوتووەتە سەر زەوی، بێژەرێك کە لەو ئیستگە ناتەواوەدا کاری کردووە وایەرێکی هێناوەو بەستوویەتی بە دارخورمایەکی زۆر بەرزەوەو بەو هۆیەوە بەردەوام بووە لە پەخشکردنی بەرنامەکاندا. سەیر ئەوەیە کە پەخشی رادیۆکە گەیشتووەتە زۆربەی ئەو ناوچانەی کە پێشتر پێیان گەیشتووە.

رەنگە زۆربەی بێژەرانی ولاّتە پێشکەوتووەکان سەریان سوڕ بمێنێ، کە ئەو ئامێرە سەرەتاییی‌و کۆنانە ببینن بەکار دەهێنرێن لە گەلێك لە ولاّتانی جیهانی سێهەمدا. لەگەڵ ئەوەشدا پەخشی رادیۆکان بەردەوامەو پەیامەکان لەسەر شەپۆلەکان بلاّو دەبنەوە، هەرچەندە بە شێوەیەك بلاّو دەبنەوە کە هەڵەیان تێدایەو لە ئاستێکی ئاسایی نزمترن.

وزەی کارەبای ناڕێکوپێك:

لە زۆرێك لە ولاّتانی جیهانی سێهەمدا وزەی کارەبای بەردەوام نییە، نەبوون‌و پچڕانی کارەبا بووە بە شتێکی ئاسایی، لەبری ئەوەی بوون‌و نەپچڕانەکەی ئاسایی بێ. بوونی ئامێرێکی بەرهەمهێنەری کارەبا کە هەموو کاتێك لە ئامادەباشیدا بێ بووە بە شتێکی پێویست بۆ هەموو ئیستگەکان، ئەمە ئەگەر توانای ئەوەیان هەبێ بیکڕن.

کێشەیەکی تر هەیە بریتییە لە ناتەواوی‌و کەمیی کارمەندی لێزان کە ئەو ئامێرانە ئیش پێبکەن یا چاکیان بکەنەوە، بۆ نموونە پێش چەند ساڵێکی کەم، کارمەندێك لە بابواکینیا کە بەرپرس بوو لە سەرپەرشتیکردنی پەیوەستکردنی رادیۆ بە مانگی دەستکردەوە، بزر بوو، بۆ ماوەی چەند رۆژێك کەس نەبوو کار بە ئیستگەکە بکا. ئەو کارمەندە گەڕابووەوە بۆ گوندەکەی ژن بگوێزێتەوە!.

جگە لەوەش، ناتەواوی‌و کەموکووڕی هەیە لە چاککردنەوەو پاراستنی ئامێرو کەرەستەکاندا، ئەم کێشەیەش رۆژ بە رۆژ زیاتر دەبێ بەهۆی نالەباریی ژینگەوە، کە شێدارەو



گەرماییەکی زۆر هەیە لە ناوچە کەمەرییەکانی جیهانی سێهەمدا. لەلایەکی ترەوە هەندێ رووداوی مەترسیدار هەن کە چاوەڕوان نەکراون وەك ئەوەی یەکێك لە بێژەرەکان لە کاتێکدا خەریکی پێشکەشکردنی راپۆرتێکە دەربارەی کەش‌و هەوا، دەبینێ مارێکی زەنگۆڵەدار خۆی ئالاّندووە لەو میکرۆفۆنەوە کە بە دەستیەوەیەتی.

هەروەها کێشەیەکی تر هەیە بۆ گەلێك لە بێژەرەکانی جیهانی سێهەم، ئەویش بریتییە لە کەمیی راهێنان. زۆر دەگمەنە ئەو بێژەرانە خولێکی راهێنانیان بینیبێ لە دەوڵەتە تازەپێگەیشتووەکاندا. بە تەواوی بووە بە باو، ئەوانەی کار دەکەن لە بواری رادیۆو تەلەفزیۆنداو ناچار دەبن بەهۆی کارکردنیانەوە رابێن لەسەر کارەکەیان، هەست دەکەن بەوەی کە تەنیا توانای پەخشکردن سەرکەوتنە بۆیان بە بێ گوێدانە جۆری هەواڵەکان یا ئەو بەرنامەی گاڵتەو گەپ‌و خۆشییەی بلاّوی دەکەنەوە. ئەو بێژەرانەی کە راهێنانیان نەبینیوە، دەبن بە گرفتێکی گەورەتر کاتێ بەڕێوەبردنی ئیستگەکەیان پێدەسپێردرێ، چونکە ئەگەر بەڕێوەبەری ئیستگە خۆی خولی راهێنانی نەبینیبێ، ناتوانێ پلانی تەواو دابنێ بۆ بەڕێوەبردنی کارەکەی بە تەواوی، هەروەها کارمەندەکانیش رێز ناگرن لە بەڕێوەبەرێك کە رانەهێنرابێ، چونکە چاوەڕێی ئەوەی لێدەکەن — بە بێ سوود — بارودۆخە قورس‌و ناجێگیرەکان چارەسەر بکات.

لە راستیدا کێشەیەکی تر هەیە کە لە گرنگی‌و مەترسیدا لە هەموو کێشەکانی کەمیی ئامێرو پاراستنی‌و کارمەندی رانەهێنراو زیاترە، ئەویش بریتییە لە نەبوونی پەیڕەوو پرۆگرامێکی کۆمەلاّیەتی‌و سیاسی بۆ دەزگاکە یا بۆ رادیۆکە. شتێکی زۆر ئاشکرایە کە دەوڵەتانێکی زۆری جیهانی سێ بڕیاری دروستکردن‌و پێکهێنانی دەستەیەك دەدەن بۆ سەرپەرشتیکردنی رادیۆو تەلەفزیۆنی نەتەوەیی، بە بێ ئەوەی گۆڕانێك بێنن بەسەر ئەو سیاسەتی پەیوەندی‌و راگەیاندنەی هەموو هۆکانی راگەیاندنی جەماوەری رێککەوتوون لەسەری. نەبوونی ئەو سیاسەتەش کە مەبەستی دروستکردنی جۆرێك لە خۆگونجاندنە لە نێوان هۆکانی راگەیاندن‌و بارودۆخی سیاسی‌و کۆمەلاّیەتیدا، ئاسەوارەکەی بە شێوەیەکی زیانبەخش بەسەر رادیۆو تەلەفزیۆندا شکاوەتەوە. چونکە زۆربەی هاوولاّتییان لە گەلێك لە دەوڵەتانی جیهانی سێهەمدا نەخوێنەوارن‌و گرنگییەکی کەم دەدەن بە گۆڤارو رۆژنامەکان، بەلاّم هەمیشە ئامادەن‌و لە پەیجۆردان بۆ دۆزینەوەی کەم‌و کورتیی رادیۆو تەلەفزیۆنەکان‌و بێژەرەکان، بەردەوام

دەبنە نیشانەی نوکتەو توانج تێگرتنی بیسەرو بینەران، ئەوانەی زانیارییەکی کەمیان هەیە دەربارەی ئەرکی قورسی دەزگاکانی رادیۆو تەلەفزیۆن کە بە بێ ئاراستەیەکی دیاریکراو دەڕۆن بە رێوەو پێویستییان بە ئامێری نوێو شارەزایی هەیە.

نەبوونی ئاراستەیەکی کۆمەڵایەتیو سیاسیی دیاریکراو، پەیوەندیی هەیە بە رێنومایی‌کردنی خراپ لەلایەن سەرکردایەتیی سیاسییەوە. ئێمە بە دڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین کە سەرکردایەتیی سیاسی چ نەتەوەیی یا ناوچەیی زۆر سوورن لەسەر بوونی دەزگای رادیۆو تەلەفزیۆنو سیاسییەکان زۆر باش دەزانن کە بەکارهێنانی رادیۆو تەلەفزیۆن چ گرنگییەکی هەیە بۆ دەسەڵاتەکەیان. دەزگای رادیۆ بە شێوەیەکی ئاسایی یەکەم شوێنە کە هەوڵ دەدرێ دەست بگیرێ بەسەریدا، لە کاتی کودەتاو گۆڕانی دەسەڵاتداو، لەبەر ئەوەی ئەو سەرکردانە بە تەواوی لەوە گەیشتوون کە بەهۆی رادیۆوە چ جۆرە دەسەڵاتێك دەکەوێتە دەستیان، لەبەر ئەوە هەمیشە داوای ئەوە دەکەن کە دەستێکیان هەبێ لە دانانی سیاسەتی کارکردنی رادیۆو تەلەفزیۆندا ئەمەش دیارە کە بەلامانەوە نابێ سەیر بێو دەبێ چاوەڕێی بکەین. بەڵام لەم حاڵەتەدا بێژەر خۆی لەبارێکی قورسدا دەبینێتەوە کاتێك سەرکردایەتیی سیاسی داوای لێدەکا رێگەیەك بگرێتەبەر دژ بە رۆڵی رۆژنامەوانیی راستگۆ کە بریتییە لە بڵاوکردنەوەی زانیاریی وردو ویژدان پەیڕەوکردن لە رێکخستنو بڵاوکردنەوەی هەواڵەکاندا.

سەرکردەی سیاسیی لێزان ئەوە دەزانێ کە ئەگەر داوای کرد لە رادیۆ هەموو کاتێك هەر هەواڵی درۆ بڵاو بکاتەوە، ئەوە گوێگران بە رادیۆکە پێدەکەنو متمانەیان کەم دەبێتەوە بەرامبەر بەوەی رادیۆکە بڵاوی دەکاتەوە. بەڵام ئەگەر دووربین بێ باشتر وایە حەقیقەتو راستی بخرێتە روو و واقیع چۆنە بەو شێوەیە بڵاو بکرێتەوە، رەنگە ئەمە زەحمەت بێ بەڵام هاووڵاتییان کەودەنو گێل نین، ئەوان بە خێرایی مرۆڤی سیاسیی بەدڕەوشت دەدۆزنەوە، بێژەرێ کە گورجوگۆڵ نەبێ، لەبەر ئەوەی پاشکۆی دەوڵەتەو هەر بە دڵی دەوڵەت قسە دەکاتو شت بڵاو دەکاتەوە.

شتێکی لەم بابەتە بەم دواییە لە ئەفریقیا رووی دا، کە بریتی بوو لەوەی هەندێ لە سەرکردەکانی وڵاتێك رازی نەبوون بەوەی لە رادیۆدا رایبگەیەنن کە (ئایدز) بڵاو بووەتەوە لەو وڵاتەدا. دیارە ئینکارکردنی بوونی ئەو نەخۆشییە، کێشەکە لەناو نابا، بەڵام کارمەندانی



هۆکانی راگەیاندن دەستیان بەستراوە بەهۆی چەند بڕیارێکی سیاسییەوە کە کێشەی ئایدز دەبێ بخرێتە پشتگوێو باسی نەکرێو خەڵك ئاگادار نەکرێنەوە لە مەترسیی ئەو نەخۆشییە. بەڵام خۆشبەختانە، رێکخراوی تەندروستیی جیهانیو چەند حکومەتێکی تر دەستیان کرد بە بەرەنگاربوونەوەی ئەو کێشەیە.

دەتوانرێ بگوترێ لەگەڵ ئەوەشدا گەورەترین کێشەیەك کە رووبەڕووی بێژەران دەبێتەوە بەهۆی بارودۆخی سیاسییەوەیە، لەبەر ئەوە سەرکردایەتیی دەزگای راگەیاندن دەبێ پلەیەکی بەرزی هەبێ لە لووتکەی قەوارەی دەوڵەتدا بۆ ئەوەی رۆڵێکی هەبێ لە داڕشتنی سیاسەتی راگەیاندندا. لەگەڵ ئەوەشدا کە بەکارهێنانی هۆکانی راگەیاندن بۆ دەربڕینی بیروبۆچوونی دەوڵەت لەسەر رووداوەکان شتێکی پێویستە لە زۆربەی دەوڵەتانی جیهانی سێهەمدا، بەڵام ئەو هۆیانە نابێ لە رێگەی راستی خۆیان لابدەن لەپێناوی جێبەجێکردنی چەند مەبەستو سوودێکی تایبەتی ئەو کەسە گەندەڵانەی کە لەسەر کورسیی دەسەڵاتن.

### هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ سەرکردایەتیی سیاسیدا

تەنیا ئەوانەی نەفامن دەتوانن بە رێڕەوێکدا بڕۆن دژی دەسەڵات بێ. پێش هەرشتێك مانەوەی مرۆڤ پێویستە، بەڵام لە گەلێك لە دەوڵەتاندا شێوازو رێگەی تایبەت هەیە بۆ هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ سەرکردایەتیی سیاسیدا، ئەگەر ئەو وڵاتانەی لێدەربکەین کە سیستمێکی توندوتیژو فاشستییانە پەیڕەوی دەکەن، لە وڵاتانی تردا هەندێ نەرمی نواندن هەیەو توانای ئەوە هەیە رێگەیەك هەڵبژێردرێ بۆ ئەوەی هۆکانی راگەیاندن بیگرنەبەر، بۆ نموونە زۆرجار دەتوانرێ سەرکردایەتیی سیاسی بهێنرێتە سەر ئەو باوەڕەی کە کارکردن بە شێوازێکی تایبەت لە بەرژەوەندیی حکومەتدایە — زۆرجاریش هەروایە —، ئەگەر تۆ بتوانی بیروبۆچوونەکانی خۆت بە شێوەیەکی جوانو شارەزایانە بخەیتە روو، بە بێ ئەوەی مەترسیی تێدابێ بۆ ئەوانە لەسەر کورسیی دەسەڵاتن، ئەوا، ئەوانە بە جۆرێك لەو بیروبۆچوونانە ورد دەبنەوە، وەك ئەوەی هی خۆیان بێ. هەندێك لە بێژەران شانسێکی باشیان هەبوو کە بەرنامەیەکی رەخنەگرانەیان پێشکەش دەکردو گرنگییان دەدا بە کێشە نەتەوەییەکان بە بێ ئەوەی تاوانی کێشەکان بخەنە ئەستۆی سەرکردایەتیی سیاسیی دەسەڵاتدار.

چەند کێشەیەکی زۆری تر هەن لە خودی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیو سیاسیی وڵاتەکەدا کە دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمی دەسەڵاتی ئیمپریالیزم. دەتوانرێ ئەو کێشانە گرنگییان پێبدرێو باس بکرێن بە بێ ئەوەی پەنجەی تاوانباریو تۆمەت رابکێشرێ بۆ ئەو سیستمە سیاسییەی ئێستا دەسەڵاتی بەدەستە. هەروا دەکرێ هەندێ جار گفتوگۆ بکرێ لەسەر کێشەیەك کە تایبەتە بە دەوڵەتێکی دراوسێوە لە چوارچێوەی بابەتێکی رۆشنبیریدا، زۆرجاریش خودی ئەو کێشەیەی باس دەکرێ هاوبەشە لە نێوان ئەو دوو وڵاتەداو گوێگرانو بینەران خۆیان دەتوانن بەراوردی بکەن لەگەڵ بارودۆخی ناوخۆدا بە بێ ئەوەی بابەتەکە بە ئاشکرا بخرێتە روو، ئەم شێوازە پێچوپەنادارە وەنەبێ شێوازێکی زۆر باش بێو خەڵك لێی رازی بن، بەڵام لەتە نانێکت دەستکەوێ باشترە لەوەی هیچت دەستنەکەوێ.

**هەندێ کێشەی تر:**

لەنێو ئەو کێشانەدا کە کاریگەرییەکی خراپیان هەیە بە تایبەت لەسەر ئەو رادیۆیانەی ئاراستەی هەندێ ناوچەی دواکەوتوو دەکرێن، کێشەی گەیشتنی دەنگی ئەو رادیۆیانەیە بۆ دانیشتوانی ئەو ناوچانە. گەلێك لەو وڵاتانەی کە لە باری جوگرافییەوە، شاخوداخو بەرزیو نشێوییان تێدایە بە ئاسانی دەنگی رادیۆکانیان بۆ وەرناگیرێ، هەندێ وڵاتی تر هەن کە دانیشتوانیان پەرتوبڵاو بوونەتەوە بەسەر چەند ناوچەیەکی لەیەك دابڕاودا وەك ئەندنووسیا کە بە دەیان دوورگەی گرتووەتە خۆو بڵاوبوونەتەوە بەسەر پانتاییەکی بەربڵاودا.

ئەم کێشانە بە چەند جۆری جیاواز بەریان لێدەگیرێ، ئەگەر بشتوانرێ، بۆ نموونە لە وڵاتێکی وەك (بابوا کینیا)، کێشەی ئەم گوندە دابڕاوانە کە چەند شاخی بەرز هەر چوارلایان گرتوون، بەوە چار کراوە، پەیڕەوی سیستمی ئەو ئیستگانە بکەن کە پەخشەکانیان لەسەر شەپۆلی بەرز بڵاو دەکەنەوە لەسەر ئاستی ناوچەکانو پاشان پەخشەکە لە رێگەی مانگە دەسکردەکانەوە بڵاو دەکرێتەوە بە شێوەیەکی کاریگەر لەو دەوڵەتانەدا کە بەرزونزمیی زەوی دەبێتە رێگر لە بەردەم وەرگرتنی دەنگی رادیۆدا.

پرۆژەیەکی تازە هەیە بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ ناوچە گوندنشینەکاندا لە رێگەی بەکارهێنانی مانگی دەسکردەوە بۆ گەیشتنی دەنگی رادیۆ بۆ ناوچە دارستانە دوورەکان لە وڵاتی (پیرۆ)دا. پیرۆ رێوشوێنێکی گرتووەتە بەر بۆ پێشخستنی ئەو ناوچانە کە لە پاشەڕۆژدا



دەبنە سەرچاوەی بەرهەمهێنانی دانەوێڵە کە خەڵك نیشتەجێ دەبن تیایاندا. (کۆمپانیای پەیوەندیی تەلدارو بێتەلی نیشتمانی) لە پیرۆ بە هاوکاری لەگەڵ (ئاژانسی ئەمریکی بۆ گەشەپێدانی نێودەوڵەتی)، خەریکی ئەم پرۆژەیەن کە گەلێك لە ناوچەکانی ئەو وڵاتە دەبەستێتەوە بە (لیما)ی پایتەختو چەند ناوچەیەکی ترەوە. ئەم پرۆژەیە ئێستا لە بواری پەیوەندیکردندایە بەهۆی تەلەفۆنەوە. بەڵام چەندەها ئامێری تری پەخشکردن، بۆ گواستنەوەو پەیوەندیکردن، مانگی دەسکرد بەکار دێنن، بۆ ئەوەی چاڵوچۆڵیو بەرزونزمیو دووریی مەوداکانو هانی هانی دانان لەسەر پەخش نەبنە کۆسپ لە رێگەیاندا. چەند دەوڵەتێکی زۆریش هەن کە مانگە دەسکردەکانی خۆیان یا هی ناوچەیی، یا نێودەوڵەتی بەکار دێنن، هەروەها خەرجیو تێچووی بەشداریکردن لە مانگی دەسکرددا بەردەوام روو لە کەمبوونەوەیە.

زۆربەی دەوڵەتانی جیهانی سێهەم، بۆ پەیوەستکردنی ناوچە دوورەکان بەیەکەوە پشت بە ئیستگە ئاسمانییەکان دەبەستن، لەگەڵ ئەوەدا کە ئەم جۆرە ئیستگانە مەبەستەکان دێننەدی، بەڵام هەندێ جار شەپۆلەکانیان تووشی ئاڵۆزیو ناڕوونی دەبن بەهۆی هەورەتریشقەو ئەو گۆڕانانەی دێن بەسەر باری کەشو هەندێ هۆی تردا. هەندێ لە دەوڵەتان پەنا دەبەنە بەر بەکارهێنانی ئەو ئیستگانەی لەسەر شەپۆلی F.M بڵاو دەکەنەوە وەك چارەیەك هەرچەندە نرخەکانیان زۆر گرانە.

## نەزانینی پێداویستیی ئەو جەماوەرەی قسەیان بۆ دەکەی

لەنێو ئەو کێشە بڵاوانەی رووبەڕووی ئەو بێژەرانە دەبێتەوە کە بەرنامەکانیان ئاراستەی ناوچە گوندنشینەکان دەکەن، نەزانینو ناشارەزاییە لە پێداویستیی ئەو جەماوەرەی کە قسەیان لەگەڵ دەکەن. بێژەر پێویستە لەسەری دەنگی خۆی بگەیەنێتە ناوچە گوندنشینەکان بە بێ ئەوەی پێشتر باسێکی کردبێ لەسەر ئەو بابەتانەی دانیشتوانی لادێکان حەزی لێدەکەن یاخود رقیان لێیەتیو بەدڵیان نییە، یا لەسەر پێداویستیو داخوازییەکانیان.

لێکۆڵەرەوەکانی وڵاتە پێشکەوتووەکان هەمیشە رەخنە دەگرن لەو نەزانیو ناشارەزاییەی ئەو بێژەرانەی بەرنامە ئاراستەی ناوچە گوندنشینەکان دەکەن سەبارەت بەو جەماوەرەی لەگەڵیان دەدوێن، بەڵام رەخنەگرتن کارێکی ئاسانە، چونکە زانینو شارەزابوون لە پێداویستیو

داخوازیی دانیشتوانێکی پەرت‌و بڵاو، کارێکی زۆر قورس‌و گرانە، بە تایبەت کە ئەو دانیشتوانە زۆر دووربن لەیەکەوەو شتێکی کەم نەبێ خوێنەوارییان نییە، تەنانەت ئەگەر بتەوێ بۆ ئەوەی زانیاری پەیدا بکەی لەوانەوەو پەنابەریتە بەر شێوازە نوێیەکان بۆ رووپێویی ناوچەکان، ئەوا زۆربەی ئەوانەی پەیوەندییان پێوە دەکەی‌و دەتەوێ زانیارییان لێوەرگری دەکەونە گومانەوە لێت‌و وەڵامت نادەنەوە.

ئەم هەڵوێستەی ئەوانە شتێکی ئاساییە، ئەگەر ئێمە ئەوەمان لە بەرچاو بێ کە زۆربەی کارمەندانی دەوڵەت لەوانەی رێیان دەکەوێتە ئەو ناوچانە بۆ کۆکردنەوەی باج‌و سەرانەیە لەو خەڵکە، یا بۆ ناچارکردنیانە لەسەر ئەنجامدانی کارێك کە خۆیان نایانەوێ بیکەن. پێویستە بۆ نەهێشتنی ئەو گومان‌و ترسە هەندێ کەسی وا بدۆزیتەوە کە راپرسییەك بکەن ئایا دەتوانن متمانەی دانیشتوانی ناوچە گوندنشینەکان بەدەست بێنن، چونکە کارێکی راست‌و باش نییە، کادرێکی دەرچووی زانکۆ لە ناوچەیەکی شارییەوە بنێری بۆ ناوچەیەکی گوندنشین‌و بەتەمای ئەوە بیت زانیارییەکی راست‌و دروستت بۆ کۆ بکاتەوە.

دانیشتوانی ناوچە گوندنشینەکان بە خێرایی هەست دەکەن بەو هاوسۆزییەی کارمەندانی رادیۆ دەریدەبڕن لەگەڵیاندا، چونکە زۆربەی کارمەندانی دەوڵەت کە خوێنەوارییەکی باشیان هەیە بە لووتبەرزییەوە سەیری دانیشتوانی ناوچە گوندنشینەکان دەکەن کە خوێنەوارییەکی کەمیان هەیە.. ئەوانە نەخوێنەواری‌و کەودەنی لەیەك جیا ناکەنەوە، بەڵام لە راستیدا جوتیارو شوانەکان لە زۆر حاڵەتدا گەلێك زیرەکن، ئەگەر وانەبوونایە نەیاندەتوانی سەرکەون بەسەر کێشەی وشکە ساڵی‌و نەخۆشی‌و نەبوونی‌و پشتگوێخستنیان لەلایەنی دەوڵەتەوە.

سەبارەت بە هەندێ لەوانەی کاردەکەن لە بواری رادیۆدا، جۆرە هەستێکیان لایە کە ئەوانە خۆیان لە چینێکی هەڵبژێردراوی تایبەت دادەنێن‌و جیاوازن لە جەماوەر. هەروەها هەندێ جار، بیروبۆچوونی پیاوی شاری دەربارەی ئەو شتانەی سوودمەندن بۆ گوێگرێکی لادێیی، بە هەڵە دەردەچن. پێویستە بۆ تۆ ئەگەر لەو بوارەدا کاردەکەیت پەیوەندیت هەبێ بە هەندێ جوتیارەوە بۆ ئەوەی بزانی ئەوان پێویستییان بە چییە.

کێشەیەکی تر هەیە رووبەڕووی ئەو بێژەرانە دەبێتەوە کە رادیۆکانیان ئاراستەی ناوچە گوندنشینەکان دەکەن، ئەویش بریتییە لەوەی گوێگرە گوندنشینەکان بە زەحمەت دەتوانن



گوزارش بدەن لەوەی دەیانەوێ‌و پێویستیان پێیەتی لە بەرنامەکانی رادیۆ، چونکە کەسێك نییە ئەوانە رێنومایی بکات‌و، بۆ ئەوان زەحمەتە شتێك بێ بە خەیاڵیاندا جگە لەوەی خۆیان دەیزانن. ئەمە ئەو بوارەیە کە بەرپرسییەتییەکەی دەکەوێتە سەرشانی ئەو کارمەندانەی راهێنانێکی باش راهێنراون، چونکە پێویستە لەسەریان بەراوردی ئەو زانیارییانە بکەن کە لە گوێگرەکانیانەوە بەدەستی دەهێنن سەبارەت بە پێداویستییەکانیان، لەگەڵ ئەو هەوڵە نوێ‌و داهێنراوانەیەی دەدرێ لە ئامادەکردنی ئەو بەرنامانەی لە بابەتێکی نوێ دەکۆڵنەوە، هەندێ جار تاکە رێگە بۆ گەیشتن بەو ئامانجە، هەوڵدانەو دواتر بەراوردکردنی ئەنجامەکانە لە رێگەی لێکۆڵینەوەو ئەنجامدانی چاوپێکەوتن لەگەڵ گوێگراندا‌و داوالێکردنیان کە نامەو داخوازییەکانیان بنێرن بۆ رادیۆو هۆکانی تری راگەیاندن... هتد.

## گۆڕینی نەریتە کۆنەکان

سەرپەرشتیارو بێژەرانی رادیۆکان، بە بەردەوامی ئەو ئەرکەیان لەسەرشانە کە هەوڵ بدەن، جووتیارەکان رازی بکەن کە روو بکەنە شێوازی نوێ لە کشتوکاڵدا‌و رێگەی نوێ بگرنەبەر بۆ ژیان. تاقیکردنەوەکان ئەوەیان سەلماندووە کە تەنیا بە ئاراستەکردنی پەیام بۆ گۆڕان وەك ئامۆژگاریکردن‌و رێنومایی لە رێگەی هۆکانی راگەیاندنی جەماوەرییەوە، بەس نییە بۆ ئەوەی جوتیار رازی بکەن بەوەی نەریتی کۆنیان بگۆڕن‌و روو بکەنە چاندنی جۆرە نوێیەکانی بەروبووم، یا پابەندبوون بە شێوەیەکی توندوتۆڵ بە یاساکانی تەندروستیی گشتی‌و گوێگرتن بۆ ئەو ئامۆژگارییانەی ئاراستە دەکرێ بۆیان.

رادیۆو تەلەفزیۆن بە تەنیا خۆیان توانای ئەوەیان نییە خەڵك وا لێبکەن کە بیروبۆچوون‌و دابونەریتی خۆیان بگۆڕن... هتد، بەڵکو پێویستە زانیارییەکی وایان پێشکەش بکرێ کە بە ئاسانی لێی تێبگەن، جگە لەوەی بوار بدرێ بە گوێگران بۆ گفتوگۆکردن لەسەر ئەو زانیارییانەو وروژاندنی مشتومڕو وەرگرتنی بڕیار لەسەریان.

بۆ نموونە: هیندستان چەندین سیمینارو کۆبوونەوەی بەکارهێناوە بۆ گوێگرانی ناوچە گوندنشینەکان بۆ ئەوەی زانیاریی سەرەکی بەدەست بێنن لەسەر رادیۆو تەلەفزیۆن‌و بەرنامەکانیان‌و دواتر دەستدەکەن بە گفتوگۆ لەسەر ئەو بابەتانە لەناو خۆیاندا، بە ئامادەبوونی

چەند پسپۆرێکی بواری کشتوکاڵ کە دەتوانن هەندێ یارمەتییان بدەن. زۆرجار بێژەرانو سەرپەرشتیارانی رادیۆو تەلەفزیۆن وا بۆی دەچن کە رەتکردنەوەی گوێگرە گوندنشینەکان بۆ گۆڕینی شێوازی کارکردنیان لە کشتوکاڵدا دەگەڕێتەوە بۆ کەللەڕەقیی ئەوان لە بیروبۆچوونیاندا لەسەر مەسەلەکان، بەڵام جوتیار یا شوان لە حەقیقەتدا دەبێ ئەو ئامۆژگارییانە لێکبدەنەوەو بە وردی هەڵیسەنگێنن، چونکە ئەوان زۆرجار خۆیان بە راست دەزانن‌و پێیان وانییە کە هەڵە بکەن. ئەگەر جوتیارێك بڕیاری دا کە جۆرێکی نوێی گژوگیا بچێنێ بۆ لەوەڕی مەڕوماڵاتەکانی دەبێ دڵنیا بێ لەوەی کە بەرهەمی ئەم گژوگیایە زۆرتر دەبێ لەوەی جارانی چونکە ئەو باوەڕی تەواوی بەوە هەیە کە کەس فریای ناکەوێ‌و ئاژەڵەکانی بەخێو ناکا ئەگەر خۆی بە هەڵەدا چوو لەم بارەیەوە.

لە هەندێ لە کۆمەڵگەکاندا، جوتیارەکان زۆر بە سستی روو دەکەنە بەکارهێنانی ئامێری نوێ کە دەبێتە هۆی جیاوازی‌و دوورخستنەوەیان لە دراوسێ‌و دۆستەکانی تریان، واتە ئەگەر یەکێك لەوانە باری ژیانی باشتر بوو لە دراوسێکەی ئەوە مەترسیدارەو رەنگە ببێتە هۆی ئەوەی ئەوانی تر بەغیلی‌و ئیرەیی پێببەرن کە چۆن ئەو سەرکەوتووەو ئەوانی تر تووشی شکست هاتوون، جوتیاری هۆشمەند خۆی ئەمە دەزانێ. هەروەها هەندێ کۆمەڵگەی تر هەن باوەڕیان بەو بیرۆکەیەیە کە دەڵێ "خێرو خۆشی بەشی ئەوە دەکا دابەش بکرێ بەسەر هەمواندا"، ئەم بیرۆکەیەش ئەوە دەگەیەنێ کە سامانێکی زۆر هەیە دەکرێ بیکەی بە هی خۆت‌و دەستی بەسەردا بگری، ئەگەر تۆ دەوڵەمەند بوویت دەبێ کەسێکی تر هەژار ببێ بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو دەوڵەمەندییەی تۆ. ئەگەر بەروبوومەکەی تۆ، زۆری بڕی‌و هی خەڵکی تر وانەبوو، ئەوە مانای ئەوەیە خێرەکە بەر تۆ کەوتووەو دەبێ ئەوانی تر تووشی هەژاری بن بەهۆی ئەوەوە.

هەندێ جار پەیڕەویکردنی ئەم بیرۆکەیە وا لە دانیشتوانی گوندەکان دەکا کە زۆر بە سستی روو بکەنە بەکارهێنانی ئامێری نوێ‌و شێوازی نوێ چونکە ئەوان دەزانن کە پێویستە لەسەریان هەر بمێننەوە لە گوندەکەیانداو رووبەڕووی ئەوانە ببنەوە کە هەر لەسەر شێوازی کۆن دەمێننەوە، یا خود بەختیان نایهێنێ وەك ئەوان.

هەندێ لەو بەرنامانەی تایبەتن بە گوندنشینەکانەوە، رۆڵێکی باشیان هەیە لەوەدا جوتیارەکان رازی بکەن بە هاوبەشیکردن لەو سیمینارانەدا کە ساز دەکرێن بۆ گفتوگۆو



ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕا، یا ئەو بەرنامانەی کە راستەوخۆ لە رادیۆوە بڵاو دەکرێنەوەو تیایاندا گفتوگۆ دەکرێ لەسەر پێداویستی‌و کێشەکانیان. گەلێك لە کۆنەپارێزی دانیشتوانی گوندەکان هاوبەشی ناکەن لەو سیمینارو بەرنامانەدا، لەبەر ئەوە ئامادەکردنی ئەو جۆرە بەرنامانە پشوودرێژیی دەوێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گوێگرانێکی زۆر رادەکێشن بەلای خۆیاندا. لەگەڵ ئەو گوێگرانەی بەشداری دەکەن دەبێ کارمەندانی رادیۆ لە کاری بەردەوامدا بن‌و کۆڵ نەدەن، ئەمە شتێکی پێویستە بۆ سەرکەوتن بەسەر ئەو شەرم‌و پڕکێشی نەکردنەدا.

لە هەندێ وڵاتدا، پێویستی هەیە بۆ بەکارهێنانی رادیۆ بە مەبەستی ئاراستەکردن‌و ناردنی نامە لە ناوچە گوندنشینەکاندا. لە هەر شوێنێکدا ئەم حاڵەتە هەبێ، ئەوا گوێگرەکان تێکەڵ دەبن لەگەڵ ئیستگەکەداو ئامێری رادیۆ دەبێ بە شتێك ناتوانن دەسبەرداری بن، بۆ نموونە لە گواتیمالا، چەندین ئیستگەی رادیۆ دانراون بە تایبەت بۆ گواستنەوەو گەیاندنی نامە لە ناوچە گوندنشینەکانەوە بۆ کەسەوکاریان لە شارەکانداو بە پێچەوانەوە. هەروەها ئاگاداری بڵاو دەکرێتەوە لەسەر میهرەجان‌و ئاهەنگی جەژنی لەدایکبوون‌و نەخۆشی‌و مردن بەهۆی ئەو رادیۆیانەوە. بە راستی ئەم جۆرە ئیستگانە بوون بە (رۆژنامەی هەوایی). پاش ئەوەش ئەم جۆرە ئیستگانە دەتوانن نامە بنێرن بۆ گوێگران‌و هانیان بدەن بۆ گۆڕان‌و سوودوەرگرتن لە ئامێرو شێوازی نوێ لە بواری کشتوکاڵدا، چونکە بوون بە دۆستی گوێگرەکانیان.

لەبەر ئەوەی تەلەفزیۆن لە زۆر وڵاتدا باڵادەستە بەسەر رادیۆدا، ئەو تایبەتمەندییەی جارانی رادیۆ خراوەتە پشتگوێ، بەڵام رادیۆ دەتوانرێ بەکاربهێنرێ بۆ بەرهەمهێنانی بواری رۆشنبیری، بە بەکارهێنانی بابەتی شانۆگەریی گونجاوو مۆسیقاو نواندنی باش بە مەبەستی بەسەربردنی کات‌و جێگیرکردنی بەها کۆمەڵایەتییەکان. لە زۆرێك لە دەوڵەتاندا ماوەیەکی کەم تەرخان دەکرێ بۆ بەرنامەی گوندنشینان لەچاو تێکڕای ئەو ماوەیەدا کە شتی تێدا بڵاو دەکرێتەوە، چونکە لە سەدا دەی ماوەکە کەمترە. رەنگە بتوانرێ ماوەیەکی زۆرتر تەرخان بکرێ بۆ بەرنامە رۆشنبیرییەکان لەسەر باسکردنی کێشەیەکی دیاریکراو.

بۆ نموونە: ئیستگەیەکی رادیۆ بەرنامەیەکی رۆشنبیریی بڵاو کردەوە لەسەر ئاسەوارو ئەنجامی لابردنی دارستان‌و جەنگەڵەکان لە هەندێ ناوچەی گواتیمالادا، بۆ بەر بەرەڵاکردن لە بەردەم بەخێوکردنی گاگەلدا، بۆ ئەوەی پاشتر بفرۆشرێن بە کۆمپانیایەك بۆ دروستکردنی

خواردەمەنیی سەرپێیی (هەمبەرگەر) لە ئەمریکای باکووردا، کە ئەویش چەندان ملیۆن هەمبەرگەری لە گۆشتی ئەو گایانە دروست کردو فرۆشتنی، لە ئەنجامدا لە ماوەیەکی کەمدا پارەیەکی زۆر چووە گیرفانی خاوەن دارستانەکانەوە، بەڵام هەر تەنیا دوای دوو سێ ساڵێك زەوییەکە پیتی نەماو بەکەڵکی هیچ نەدەهاتو خەڵکی ناوچەکە لە جاران داماوتر کەوتن، ئەو بەرنامەیە ئاماژەی بەم ئەنجامە خراپە کردبوو، بەڵام ئەوەی جێی داخە ئەو بەرنامەیە لەلایەن رادیۆیەکی ئەمریکاییەوە ئامادە کرابوو نەك رادیۆیەکی گواتیمالا، دەکرا یەکێك لە رادیۆ ناوچەییەکان ئەو بەرنامەیەی بەرهەم بهێنایەو بڵاوی بکردایەتەوە ئەگەر باری سیاسی رێگەی پێبدایە.

لە کۆتاییشدا، شارەزایی لەسەر ناوچە گوندنشینەکانو خۆراهێنان لەگەڵ ژیانی ئەو ناوچانەدا کارێکی پێویستە بۆ یەکێك بیەوێ بەرنامەیەکی لەو جۆرە بەرهەم بهێنێ.

هەوڵو ماندووبوون لەسەر راهێنان:

لە گفتوگۆکردندا لەگەڵ بەڕێوەبەرانی ئیستگەکانو کەسانێکی تر لە بەرپرسانی رادیۆی وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان، بۆم دەرکەوت کە پێویستیی راهێنان بەشێکی زۆری لەو گفتوگۆیانە بەردەکەوێت. ئەوانەی کاردەکەن لە بواری رادیۆدا — وەك هەموو ئەوانەی لە هۆکانی راگەیاندنی جەماوەریدا کار دەکەن —، زۆرجاران لە راهێنانێکی کەم زیاتر، هیچیان نەدیوە.

لەگەڵ ئەوەدا، حکومەتەکانو تاقمە بیانییەکان، رەوتێکی نوێیان گرتووەتەبەر. بۆ فەراهەمکردنی بواری راهێنان لە بەردەم بێژەراندا لە دەرەوەی وڵات، هەندێ جار ئەمە بە شێوەیەکی باش ئەنجام دەدرێ، بەڵام هەندێ کۆسپ دێنە رێگە کە دەبێ خۆمانیان لێبپارێزین، ئەمەش بەهۆی ئەوەوەیە کە ئەو راهێنانەی دەرەوەی وڵات هەندێ جار ناگونجێ لەگەڵ بارودۆخی وڵاتانی جیهانی سێهەمدا. ئەو بێژەرەی کە دێت بۆ خولی راهێنانو لە ئیستگەیەکی بێکەڵکدا پێشتر کاری کردووە، لەناکاو تووشی سەرسوڕمان دەبێ کە چاوی دەکەوێ بە ژمارەیەکی زۆر لە ئامێری پێشکەوتووی گرانبەها رەنگە تا ئەو کاتە لە وڵاتەکەی خۆیدا شتی وای نەدیبێ، ئەمەش تووشی نائومێدیی دەکا کاتێك دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی، ئەم بێژەرە بەهۆی ئەو بەرنامانەوە کە پێویستییان بە سەرچاوەیەکی دارایی زیاتر هەیە لە توانای ئیستگەکە، سەری لێتێکدەچێو کارەکان بە چاکی ئەنجام نادا.



کێشەیەکی گرنگی تر هەیە بۆ ئەو ئیستگانەی کارمەندەکانی خۆیان دەنێرنە دەرەوەی وڵات بۆ راهێنان، تەنانەت ئەگەر یارمەتیی داراییش بدرێن، کێشەکەش ئەوەیە، دابڕانی ئەو کارمەندە سەرەکییانە بۆ ماوەیەکی درێژ، کارەکە قورستر دەکا بۆ ئەوانەی دەمێننەوەو لەبری ئەوان کار دەکەن. کێشەیەکی تریش هەیە سەبارەت بە هەندێ بەرنامەی راهێنان لە دەرەوە، ئەوانەی سەرپەرشتیی راهێنانەکە دەکەن، هاوسۆز نین لەگەڵ ئەو بێژەرانەدا کە لە دەوڵەتە تازەپێگەیشتووەکانەوە دێن، چونکە هەندێکیان لووتبەرزی دەنوێننو تەنگەتاو دەبن لە پرسیاری ئەو بێژەرانە کە هەندێکیان وەك ئەلفوبێی پیشەکە وانو دەبێ بزانرێن.

پەندێکی چینی هەیە دەڵێ: "ئەو کەسەی پرسیارێکی گەمژانە دەکا، بۆ ماوەی یەك خولەك گەمژەیە، بەڵام ئەوەی پرسیار ناکات تا ماوە هەر بە گەمژەیی دەمێنێتەوە". ئەوانەی سەرپەرشتیی بەرنامەی راهێنان دەکەن دەبێ ئەوەیان لە بەرچاو بێو دان بگرن بە خۆیاندا کاتێك ئەو جۆرە پرسیارانەیان لێدەکرێ.

## کێشەکانی لاساییکردنەوە

هەندێ جار ئەوانەی کە خولی راهێنان دەبیننو دەگەڕێنەوە وڵاتەکەی خۆیان، دەست دەکەن بە لاساییکردنەوەی رادیۆکانی ئەو وڵاتە بێگانانە کە بۆ دەوڵەتە تازەپێگەیشتووەکان ناگونجێن. لاساییکردنەوەی کوێرانەی ئامێرەکانی راگەیاندنی بیانییەکان زیانبەخشە بە کەسیەتیی بێژەر لە دەوڵەتانێکدا خاوەنی سەروەریی خۆیان بن.

هەندێك بەرنامەش هەن بۆ راهێنان، کە رۆتینی نینو سروشتێکی کردارییان هەیەو پێویستیی ئەو خوێندکارانە لە بەرچاو دەگرن کە لە وڵاتانی ئاسیاو ئەفریقیاو ئەمریکای لاتینەوە دەچن بۆ راهێنان. سەنتەری لێکۆڵینەوەو راهێنانی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان، کە سەر بە کۆلێژی رۆژنامەوانیی زانکۆی جۆرجیای ئەمریکییە، بە شێوەیەکی ئەکادیمییانە کارەکانی ئەنجام دەدا. هەروەها مامۆستاکانی ئەو سەنتەرە شارەزاییەکی فراوانیان هەیە لە بوارەکەدا. ئەو سەنتەرە دەتوانێ بەرنامەی تایبەت دابنێ بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو حاڵەتانەی لە کاتی راهێناندا تووشی دەبن. ئەم جۆرە بەرنامانە بە شێوەیەکی ئەکادیمییانە دانەنراون، بەڵکو بەرنامەگەلێکن بۆ فێرکردنی گەورەکانو بڕوانامە دەدا بەوانەی کار دەکەن لە بواری

راگەیاندندا. ئەم بەرنامانەش کە دادەنرێن ئەوە لە بەرچاو دەگرن کە تێچوو و خەرجیی راهێنانەکە کەم بێتو کاتەکەش کەم بکەنەوە.

لە هەندێ حاڵەتدا، بەرنامەی ئەو سەنتەرە دەخوێندرێ بۆ خوێندکارەکان بەهۆی تاقمێکەوە کە پێکهاتووە لە دوو یا سێ کەسی وانەبێژ، خۆیان دەچن بۆ ئەو وڵاتەی خوێندکارەکانی لێیە بۆ ئەوەی لەوێدا وانەیان پێبڵێنو رایانبێنن لەسەر کارکردن لە رادیۆدا. زۆرجار ئەم شێوازە هەرزانتر دەکەوێ لەوەی کارمەندەکانی بواری راگەیاندن بنێرن بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ئەم تاقمی راهێنانە لەسەر ئەو ئامێرانە کاردەکەن کە لە وڵاتەکەدا هەیەو هەوڵ دەدەن لە بواری راهێنانەکەدا جۆرە گونجاندنێك دروست بکەن بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی کۆسپ دانان لە بەردەم کاری رادیۆکەدا، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە خوێندکارەکان بچنە دەرەوەی وڵات بۆ راهێنان کە رادیۆکە کارمەندی وای نامێنێ کارەکە بەرن بەرێوە. ئەم خولانەی راهێنانە کە چڕوپڕو نموونەییەنو گرنگی دەدەن بە زانیارییە سەرەکییەکان، لە هەفتەیەکەوە تا چەند مانگ دەخایەنن.

ئەم سەنتەرە کار دەکات بە هاوکاری لەگەڵ رێکخراوە حکومەتییەکانو دەزگا تایبەتەکان، دەستە پیشەییەکان، سەندیکاکانی کرێکارانو تاقمە رۆژنامەنووسەکان. هەروەها چەند تاقمێکی تری راهێنان هەن لەسەر کاری رادیۆ لە ناوچەکاندا، جگە لەوەی زۆر رێکخراو هەن لە ئەمریکاو بەریتانیادا ئامادەن بۆ کارکردنو یارمەتیدانی ئەو کارمەندو بێژەرانەی وڵاتە تازەپێگەیشتووەکان کە پێویستییان بە راهێنانە.

شێوازەکانی بیرکردنەوە:

بواری بەکارهێنانی ئامێرو کەرەستەکان بە لێهاتوویی و سەرکەوتووانە وەنەبێ گرنگترین بواری راهێنانی کارمەندانی رادیۆ بن، راستە ئەم بوارە بە بێگومان گرنگە، بەڵام دەبێ گرنگیی بەردەوام بدرێ بەو لایەنە ناتەواوانە کە زیاتر گرنگترن. ئەمانەش وەك: باشکردنی توانا بنەڕەتییەکان بۆ بەسەرکردنەوەو بەدواداچوونی هەواڵ، جۆشدانی توانا بۆ دەسکەوتنی زانیاری، چۆنیەتیی ئەنجامدانی چاوپێکەوتنو چۆنیەتیی بەدەستهێنانی بیروبۆچوونو بەرنامەی نوێ. ئەمانەش هیچیان ئامێری تەکنۆلۆژیای گرانبەهایان پێویست نییە.



لە بابەتێکدا کە (ساڵح حەسەن) لە رۆژنامەی (ئەنتەرناشناڵ جورناڵ)دا نووسیبووی لە ساڵی ١٩٨٦دا، دەربارەی کێشەکانی راهێنان سەبارەت بە کارمەندانی بواری رادیۆ لە کیشوەری ئاسیا، ئەو شێوازانەی راهێنان کە باسی کردووە لە نووسینەکەیدا، راهێنانی پێش دەستبەکاربوونە بۆ ئەنجامدانی کارەکەیان بە شێوەیەکی باش لەگەڵ راهێنانی ئەکادیمییانەو پیشەیی لە کاتی ئەنجامدانی ئەرکەکەی.

هەروەها (ساڵح حەسەن) ئاماژە بەوە دەکا کە راهێنان بۆ کارمەندان کارێکی باشە بە تایبەتیو دەبێ ئەم ئەرکانەی خوارەوە بهێنێتە دی:

١) هاندان بۆ کرانەوەی مێشكو نەهێشتنی هەڵسوکەوتی خراپ.
٢) فەراهەمکردنی ئاسوودەیی بۆ کارمەندان.
٣) هاندانی بیروبۆچوونی نوێو نوێکردنەوەی شارەزایی کۆن.
٤) برەوپێدان بەو رەوتو بیرۆکەیەی کە دەڵێ کارکردن لە بواری رادیۆدا پیشەیەکی گرنگەو پێویستیی بە لێهاتوویی و گرنگیدانێکی زۆر هەیە.
٥) هەڵو بوار برەخسێنی بۆ رەخنە لەخۆگرتن بە شێوەیەکی بنیاتنەر.
٦) ئەوە بخرێتە مێشکی کارمەندانی نوێ کە هیچ نازانن دەربارەی کارکردن لە بواری رادیۆدا.
٧) گواستنەوەی زانیاریو ئەزموونی کار لەوانەوەی خولی راهێنانیان بینیوە بۆ ئەوانەی پلەی زانیاریو ئەزموونیان کەمترە.
٨) فەراهەمکردنی سەرچاوەی بەردەوام بۆ پەیوەندیکردن بەوانەوە کە لە پیشەکەدا کاردەکەنو ئەزموونیان هەیە.
٩) دابینکردنو هێنانی ئامێرو کەرەستەی نوێ.
١٠) دابینکردنی شوێن بۆ کۆبوونەوەو گفتوگۆکردن لەبارەی کارەکانیانەوە.

دەبێ ئەوەش زیاد بکەین کە بەرنامەی راهێنانی رێکوپێك پێویستە باوەڕ بەخۆکردن زیاد بکاو ئەوانەی ئەو خولانەی راهێنانە دەبینن ورەیان بەرز ببێتەوەو متمانە بە خۆیان زیاتر بکەن.

## پاشکۆیەک

لە کۆتاییدا: پێویستە ئێمە بابەتەکەمان بەوە دوایی پێبێنین کە گفتوگۆیان ببەستینەوە بە بەکارهێنەری دواییی پەیامەکانی رادیۆ کە بریتییە لە گوێگر یا بینەری گوندنشین. هەروەها پێویستە هەر کەسێك بەرنامە ئامادە دەکا بۆ ئەم جۆرە گوێگرو بینەرە شارەزاییی تەواوی هەبێ لەسەر ژیانی لادێ، بۆ نموونە دانیشتوانی گوندەکانی نیجیریا جیاوازییان هەیە لە دانیشتوانی (لاکۆس)ی پایەتەختی ولات، هەروەها دانیشتوانی گوندەکانی مەکسیك جیاوازییان هەیە لە دانیشتوانی (مەکسیکۆسیتی)ی پایتەخت کە پڕە لە خەلکێکی زۆر.

سەرپەرشتیارانی رادیۆ دەبێ ئەوە بزانن کە زۆرجار ناکۆکیی هەیە بە شێوەیەکی سەرەکی لە نێوان شێوەی ژیانو بیروبۆچوونی دانیشتوانی لادێو شاردا. دابونەریت لە ناوچە گوندنشینەکاندا زیاتر کۆنپارێزو وشکن، هەر بەرنامەیەك بە شێوەیەکی خراپ باسی ئەو دابونەریتانە بکا زیانی زیاترە لە سوودی، بەلام ئەمەش مانای ئەوە نییە کە بەرنامەکان ناتوانن خۆیان بدەن لە قەرەی ئەو کێشانەی پەیدا دەبن لە ئەنجامی بەیەکدادانی کەلتوور یا دابونەریتە تایبەتەکان بە هەرکام لە دانیشتوانی شارو لادێ.

ئەو بەرنامە تەلەفزیۆنییەی کە لە هەموو بەرنامە تەلەفزیۆنییەکانی تر پەسەندترە لای خەلك لە ئەمریکای لاتیندا وەك نموونەیەك، ئەو بەرنامەیەیە کە لە بیرۆکەیەك دەدوێ بریتییە لەوەی گوندنشینەکان دەبێ خۆیان رابێنن لەگەلّ ژیانی شارستانیدا لە رێگەی بەکارهێنانی ئامێرە نوێکانەوە. رەنگە گرنگترین بابەتێ بۆ هۆکانی راگەیاندن، ئەوە بێ کە دانیشتوانی لادێ ئاگادار بکەنەوە لەوەی کە کۆچکردن بۆ شارە گەورەکان وەنەبێ ژیانیان باشتر بکاو زیاتر بەختەوەریان بکا.

گەلێك لە دەزگاکانی بلاوکردنەوە لە رێگەی رادیۆو تەلەفزیۆنەوە باسی ئەو کێشەیەیان کردووە کە بریتییە لەو نائومێدییەی تووشی گوندنشینەکان دەبێ کە وایان دەزانی شار وەك بەهەشت وایە. رەنگە ئەم جۆرە بەرنامانە کاریگەر بن لەوەدا وا لە هەندێ لەو گوندنشینانە بکەن دوو جار بیر بکەنەوە پێش ئەوەی بەرەو شار بکەونە رێو بچنە ریزی بێکارەکانی ناو شارەوە کە هیچ جێگەو رێگەیەکیان چنگ ناکەوێ لەبەر زۆریی دانیشتوانی شار.



کاتێك لێپرسراوی بەرنامە لەگەلّ کارمەنداندا باسی پێشخستنی کارەکان دەکا، پێویستە لەسەری ئەوەی لەبیر نەچێ کە بە زۆری ژنان گوێ لە رادیۆ دەگرنو تەلەفزیۆن دەبینن. هەندێ جار ژمارەی گوێگرانو بینەرانی ژن لە پیاوان زیاترن. ئەو بەرنامەیەی، ئەوە لە بەرچاو نەگرێ کە داخوازیو پێویستییەکانی ژن زۆر لەوە زیاترن کە تەنیا ئەرکی منالّبوونو مالّ بەڕێوەبردن بێت، ئەوا ئەو بەرنامەیە هیچ سوودێکی نابێ. گەلێك لەو کچە گەنجانەی کار دەکەن لە بواری رادیۆدا بیروبۆچوونی باشیان هەیە لەسەر چۆنیەتیی چارکردنی هۆکانی راگەیاندن بۆ رۆلّی ژن لە جیهانی سێهەمدا کە گۆڕانیان بەسەردا دێت. لە هەندێ ولاتدا ژنان پۆستی سەرکردایەتیو بەڕێوەبەرایەتیی دەزگاکانیان کەوتووەتە سەرشانو کاریگەرییان هەیە لەسەر ناوەرۆکی هۆکانی راگەیاندنو گرنگییەکی تایبەتیان داوە بە کاروبارو پێداویستیو کێشەکانی ژنان.

ئەو ئیستگەیەی بەرنامەکانی خۆی بلاو دەکاتەوە بۆ ناوچە گوندنشینەکان، دەبێ ئەوەی لە بەرچاو بێ کە پێویستە دانیشتوان لەوە ئاگادار بکاتەوە کە گرنگی بدەن بە کاتی دروێنەو کشتوکالّ. رەنگە پلانی بەرنامەکان پێویستیان بە جۆرە گۆڕینێك هەبێ بەگوێرەی وەرزەکانی کشتوکالّ یا پشووی رەسمیو میهرەجانە تایبەتەکان. هەروەها دەبێ بێژەرانو سەرپەرشتیارانی رادیۆ ئەو حەقیقەتەیان لە بەرچاو بێ کە هەموو خێزانێك وەنەبێ رادیۆو تەلەفزیۆنیان هەبێو هەندێ جار ناچارن روو بکەنە مالّی گەورەی دێ یا مالّی دۆستو برادەران. یاخود بەهۆی خراپی کەشو هەواوە نەتوانی بگاتە شوێنێك بۆ ئەوەی گوێ بگرێ لە رادیۆ یا سەیری تەلەفزیۆن بکات.

# بەشی شانزەهەم

## پەیوەندیی نێوان حکومەت و رۆژنامەگەری لە جیهانی سێهەمدا

**نووسینی: لێپرسراوی وەزارەتێکی راگەیاندن کە نەیویست ناوی خۆی ئاشکرا بکات .**

(تێبینییەك: ئەم لێپرسراوە گەورەیەی وەزارەتێکی راگەیاندن لە یەکێك لە دەوڵەتەکانی جیهانی سێهەمدا، داوای کرد کە ناوەکەی بە نەزانراوی بمێنێتەوەو ئاشکرای نەکەین. ئێمە باوەڕمان وایە کە گرنگیی بابەتەکەی رێگەی ئەوەمان دەداتێ بڵاوی بکەینەوە، لەگەڵ ئەوەدا دەبێ ئەو کارە بکەین بە بێ ئەوەی خۆی بناسین).

پێویستی بۆ ئەوەی ناوەکەم بە نەزانراوی بهێڵمەوەو ئاشکرای نەکەم دەگەڕێتەوە بۆ ئەو گرژییەی بەردەوامە لە نێوان دەوڵەت لە لایەکەوەو بواری رۆژنامەگەری لەلایەکی ترەوە. بۆ نەگبەتی لە زۆربەی دەوڵەتانی جیهانی سێهەمدا، بڕێکی زۆر کەم نەبێ ئازادیی رۆژنامەگەری نییە، دەکرێ بڕوبیانوو و بەڵگەی زۆر بهێنرێتەوە بۆ پاساودانی ئەو حاڵەتە. من خۆم هاوسۆزم لەگەڵ ئەوانەدا کە دەڵێن رۆژنامەگەریی بێ کۆت و بەندو بێ سانسۆر، لەوانەیە ببێتە مەترسییەکی گەورە لەسەر خودی نەتەوەکەو مانەوەی، بەڵام دەبێ بە خێرایی ئەوەش بڵێم کە سیاسەتی راگەیاندنی کراوە، باشتر خزمەتی بەرژەوەندیی دەوڵەتی لێهاتوو و جێگیرو ئارام دەکا، ئەگەر بۆ مەودای دوور بڕوانین.

گەلێك لە سەرکردەکانی دەوڵەتانی جیهان کە هەندێکیان لە جیهانی پێشکەوتوودا دەژینو هەندێکیشیان لە جیهانی دواکەوتوودان، لایان وایە لە دڵسۆزییەوەیە، کە رۆژنامە دەبێ بە بێ مەرج پشتگیریی دەوڵەت بکا لە هەموو پێشنیارو هەنگاوەکانیدا بە گەرمییەوە، ئەوان وا دەڕواننە رۆژنامەگەری کە تەواوکەری حکومەتن و درێژەپێدەری ئەون. هەروەها ئەوان باوەڕیان وایە دەسەڵاتیان پێسپێردراوە بە بێ ئەوەی بەرپرس بن بەرامبەر کۆمەڵێك رۆژنامەنووس کە نیمچە خوێنەوارنو حەز لە ئاژاوە دەکەنو سروشتیان ئەوەیە کە کۆسپو کێشە دروست بکەن لە بەردەم هەموو کەسێکدا.



هەندێك سەرکردەی تریش هەن لەوانەی دەیانناسم، بە راستی هەست بەوە دەکەن کە کۆمەڵێك لە بەرپرسانی دەوڵەتیو هێتر لە ئەندامانی دەرکەوتووی کۆمەڵگە، ئەوەندە رووناکبیرییان هەیە شایستەی ئەوەن سەرکردایەتیی میللەت بکەن، من ئەم جۆرە فەلسەفەیە ناو دەنێم (دەسەڵاتی تاقمی هەڵبژێرراوی چاك)، ئەمەش فەلسەفەیەکە بووە بە باو لە هەندێ وڵاتدا. پاساوی ئەمانە ئەوەیە کە رۆژنامەگەرییەکی بێ ئەزموونو رانەهێنراوو میللەتێکی وا کە زۆربەیان نەخوێنەوارن، کە دەبێ هەموویان پشتی یەك بگرن بۆ ئەوەی رێگە تەخت بکەن بۆ بنیاتنانی میللەتێك زۆر کارێکی قورسو گرانە، ئەوان پێیان وایە دەنگدەران هەڵیانبژاردوون — یاخود خوا هەڵیبژاردوون — بۆ ئەوەی سەرکردایەتیی میللەتەکەیان بکەن بەرەو سەربەخۆییو بەختەوەری.

ژمارەیەکی تا رادەیەك زۆری سەرکردەش هەن، دەکرێ هەلێکی زۆرتر بڕەخسێنن بۆ رۆژنامە جۆراوجۆرەکان، ئەگەر ژێرخانێکی وا هەبێ لە وڵاتەکەیاندا رایان بکێشێ، بەڵام ئەوانە بە حوکمی ئەو بارودۆخەی تیا دەژین دەبێ پشتگیریی ئەو بیرۆکەیە بکەن کە دەڵێ رۆژنامە بەشێکە لە حکومەت، چونکە وڵاتەکەیان گەیشتووەتە رادەیەکی وا لە هەژاری، نەخوێنەواری، گۆشەگیریو کەمیی رووپێوو بچوکی وڵاتەکە، کە خەڵك راناکێشێ بۆ ئەوەی هەندێ لە دەزگاکانی بواری رۆژنامەگەری، رووی تێبکەنو دەزگای بڵاوکردنەوەی تیا دابمەزرێنن بە مەبەستی قازانجکردنو سوودوەرگرتن.

من خۆم زۆر هەڵسوکەوتم کردووە لەگەڵ هەندێ لەو سەرکردە نیشتمانپەروەرانەی باوەڕی تەواویان هەیە بەوەی کە هۆکانی راگەیاندن لە وڵاتە رۆژاواییەکاندا، تەنیا ئامرازێکن بۆ پڕوپاگەندەکردن بۆ بابەتە خۆراکییەکانو ئەوانە لە هەر وڵاتێکدا رووی تێدەکەن پێناسەکەی دەشێوێننو گیانی نیشتمانپەروەریی تیا ناهێڵن. لەبەر ئەوە ئەوانە هەر هەوڵێکیان لە توانادا بێ خەرجی دەکەن لەپێناوی دوورخستنەوەی ئەو هۆیانەی راگەیاندن کە مەبەستیان بازرگانیکردنە لە سنووری وڵاتەکەیان، چونکە ئەوان لایان وایە ئەوانەی هەوڵی پارە کۆکردنەوە دەدەن هیچ تێگەیشتنو دڵسۆزییەکیان نییە بەرامبەر بەو میللەتە نوێیانەی تێدەکۆشن بۆ بەدەستهێنانی پێگەیەك بۆ وڵاتەکەیان لە جیهاندا.

هەروەها چاوم بە چەند سەرکردەیەکی تر کەوتووە لەوانەی باوەڕیان وایە کە دەوڵەتە سۆشیالیستەکان لە رێگەی هۆکانی راگەیاندنیانەوە وێنەیەکی ناڕاستو خەماوی دەخەنە روو لەسەر جیهان، ئەوان لایان وایە کە مارکسییەکان هەوڵ دەدەن بۆ زەوتکردنو لەناوبردنی سەروەریی وڵاتانی تر کوتومت وەك هەندێ لە دەوڵەتە سەرمایەدارییەکان، لەمیانەی ئەم (کارە قورسەی گوریس کێشییە)دا لە نێوان سەرمایەداریو کۆمۆنیزمدا، جیهانی سێهەم دەبێتە گۆڕەپانی نەبەردەکانو زۆرجار دەوڵەتێك دەکەوێتە ژێر پێی رۆژهەڵات یا رۆژاوا.

لە دواییدا من هەندێ جار کۆ دەبمەوە لەگەڵ چەند سەرکردەیەکی بە ناو نیشتمانپەروەر کە تەنیا رابواردنی خۆیان لا مەبەستە، ئەوانەی چاویان دەبریسکێتەوە لە ئەنجامی خۆشیو رابواردنەوەو هەوڵدان بۆ زۆرکردنی سامانو دەوڵەمەندبوونیان لەسەر حیسابی جەماوەر، ئەمانە لایان وایە هەر بەرهەڵستیکردنێك لەلایەن رۆژنامەکانەوە دەبێ بە پێ پان بکرێتەوە وەك چۆن سیسرکێکی قێزەون پان دەکرێتەوە.

رۆژنامە لەو جۆرە وڵاتانەی ئەم سەرکردانە دەیانبەن بەڕێوە، تەنیا هۆیەکە بۆ جوینەوەی ئەو گەورەییە ساختانەی کە (سەرکردەی بەرز) چێژی لێوەردەگرێ. ئەم سەرکردانە لووتبەرزیی خۆیان دەشارنەوە لەژێر پەردەی خێرخوازیو گرنگیدانو لاکردنەوە لە خەڵك، لە کاتێکدا ئەمانە رەوشتیان لە رەوشتی پشیلەی سپڵە دەکا.

بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەم ئەنجامە جۆراوجۆرانە کە بریتین لەم بیروبۆچوونانە لەسەر رۆڵی رۆژنامە لەناو میللەتدا، ئێمە دەتوانین چی بڵێین. رۆڵی راگەیاندن بەلای گەلێك لە سەرکردەکانەوە، وەك مەتەڵ وایە، چونکە ئەوانە زۆرجار پێشینەیەکی رۆژنامەگەریو ئەکادیمیی وایان نییە بتوانن هەڵسوکەوت بکەن لەگەڵ کێشەو گرفتەکانی پەیوەندیو راگەیاندن لەناو میللەتدا. ئەوانە دەتوانن بە یارمەتیی بەرپرسانی وەزارەت شتێك دروست بکەن کە لە سیستمی پەیوەندی بچێ، بەڵام ئەو سیستمە لە زۆر کاتدا ناتەواوە، بەهۆی ئەوەوە کە ئەو بەرپرسانەی وەزارەت پێویستییان بە راهێنان هەیە، زۆرجاریش بەڕێوەبردنی سیستمی پەیوەندیو زانیاری لە دەوڵەتدا دەهێڵرێتەوە لە دەستی کەسانێکدا ترس باڵی کێشاوە بەسەریاندا بە شێوەیەك گەیشتوونەتە ئەنجامێك کە بێدەنگ بن باشترە لەوەی کارێك بکەن سەرنجی خەڵك رابکێشێت، چونکە زور سەرنجڕاکێشانی خەڵك کارێکی گونجاوو باش نییە، بە تایبەتی ئەگەر ئەو کەسە هەڵە زۆر بکات.

لەگەڵ ئەوەدا کە هەڵەی وەزارەتەکانی تر خێرا دەرناکەون، هەڵەکانی وەزارەتی راگەیاندن بە خێراییو بە ئاشکرا دەردەکەون. چونکە بینینی ئەو هەڵانە تەنیا تایبەت نییە بە لێپرسراوانەوە بەڵکو زۆر کەس لە ئەندامانی گەل لەگەڵیاندا دەیبینن. هەر ئەمەشە هۆی ئەو گۆڕانکارییە زۆرانەی روو دەدەن لە وەزارەتەکانی راگەیاندنی زۆربەی وڵاتاندا. وەرگرتنی پۆستی وەزیری راگەیاندن ئەرکێکی پڕ مەترسییەو دەبێتە هۆی گرژیو ماندووبوون.

ئەگەر وا دابنێین کە وەزیری راگەیاندن یا بەرپرسێکی وەزارەتەکە بەرژەوەندیی میللەتی لە بەرچاو بێ، ئەوە چەند کار هەن دەکرێ پەنا ببرێتە بەریان بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئەرکە. شاری رۆما بە رۆژێك دروست نەکراوەو ناکرێ سیستمێکی راگەیاندنی کراوەو لێهاتوو بە پەلەپەلو خێرایی دابمەزرێنرێت بە بێ ئەرکو ماندووبوون.



یەکەم هەنگاو کە پێویستە لەسەر بەرپرسێکی بواری راگەیاندن بەجێی بێنێ ئەوەیە لە خۆی ورد ببێتەوەو بە پاکی ئەوە دیاری بکا کە ئایا رێگەیەك هەیە بتوانێ پیایدا بڕواو ببێ بە بەشێك لە حکومەتەکە. لە کاتێکیشدا ئەو بەرپرسە گەیشت بە ئەنجامێك کە فەرمانڕەواو کاربەدەستانی وڵات گەیشتوونەتە رادەیەك لە گەندەڵیو خراپەکاری، کە بواری هیچ جۆرە سەربەستیو ئازادییەك نەماوەتەوە لە وڵاتەکەدا، ئەوە باشتر وایە بۆ ئەو دەست لە کارەکەی هەڵگرێو بچێ پاقلە بفرۆشێ، یاخود بە بەلەمە بچووکەکەی بچێ راوەماسی بکا. چونکە کەسێك خۆی تەرخان بکا بۆ یەکێك لە سەرکردەکان کە شایانی ئەوەیە لە (دۆزەخەکەی) دانتیی شاعیری ئیتاڵیادا بژی، ئەوە ژیانێکی رووکەشەو پڕە لە بێزاریو لە دوارۆژدا دەبینێ وردەوردە چی بەهاو رەوشتەکانی هەیە دەرووخێنو نامێننو ئەو راستگۆییو پاکییەی کە هەیەتی وەك تەپڵی بۆش هەر کاتێك بای بەرکەوت دەنگێکی لێدەردەچێ.

خۆ ئەگەر ئەو بەرپرسە، کاربەدەستانی وڵاتی وا هاتنە پێش چاو کە کەسانێکی نیازپاکنو لەوانەن کە حەز دەکەن — تا رادەیەك — هەوڵ بدەن بارودۆخی ژیانی هاووڵاتییان چاك بکەن، ئەوا بڕیار دەدا بەردەوام بێ لە جێبەجێکردنی ئەرکەکەی سەرشانیو رەنگە حەزیش بکا لەوەی یارمەتیی میللەتەکەی بدا لەوەدا کە شتی بەکەڵكو سوودمەندی بۆ دەستەبەر بکا، نەك هەر ئەوە بەڵکو خەو بەوەوە ببینێ کە رۆژێك لە رۆژان میللەتەکەی ببێ بە میللەتێکی گەورەو ناودار، یاخود توانای ئەوەی هەبێ کە میللەتەکەی بگێڕێتەوە بۆ ئەو سەربەرزیو خۆشگوزەرانییەی لە سەردەمانی کۆندا تیایدا ژیاوە. ئەم جۆرە ئاواتو خەونو خەیاڵانە وا لە مرۆڤ دەکەن کە هەرکات لە تەمەنی گەنجیدا بژینو قەرەبووی ئەو سەدان نەبەردە دۆڕاوانە بکەنەوە کە دەناڵێنن بەدەستییەوە. مایەی خۆشبەختییە کە زۆربەی سەرکردەکان وەك ئێمە وانو ئەوانیش مرۆڤنو چاکیان هەیەو خراپیان هەیە، بەڵام بەشی زۆریان دلڕەقو خراپەکار نین.

پێویستە لەسەر کاربەدەستی بواری راگەیاندن وەك پردێك وابێ لە نێوان دەوڵەتو میللەتدا. پردەکان رێگە دەدەن لە هەردوو سەرەوە هاتوچۆی پێدا بکرێ. هەروەها پێوستە لەسەری ئەوە بسەلمێنێ کە گواستنەوەی زانیاری بۆ سەرکردە گەورەکان گرنگە بە ئەندازەی گرنگیی گواستنەوەی زانیاری لەوانەوە بۆ گەل.

ئەوەی جێگەی خەفەتە لەناو سەرکردەکاندا ئەوەیە کە هەندێکیان خۆیان گۆشەگیر دەکەن لە میللەتەکەیان، ئەوانەی کە هەر دەسەڵاتیان کەوتە دەست ئیتر رابوردووی خۆیان لەبیر دەچێتەوەو بەرپرسیارییەتی لەبیر خۆیان دەبەنەوە، بەڵکو ئەو سەرکردانەی کە نیازپاکن بەهۆی زۆریی ئەرکەکانیانەوە لە خەڵك دادەبڕێن.

وەرگرتنی پۆستی سەرکردایەتی، مانای مردنە بە دەستی دوژمنان هەندێ جارو هەندێ جاریش لە ئەنجامی ماندووبوونێکی زۆر بەهۆی کێشەو گرفتەکانی وڵاتەکەوە، هیچ شتێکی سوودبەخش لە بەردەستدا نییە، پارە نییە، کارمەندی بەئەزموونو راهێنراو لەناو بەرپرساندا نییە، سروشتیش دانەکانی جیڕ کردووەتەوەو باوبۆرانو گێژەڵووکەو وشکە ساڵی دەنێرێت بۆ وڵات، بە رادەیەك هەندێك لە سەرکردەکان هەست دەکەن کە خوا وازی لێهێناونو بە تەنیا بەجێی هێشتوون لەم جیهانەدا.

سەرکردەی ژیر دەبێ بەردەوام ئاگادار بێ چی روو دەدا لە دەرەوەی کۆشکەکەیدا. بەرپرسانی راگەیاندنیش لەسەریانە دەسەڵاتداران ئاگادار بکەنەوە، هەروەها دەبێ ئەوانەش ئاگادار بکەنەوە کە هەموو رۆژ ئارەق دەڕێژن بۆ پەیداکردنی پاروەە نانێك.

لەسەر بەرپرسی راگەیاندنی گشتی پێویستە پێش هەرشتێك هەوڵ بدا، سەرکردەکانو یاریدەدەرانی تێبگەیەنێ لەوەی ئەگەر مرۆڤ راستگۆ بوو سوودمەند دەبێ، ئەمەش دەرسێکە پێویستیی بە بڕێکی زۆر ناڕەحەتیو رەنجکێشان هەیە بۆ ئەوەی بیرێتە مێشکی خەڵکەوە، چونکە دان نان بەوەدا کە ئێمە مرۆڤینو ئەگەری ئەوە هەیە هەندێ جار بە هەڵەدا بچینو میللەت دەناڵێنێ بەدەست ناهەمواریيەکانی ژیانەوە، کارێکە بە زەحمەت ئەنجام دەدرێ، چونکە پێویستی بەوەیە بەرامبەرەکەت مرۆڤێك بێت لە حاڵەتێکی ئاسوودەدا بژی، مرۆڤێك بێت لەوە تێبگا کە حکومەتەکان دەگۆڕدرێنو وەرزەکان دێنو دەڕۆنو خۆیشی لە ماوەیەکی تا رادەیەك کورتدا ون دەبێ لەسەر سەکۆو گۆڕەپانی رووداوەکانی جیهان.

کارێك کە دەروونی مرۆڤ زۆر ئاسوودە دەکاو کاتێك کە لە کۆتایی تەمەنی نزیك دەبێتەوە شانازیی پێوە دەکا، ئەوەیە هەست بکا بەوەی کە راستگۆ بووە لەگەڵ خۆیدا لە ژیانیداو هەموو کاتێك لای راستیو پاکیی گرتووەو بە سەربەرزییەوە رێگەی ژیانی بڕیوە تا کۆتایی.

ساختەچییەتیو درۆودەلەسەکردن رەنگە لە سەرەتادا بە کارێکی بەکەڵكو سوودمەند دابنرێ، بەڵام لە ئەنجامدا کە لەسەر یەکتر کەڵەکە دەبن دەبنە بارێکی قورس کە هەڵناگیرێت، تا دەگاتە رادەیەك ئەو ئەرکەی لەو کارەدا دەکێشرێ زۆر بە زیان تەواو دەبێت.



سەرکردەکانی ئەو وڵاتانەی پێیان دەگوترێ وڵاتە پێشکەوتووەکان لەم بارەیەوە تووشی کێشە بوون وەك سەرکردەکانی وڵاتانی جیهانی سێهەم. لە حەقیقەتدا، ئێمە دەتوانین چاوپۆشی بکەین لە یەکێك لە سەرکردەکانی جیهانی سێهەم کە بیەوێ بە کۆمەڵێك درۆودەلەسە گۆڕانکاری بکا لە وڵاتەکەیدا، بە پێچەوانەی کەسێکەوە کە توانای هەیە پارەیەکی زۆرو کەسانی لێزان دابین بکا بۆ فەرمانڕەوایی.

نەگبەتییەکە لە مەسەلەکەدا لەوەدایە کە سەرکردەکان کاتێك درۆ دەکەن لەگەڵ میللەتەکەیاندا، بۆ ماوەیەك باوەڕ بە درۆودەلەسەو چەواشەکارییەکەیان دەکرێ، ئەو فەرمانڕەواییە بە شێوەیەکی روو لە زیاد بەرەو ناڕاستی دەڕوا تا وای لێدێت کە لە نێوان ئەوانو جیهانە راستییەکەدا تەنیا بە ئەندازەی تاڵە دەزوویەك دەمێنێتەوە. زۆر کەس لە ئێمە هەستیان کردووە بەوەو وەك لە خەوێکی سەیردا بن، رۆژ بە دوای رۆژدا تێدەپەڕنو ئەوانە هەر لەو خەیاڵەدا دەژین، بە تەواوی وەك چۆن میللەتێك بەرەبەرە نوقم دەبێ لەناوقوڕو لیتەدا بەهۆی سەرکردایەتیی دوور لە میللەتەوەو لەناکاو رۆژێك بەئاگا دێن لەو خەوە، بەڵام زۆرجار لە رێگەی بەرپابوونی یاخیبوونێك یا شۆڕشێکەوە. ئەوانە ئەگەر رێگەی راستیان بگرتایەتەبەر، دەکرا خۆیان بپارێزن لەو تەقینەوەیە.

دەبێ کەسی بەرپرس لە وەزارەتی راگەیاندندا واقیعبین بێ لە ئاواتو هیواکانیدا، ئەو بەرپرسە کەوتووەتە نێوان سەرۆکەکەیو هۆکانی راگەیاندنو میللەتدا، لەبەر ئەوە دەبێ سنووری خۆی بزانێ، بەڵام ئەگەر لە توانایدا بوو، ئەو بیروبۆچوونو پێشنیارانەی دەبنە هۆی یەکیەتیو بەیەکەوەنووسانی میللەت بگەیەنێت بە سەرکردایەتیی باڵا ئەوە مانای وایە کارێکی زۆری ئەنجام داوە.

لە هەمان کاتدا دەتوانێ هەست بە لەخۆڕازیبوون بکا، ئەگەر بوو بە سەرپەرشتی بەرنامەیەکی راگەیاندن، بۆ پێشکەشکردنی زانیاریی راستو سوودمەند بە خەڵکی ئاسایی. ئەمەش دەکرێ راستەوخۆ لە رێگەی هۆکانی راگەیاندنی دەوڵەتەوە یا لە رێگەی رۆژنامەکانەوە ئەگەر سەربەخۆ بوون لە حکومەت. هەروەها پێویستە لەسەر بەرپرسی راگەیاندن، ژیرو لێزانو شارەزای پێداویستییە سەرەکییەکانی وڵاتەکەی بێت لە بواری راگەیاندندا، خەڵك پێویستیان بە زانینی چییە؟، ئەوان پێویستیان بە زانیاریی زیاتر هەیە لەسەر بابەتی تەندروستی؟ یا چۆنیەتیی باشکردنی کشتوکاڵ؟، ئایا ئەوانە پێویستیان بە زانیاریی زیاتر هەیە لەسەر ئەوەی کە ئەگەر ئەوان بەردەوام بن لە دروستکردنی منداڵدا، کاری دەوڵەت بەشی ئەو هەموو منداڵە ناکا؟، ئایا ئەوان پێویستییان بە زانینی ئەوە هەیە کە تیرەو تایفەگەری لە بەرژەوەندیی هیچ لایەکدا نییە؟، ئایا پێویستیان بە زانیاری هەیە رێنومایییان بکا بۆ چۆنیەتیی خۆپاراستنیان لەوەی بەرژەوەندییەکانی بێگانەکان یارییان پێبکەن کە لە مەبەستەکانی خۆیان زیاتر گرنگی بە هیچ شتێکی تر نادەن؟ ئایا گوندنشینەکانی ئەو وڵاتە

پێویستیان بەوە هەیە کە بزانن پاش ئەوەی چوونە ناوشار بە چ شێوەیەك دەژین؟، ئایا پێویستیان بەوە هەیە کە بنەمای فەرمانڕەوایی‌و دەسەڵات بەهۆی پەرلەمانەوە چۆنە؟ ئەگەر وڵاتەکەیان پەرلەمانی تێدابوو یاخود بە نیازی ئەوەبوو حوکمێکی پەرلەمانی دابمەزرێنێ؟ ئایا ئەوانە پێویستیان بەوە هەیە کە بزانن چۆن فێری خوێندنەوەو نووسین دەبن؟

پاش ئەوەی بەرپرسانی بواری راگەیاندن، ئەو پرسیارە گەورەو گرنگانەیان دەستنیشان کرد کە پەیوەندن بە میللەتەکەیانەوە، ئەو کاتە دەبێ بگەڕێن بە دوای ئەو رێگەو شێوازانەدا کە دەیگرنەبەر بۆ جێبەجێکردنیان. لە راستیدا، هەر پلانێك دادەنرێ بۆ بواری راگەیاندن دەبێ ئەوەی لە پێش چاو بێ کە چۆن کارمەندانی ئەو بوارە رادەهێنێ‌و ئەو بودجەیەی کە لە توانایدایە بەکاری بێنێ بۆ جێبەجێکردنی ئەو مەبەستەو ئەو کەرەستانەی پێویستیەتی. بەرپرسی راگەیاندنی لێهاتوو و وریا بە بریقوباقی ئامێری تەکنۆلۆژیای نوێ ناخەڵەتێ‌و پێویستە لەسەری گوێ راگرێ لە خەڵك‌و ئەوە لێکبداتەوە کە چ جۆرە ئامێرێکی پەیوەندی چاکترە لەوانی تر بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکەی. رەنگە ئەو ئامێرانەی کە پێویستیان بە کارمەند نییە باشتر نەبن، رەنگە ئەو پۆستەچییەی بە سواری پاسکیلەکەوە دەیان بروسکە لە فەرمانگەی بێتەلەوە دەگەیەنێ بە جەماوەر باشتر بێ لەوەی ژمارەیەکی زۆر ئامێری فاکس‌و کۆمپیوتەر بەکار بێنێ.

بەرپرسی بواری راگەیاندنی لێزان، دەبێ بە وردی ئەو کێشە تایبەتانە هەڵسەنگێنێ کە پەیوەندییان هەیە بە لاساییکردنەوەی سیستمێکی رۆژنامەگەریی وڵاتێکی بیانییەوە، هەر تەنیا لەبەر ئەوەی هەلی بۆ دەڕەخسێنێ کارمەندان بنێرێ بۆ خولی راهێنان، یاخود لەبەر ئەوەی خۆی لەو وڵاتەدا راهێنراوە، چونکە هەر دەوڵەتێك جیاوازە لەوی ترو بۆ ئەو گرنگە ئەوەی سوودمەندە پەسەندی بکات‌و ئەوەی بێکەڵکە بیخاتە لاوە. ئەو لەسەریەتی لە خۆی بپرسێ، کام لەو هۆو رێگەیانە کە تایبەتن بە کاری راگەیاندنەوە بێسوودو بێبەرهەمە. هەروەها دەبێ توانای ئەوەی هەبێ خۆی دڵنیا بکاتەوە لەو هۆیانەی پاڵ دەنێن بە لایەنێکەوە کە دەیەوێ هۆکانی راگەیاندن بەرێ بە رێوە لە وڵاتەکەیدا، ئایا ئەم لایەنە دەیەوێ خزمەتی گەشەکردن‌و پێشخستنی وڵاتەکە بکات، ئاخۆ دەیەوێ بەرژەوەندیی خۆی بێنێتە دی‌و چەندی پێدەکرێ بە خێرایی پارە کۆ بکاتەوە؟

ئەو بەرپرسەی راگەیاندن کاتێکی دەیەوێ لەگەڵ بواری رۆژنامەدا هەڵسوکەوت بکا — ئەگەر رۆژنامەگەریی سەربەخۆ هەبوو لە وڵاتەکەدا — ئەوە دەبێ درۆ نەکاو راستگۆ بێ، چونکە ئەگەر هۆکانی راگەیاندن چەواشە بکاو درۆیان بۆ بکا، متمانەیان نامێنێ پێی، بۆ ئەو وا باشترە دەمی بنووقێنێ‌و بێدەنگ بێ لەوەی درۆ بکا بۆ خەڵك.



هەروەها دەبێ بڕێك هەستی هەبێ بەرامبەر بەو کۆسپانەی رووبەڕووی نووسەرو سەرنووسەران دەبنەوە لەوانەی بڕێکی کەم راهێنانیان بینیوە، چونکە ئەوانە زۆرجار تووشی هەڵە دەبن‌و هەندێ لەم هەڵانە ئازار دەگەیەنن بە حکومەت‌و کەسانی تر، لەگەڵ ئەوەشدا دەبێ رێگەیان پێبدرێ بۆ ئەوەی لەو هەڵانەوە فێر بن، ئەگەر تۆ دەمیان بدووری ئەوانە هیچ کاتێك فێری قسەکردن نابن.

هەروەها پێویستە لەسەر بەرپرسی بواری راگەیاندن هەوڵ بدا بۆ زیاترکردنی راهێنان بۆ رۆژنامەنووسان‌و سەرنووسەران‌و وێنەگران‌و... هتد، بۆ ئەوەی تواناییان زیاتر ببێ لە بواری پیشەکەیانداو زیاتر پابەندی رەوشتی باش بن، هەروا لەسەریەتی هانی کاربەدەستان بدا بۆ ئەوەی مووچەی باشیان بداتێ. بەرپرسی راگەیاندنی لێهاتوو نابێ سووکایەتی بکا بە رۆژنامەنووسە ناوخۆییەکان‌و چاوپێکەوتن بکا لەگەڵ رۆژنامەنووسە بیانییەکانداو قسە تەنیا بۆ ئەوان بکا، چونکە ئەم رەفتارە تا رادەیەکی زۆر رۆژنامە ناوخۆییەکان تووڕە دەکا.

جگە لەمانە، لێپرسراوی بواری راگەیاندن دەبێ بە وردی‌و لێهاتوویی توانای خۆی هەڵسەنگێنێ لەو بوارەدا، وەك پێویست خولی راهێنانی بینیوە؟ یاخود بەهۆی حیزبایەتی‌و سیاسەتەوە دانراوە لەو پۆستەدا بە بێ ئەوەی لەو بوارەدا پێشینەیەکی هەبێ؟، ئەگەر ئەزموونێکی نەبێ لە بواری راگەیاندندا ئەوە باشتر وایە بە هەر شێوەیەك بێ زانیارییەك بەدەست بێنێ.

لە کۆتاییدا، بەرپرسی راگەیاندن لەسەریەتی کاتێك لە پەیوەندیی نێوان رۆژنامەگەری‌و حکومەت ورد دەبێتەوە، هەست بە هەردوولا بکا واتە رێگە نەدا نە شیش بسووتێ نە کەباب. چونکە رۆژ هەڵدێ لە سبەینێداو ژیان هەر بەردەوام دەبێ، تەنانەت ئەگەر ئەویش بڕیارو هەڵوێستێکی هەڵە وەربگرێ، ئەو ناتوانێ قورسایی جیهان بخاتە سەرشانی خۆی، ئەگەر نا ئەو قورساییە دەیپڕووکێنێ‌و کۆڵ‌و بارەکەی سەر پشتی دەکەوێتە خوارەوە. هەروا پێویستە لەسەری رۆژانە لای کەمی جارێك پێبکەنێ، پێبکەنێ بە نەزانی‌و خاڵە لاوازەکانی خۆی‌و ئەو خۆخەڵەتاندنەی کە لای وابێ ئەوەی ئەو دەیکا کاریگەریی دەبێ لەسەر جیهان پاش پەنجا ساڵی تر.

# بەشی حەڤدەهەم

## فێرکردن و راهێنانی رۆژنامەنووسان لە جیهانی سێهەمدا

**نووسینی: أ. ل. هستر**

**شوێن: ڤیەننا، نەمسا، پێش چەند ساڵێك.**

بۆنەی کۆبوونەوە: کۆبوونەوەی رێکخراوی دەوڵەتە نەوتفرۆشەکان کە چەند وەزیرێك ئامادەی بوون لە دەوڵەتە هەرە دەوڵەمەندەکانی جیهان.

ئەو کەسانەی لەوێ بوون: وەزیری نـەوتی دەوڵـەتێکی عـەرەبیی رەوشـت جـوان، رۆژنامەنووسێکی ترسنۆکی بێ ئەزموون کە نوێنەری ئاژانـسی دەنگوباسـی وڵاتێکـی عەرەبی بوو.

وەزیری نەوت: باشە، دەستپێشخەرییەکی جوانـت پیـشان دا کـە دوام کـەوتی بـۆ ئەوەی بمدۆزیتەوە، لەبەر ئەوە من ئامادەم چـاوپێکەوتنێکی رۆژنامەگـەریت لەگەڵـدا بکەم چونکە تۆ لە دەوڵەتی...... هاتووی. چ پرسیارێکت هەیە بیکە.

رۆژنامەنووسی گەنج: (شـڵەژابوو، دەسـتەکانی دەلـەرزین و پەشـۆکاوبوو) جـەنابی وەزیر (دەمی ئەدا بەیەکداو بڵمەبڵمی لێوە دەهات)، بە بۆچوونی بەرێزتان کـار چـۆن دەڕوا؟!

وەزیری نەوت: ناتوانی پرسیارەکانت زیاتر روون بکەیتەوە؟، من بیـست دەقیقـەت بۆ تەرخان دەکەم، ئەگەر بتوانی چەند پرسیارێکی ورد ئاراستە بکەی.

لـە خۆشـبەختیی رۆژنامەنووسـەکەدا، وەزیرەکـە، هەنـدێ لـە کێـشەکانی ئـەو رۆژنامەنووسـە گەنجـەی بـۆ دەرکـەوت و هەنـدێ زانیـاریی خـستە بەردەسـتی، بـەڵام



رۆژنامەنووسەکە پاش ئەوە گوتی تووشی حاڵەتێکی پەشۆکان و تووڕەبوون بـووە بـەهۆی کەم ئەزموونی و کەمیی راهێنانەوە، بە رادەیەك چاوپێکەوتنەکەی بە زەحمەت بۆ تـەواو کرا.

رۆژنامەنووسەکە پێی گوتم (سوێندم خوارد کە جارێکی تر نابێ بـەو شـێوەیە بم کـە هیچ ئامادەکارییـەکم تێـدا نـەبوو و پێویـستم بـە هەرشـتێك بـوو بـۆ ئـەوەی بـبم بـە رۆژنامەنووسێکی سەرکەوتوو)، هەروەها گوتی (دوو ساڵم بردە سـەر پـاش ئـەوە، هـەر هەوڵم دەدا سەرۆکەکانم رازی بکەم هەندێ بواری راهێنانی راستەقینەم بۆ دابین بکەن لە بواری رۆژنامەگەریدا).

هەڵوێستی ئەم رۆژنامەنووسە هیچ کات بە هەڵوێستێکی نائاسایی دانانرێ، چـونکە بە سەدان رۆژنامەنووسمان هەیە لە جیهانی سێهەمدا، زۆر بە ئاسانی شـەرم دەیـانگرێ و تووشی نائومێدی دەبن ئەگەر لە شوێنی ئەودا بن بە بـێ خۆئامـادەکردن و راهێنـان یـا فێرکردن. لە جیهانی سـێهەمدا رووداوەکـان زۆر بـە خێرایـی دەجـوولێن، بـە رادەیـەك رۆژنامەنووسان بە ناچاری ئەرکی گەورە دەخرێتە سەرشانیان پێش ئەوەی ئامادە بکـرێن بە شێوەیەکی تەواو بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکە. ئەگەر ئەمانە چانسیان هـەبێ و بـەختیان یار بێ لە کاتی ئیشەکەیاندا فێری پیشەکەیان دەبن، یاخود رەنگە بەرپرسەکانیان هەست بکەن بەوەی پێویستییان بە راهێنان هەیە و ئاسانکارییان بۆ بکەن.

لـە راسـتیدا سیـستمی خوێنـدن لـە دەوڵەتـە تازەپێگەیـشتووەکاندا زۆرکـات کەموکووڕییان تێدایە و دەوڵەتە هەژارەکانیش توانایەکی کەمیان هەیە بۆ راهێنانیـان، دەتوانین بە بێ زیادەڕەوی بڵێین زۆربـەی رۆژنامەنووسـانی جیهـانی سـێهەم بـە تـەواوی هەست دەکەن بەوەی پێویستییان بە راهێنان و فێربوونی زیاتر هەیە.

جار دوای جار، سەرنجی ئەوە دەدەم، کە یەکێك لەو پرسیارانەی ئاراستەی من دەکرێ ئەوەیە: چۆن دەتوانم بە شێوەیەکی باش خۆم رابێنم؟، رووبکەمە کوێ بۆ بەدەسـتهێنانی ئەو جۆرە راهێنانە؟، ئەمـە پرسـیارێکی گرنگـە، چـونکە زۆربـەی رۆژنامەنووسـان لـە وڵاتانی جیهانی سێهەمدا هەست دەکەن بەوەی کە پێویستییان بـە راهێنـان و فێربـوونی زیاتر هەیە، بۆ ئەوەی بتوانن بە شێوەیەکی باشتر خزمەتی وڵاتەکەیان بکەن و خۆشیان لە

پیشەو کارەکەیان زیاتر رازی بن، لە راستیشدا بەرنامەی راهێنانی باش کلیلی بەدەستهێنانی پێشکەوتنە لە کاری رۆژنامەگەریو دەوڵەتیدا.

ئێمە بە شێوەیەکی بەردەوام ئەوە دەبینین کە راهێنانو فێربوونی پیشەی رۆژنامەگەری، تەنیا بە بەرنامەکانی راهێنان، یا بەو بەرنامانەی تەرخان کراون بۆ ئەوانەی لە سەرەتای کاردانو، لە هۆکانی راگەیاندنەوە پێشکەش دەکرێن، نایەتەدی. لە کاتێکدا هاوبەشیکردنو لەگەڵدا ژیانی رۆژنامەیەك مامۆستاو فێرکەرێکی خێرایە، بەڵام لە زۆرجاردا کارێکی قورسە. هەروەها خوێندکاران (رەنگە خودی رۆژنامەکەیش) لە کاتی پرۆسەی فێرکردندا تووشی کێشە دەبن، چونکە ئەو دەرسانەی وەریان دەگرێ وەك ئازاردانێکە، هەروەها ئەو راهێنانە بێ بەرنامەیەو چۆن رێکەوت وا دەڕوا.

ژمارەیەکی کەم لە سەرنووسەرانو رۆژنامەنووسانی تر، دەکرێ ببن بە مامۆستایانی لێهاتوو لە بواری راهێنانی رۆژنامەگەریدا، بەڵام کاتی ئەوەیان نییە یارمەتیی رۆژنامەنووسە گەنجەکان بدەن، تەنانەت ئەگەر خۆشیان حەز بکەن لە پێشکەشکردنی ئەو یارمەتییەدا.

زۆربەی دەوڵەتان بەلای کەمەوە، دەزگایەکیان هەیە بۆ راهێنانی رۆژنامەنووسان، هەروەها گەلێك هەلی خۆراهێنان هەیە لە بواری رۆژنامەگەریدا لە دەرەوەی وڵاتدا.

پێویستە لەسەر رۆژنامەنووسی تازە دەستبەکاربوو یا ئەو رۆژنامەنووسانەی دەیانەوێ زانیاریی خۆیان زیاتر بکەن لە بوارەکەداو لە ناوەڕاستی ژیانی پیشەیی خۆیدایە، بە وردی توانای خۆی هەڵسەنگێنێ بۆ ئەوەی زیاتر سوود وەرگرێ لە راهێنان، هەروەها لەسەر زۆربەی رۆژنامەنووسە گەنجەکان پێویستە ئەوە دیاری بکەن کە دەیانەوێ بەدەستی بهێنن لەو راهێنانە بە هەرزانترین پارەو بە خێراترین هۆ. هەندێ لە حکومەتەکان یارمەتی دەدەن لە تێچووی راهێنانەکەو لەوەدا کە رۆژنامەنووسەکە مۆڵەتی بدرێتێ بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ خوێندن، یا پەیوەندی بکا بە پەیمانگەیەکی راهێنانەوە، هەروەها هەندێ بەرنامەی خۆڕاییو بێ بەرامبەر هەن ئەگەر رۆژنامەنووسەکە ئەو مەرجانەی تێدابێ کە دانراون بۆ ئەوانەی دەیانەوێ پەیوەندی بکەن بەو بەرنامەیەوە.



پێویستە لەسەر رۆژنامەنووس یەکەمجار دڵنیا بێت لە بەرنامەی راهێنان لە وڵاتەکەی خۆیدا، تەنیا ئەوەش بەس نییە کە هەر ناوی پەیمانگەکە بزانێ، چونکە ئەو پێویستیی بە زانینی وردەکاریی تر هەیە وەك: تۆ دەتوانی چی بخوێنی؟ تا چەندە ئاسانکاریت بۆ کراوە؟ ئەو مامۆستایانەی سەرپەرشتیی بەرنامەی راهێنان دەکەن لە چ پلەیەکدانو تا چەندە دەتوانن بەو ئەرکە هەستن؟ ئەو رۆژنامەنووسەی دەیەوێ برێکی باش رابهێنرێت بۆ ئەوەی کارەکانی خۆی بە شێوەیەکی باشتر جێبەجێ بکا، تەنیا بەوە رازی نابێ کە پارچە کاغەزێکی بدرێتێ (بڕوانامە) کە ئەم خولی راهێنانی بینیوە، ئەگەر بەرنامەکە خۆی بێسوود بێ هیچی تیا بەستە نییە.

کارێکی ئاسانە لە وڵاتێکی بچووکدا، لەوە تێبگەی کە پەیمانگەکانی راهێنان تا چ رادیەك سوودمەندو بەکەڵکن. هەروەها دەتوانی بزانی ئەو رۆژنامەنووسانەی خولی راهێنانیان بینیوە تا چ رادەیەك سوودیان بینیوە لەو راهێنانە لە کارەکانیاندا، هەروەها ئەوەش ئاسانە، تا رادەیەك لە لێهاتوویی ئەو کەسانە تێبگەی کە سەرپەرشتیی ئەو بەرنامانە دەکەن، بۆ دڵنیابوون لەوەی ئەوانە بە راستی کار دەکەن لە بواری راگەیاندنی جەماوەریداو رادەی لێهاتوویی لە نووسینو دەرس وتنەوەدا.

ئەگەر بۆت دەرکەوت کە بەرنامەی راهێنانی ناوچەیی یا هی وڵاتەکە بەرنامەیەکی باشو بەکەڵکە، ئەوە بۆ تۆ سوودمەندە کە پەیوەندی بکەی پێیەوە چونکە بەرنامە ناوخۆییەکە کاتی کەمتر دەوێو هەرزانتریشە. بەڵام ئەگەر هۆو بەڵگەیەکت لە بەردەستدا بوو، وات لێبکا کە بزانی بەرنامەی راهێنانەکە سەرپێییەو پەلەی تێدا دەکرێ، یا پشتگیریی تەواوی ناکرێت لە وڵاتەکەتدا ئەوە کاتی ئەوە هاتووە بگەڕێیت بە دوای شوێنێکی باشتر لەو بوارەدا.

دەبێ خۆت دوور بگری لە چوونە خولێکی راهێنانەوە کە زیاتر گرنگی بدا بە بابەتی تیۆریو لێکۆڵینەوە گشتییەکانەوە، ئەگەر بەتەمای ئەوەیت ببی بە رۆژنامەنووسێکی خاوەن توانا، ئەوە پێویستیت بە بەرنامەیەکە بواری ئەوەی تیابێ خەریکی نووسین بی، تۆ پێویستیت بە بەرنامەیەکە فێری ئەوەت بکا چۆن تێبینییەکانت دەستەبەر دەکەیت، چۆن چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەوانی ئەنجام دەدەیت، چۆن بیرۆکەکانت گەڵاڵە دەکەیت بۆ

ئەوەی چیرۆکە هەواڵێکی گرنگی لێ پێك بێنیت، تۆ پێویستیت بە بەرنامەیەکە فێری ئەوەت بکا چۆن پابەندی رەوشتو ئەخلاق دەبی لە پیشەکەتدا.

دیارە زۆربەی رۆژنامەنووسان پێویستیان بە رۆشنبیری هەیە لە بواری ئەدەب، فەلسەفە، مێژوو، سیاسەت، ئابووریدا، بەڵام کۆلێژە ئاساییەکان زۆرجار هەل دەرەخسێنن بۆ خوێندنی فێرکردنێکی چڕوپڕ لەو بوارانەدا. راهێنانی رۆژنامەوانی راستەوخۆ گرنگی دەدا بە ئەرکی رۆژنامەوانییەکەو رۆژنامەنووسی کارامەو لێهاتوو ئەوەیە کە زانیارییەکان جۆش بدا لەگەڵ کارەکەیدا.

ئەو بەرنامانەی کە گرنگی دەدەن بە مەسەلەی راهێنانو فێرکردنی بابەتی رۆژنامەوانی، ماوەیەکی کەمە هاتوونەتە ئاراوە، چونکە ئەمە دیاردەیەکە تایبەتە بە سەدەی بیستەمەوە، بیست ساڵ پێش ئێستا رۆژنامەوانان هیچ جۆرە راهێنانێکیان نەدەبینی بۆ فێربوونی پیشەکەیان، ئەوان لێرەولەوێ ئەوەی لەدەستیان بهاتایە کۆیان دەکردەوە. تۆش دەتوانی ئەوە بکەیت، بەڵام زۆربەی رۆژنامەنووسان نایانەوێ تەنیا بەوە وازبێنن کە ئەنجامێکی نادیاری هەیە، بۆ ئەوەی پلەیەکی باشتر بەدەست بێنن لە کارەکەیاندا. لە هەندێ وڵاتیشدا رۆژنامەنووسان دەتوانن بچنە خولی راهێنانەوە کە دەکرێتەوە بۆ هۆکانی راگەیاندن، بەڵام ئەمە لە هەموو وڵاتێکدا نییە.

بەهۆی دەستکورتییەوە، زۆر بەرنامەی راهێنانی رۆژنامەگەری هەن لە جیهانی سێهەمدا، کە رۆژنامەنووسەکان بەدڵیان نییە (تەنانەت ئەو لایەنانەش کە سەرپەرشیتی خولەکان دەکەن). لە ئێستاشدا ئەو رۆژنامەنووسانەی دەیانەوێ زیاتر شارەزا بن لە بوارەکەدا، دەبێ پەنا بەرنە بەر وڵاتانی دەرەوە، یا رێکخراوە بیانییەکان بۆ داوای یارمەتیدانیان بەگوێرەی توانا لە بوارەکەدا.

بە سەدان شوێن هەن لە جیهاندا، راهێنانی رۆژنامەگەری بووە بە سیستمێکی سەرەکی لە کارکردندا، جۆری بەرنامەی راهێنانیش لە وڵاتێك بۆ وڵاتێکی تر جیاوازە. رۆژنامەنووسی گەنجیش سەری لێدەشێوێو دەبێ کاتێکی زۆر بەسەربەرێ بۆ بەدەستهێنانی زانیاری لەسەر ئەم بەرنامانە. ئەم بەرنامە بیانییانەی راهێنان بە دوو پلەدا تێدەپەڕێنن، یەکەمیان بریتییە لە چەند سیمینارێك کە زۆر چڕوپڕنو چەند هەفتە



یا چەند مانگێك دەخایەنن، دووهەمیان بەرنامەی ئەکادیمیی ئاساییە، ئەوەی ببێ بە خوێندکار تیایدا پلەیەکی زانستیی دەدرێتێ لە بواری رۆژنامەگەری یا لێکۆڵینەوەی تایبەت بە بواری راگەیاندنی جەماوەریدا. هەندێ لەم بەرنامانە دیاریکراون بۆ خوێندنی ئەو رۆژنامەنووسانەی کار بۆ حکومەت دەکەن.

ئاشکرایە بەرنامە چڕوپڕو کورتخایەنەکان زیاتر ئەو رۆژنامەنووسانە رادەکێشن کە تەمەنێکیان بردووەتە سەر لە ژیانی رۆژنامەوانیدا. ئەو بەرنامانەی تر کە چوار تا پێنج ساڵ دەخایەنن، ئەوە بە زۆری گونجاوترن بۆ ئەو کەسانەی کە تازە دەچنە جیهانی رۆژنامەنووسییەوەو پابەندبوونێکی کەمیان هەیە بەرامبەر بە کارو خێزانەکانیان. هەندێ لەم بەرنامانە بڕوانامەو پلەی دەرچووی زانکۆ دەبەخشن بە خوێندکارەکانیان بە پێچەوانەی هەندێکی تریانەوە.

لە ماوەی ئەم چەند ساڵانەی دواییدا، هەل رەخساوە بۆ سەدان کەس لە رۆژنامەنووسەکانی جیهانی سێهەم لە دەرەوەی وڵاتەکانی خۆیاندا بۆ بینینی خولی راهێنان کە لەلایەن رێکخراو یا حکومەتە (بێگانە)کانەوە ساز کراوە بۆیان، زۆرجاریش ئەم خولانە خۆڕایین. ئەو دەزگایەی رۆژنامەنووسەکە کاری بۆ دەکا، یا حکومەتی وڵاتەکەی، یا ئەو لایەنەی سەرپەرشتیی بەرنامەکە دەکا کەسانێك هەڵدەبژێرن بۆ بەشداربوون لە خولەکاندا. گەلێك لە دەوڵەتەکان چالاکی دەنوێنن بە تایبەت بۆ راهێنانی رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم. ئەم دەوڵەتانە بریتین لە ئەمریکاو یەکیەتیی سۆڤیێتو بەریتانیاو هەندێ لە دەوڵەتەکانی ئەوروپای رۆژهەڵات. هەروەها گەلێك ناوەندو سەنتەری بەناوبانگی تایبەت هەن لە راهێنانی رۆژنامەوانیدا، لە ئەمریکای لاتینو ئەفریقیاو ئاسیادا. کاتێك بیر لەوە دەکەیتەوە بەشداری بکەیت لە خولێکی راهێنان لە دەرەوەی وڵاتدا، دەبێ زۆرباش ئەوە بزانی کە تۆ پەیوەندی بە بەرنامەیەکی راهێنانەوە، کە چەند بەهایەکی کەلتووری، سیاسی، ئابووریی جیاواز رەنگ دەداتەوە لەو بەرنامەیەدا.

هەروەها دەبێ ئەوەش بزانی کە تۆ (ژەمە خواردنێکی خۆڕاییت) نادرێتێ. چونکە زۆربەی ئەو بەرنامانە بەتەمای ئەوەن یارمەتیت بدەن بۆ ئەوەی ببی بە

رۆژنامەنووسێکی کارامەو لێهاتوو. بەڵام ئەو لایەنانەی سەرپەرشتیی زۆرێك لەو بەرنامانە دەکەن، بەتەمای ئەوەن تۆ بەرنامەکە تەواو بکەیتو بووبیت بە دۆستێ بەلای کەمەوە بۆ ئەو دەزگا، یا ئەو حکومەتەی بەرنامەکە دەبات بەڕێوە. کار گەیشتووەتە رادەیەك هەندێ لەو بەرنامانە هەوڵی ئەوە دەدەن رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم فێری هەندێ بیروبۆچوونی تایبەتو تیۆریی دیاریکراو بکەن، بۆ ئەوەی ئەو رۆژنامەنووسانە بەهای سیاسیو کەلتووری رێکخراوەکە، یا ئەو دەوڵەتەی سەرپەرشتیی بەرنامەکە دەکا وەرگرن.

چەند مەترسییەکیش هەن لە پەسەندکردنو بەشداریکردن لەو خولانەی راهێناندا کە رێکخراوەکان یا حکومەتە بیانییەکان سازی دەدەن. ئەگەر تۆ خولێکی راهێنانی خۆڕایی، یا ئەو خولەی کە بودجەکەی لەلایەن حکومەتێکی بیانییەوە دابین دەکرێت، پەسەند بکەیت، ئەوە دەتوانیت دڵنیا ببی لەوەی کە ئەو لایەنەی سەرپەرشتیی خولەکە دەکا، بەلای کەمەوە بەتەمای ئەوەیە کە تۆ رازیو ئاسوودە بیو بیروبۆچوونێکی لایەنگرانەت هەبێ بەرامبەر بەو دەوڵەتەی سەرپەرشتیی راهێنانەکە دەکا. رەنگە لە خراپترین حاڵەتدا خۆت ببینیتەوە پاش ئەوەی تووشی (مێشك شۆران) دەبێت، کارەکانت بە شێوازی ئەو حکومەتە یا دەزگایەی سەرپەرشتیاریی خولەکە ئەنجام بدەی.

ئاشکرایە کە گەنجەکانی جیهانی سێهەم لە زووەوە ئەوەیان بۆ دەرکەوتووە کە ژمارەیەکی زۆر کەم هەن دەستی یارمەتییان بۆ درێژ بکەن بە بێ ئەوەی مەبەستێك لە پشتییەوە بێت. بۆ نموونە گەنجەکان لە گەلێك لەو دەوڵەتانەدا، ئەوەیان بۆ روون بووەتەوە کە تەنانەت ئەو خوێندنگەیانەی پیاوانی مەسیحی دەیانکردەوە، بەرامبەر بە نرخێك بوو ئەویش بریتی بوو لە باوەڕهێنان بە ئایینی مەسیحی، بەڵام ئەو گەنجانە حەزیان لەوە دەکرد تەنیا پارە بدەن بەرامبەر بەو خوێندنەی بۆیان فەراهەم کراوە. ئەگەر دەرکەوت ئەو کەسانەی کە دەیانگوت مەبەستی سەرەکیمان خۆشەویستیی خواو کارکردنە لەپێناوی ئەودا، لەگەڵ ئەوەشدا مەبەستی تریان هەبوو لە پشتییەوە، ئیتر بۆ سەرمان سوڕ بمێنێ ئەگەر حکومەتەکان یاخود رێکخراوەکان کە زیاتر مەبەستیان پارەیە، ئەو رێگەیە بگرنەبەر؟.



بەڵام تێگەیشتن لەوەی کە هەموو شتێك نرخێکی هەیە، مانای ئەوە نییە کە رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم، دەبێ ئەوە رەت بکەنەوە ئەگەر هەلیان بۆ رەخسا لە خولێکی راهێناندا بەشداری نەکەن لە دەرەوەی وڵاتەکەی خۆیاندا. ئەو رۆژنامەنووسەی دەیەوێ بەشداری بکا لەو خولی راهێنانەدا کە رێکخراوێك یا دەزگایەکی بیانی بۆی فەراهەم دەکا، دەبێ هەموو کاتێك ئەو پرسیارە بکا ئەو خولی راهێنانە تا چ ئەندازەیەك گونجاوە لەگەڵ بارودۆخی وڵاتەکەیدا، رەنگە ئەو خولە زۆر سوودمەند بێ، بەڵام دەبێ زیادەڕەوی نەکاو بە کارێکی پیرۆزی دانەنێ هەر لەبەر ئەوەی (لە دەرەوەی وڵاتەو بیانییە).

لەسەر رۆژنامەنووسانی جیهانی سێهەم پێویستە ئەوە بزانن کە هەندێك لەو خولی راهێنانانە، رەنگە بە شێوەیەکی راستەوخۆ نەگونجێن لەگەڵ بارودۆخی جیهانی سێهەمدا. بەڵام ئەگەر ئێمە ئەم خاڵانە لە بەرچاو بگرین، فێربوون یا خۆڕاهێنان لە بواری رۆژنامەوانیدا لە وڵاتانی دەرەوە، رێی تێدەچێ زۆر سوودمەندو بەکەڵك بێ لە زۆر حاڵەتدا، ئێمە هەندێ جار نرخی وڵاتەکەی خۆمان نازانین یا کەلتووری نیشتمانیمان بە بێبایەخ سەیر دەکەین، تا ئەو کاتەی ناچار دەبینو دەچینە وڵاتێکی تر، زۆرجار دەتوانین لەو چوونە دەرەوەیەدا هەندێ بیرۆکەی نوێ فێر ببینو تەکنۆلۆژیای تازە بەکاربێنین کە دەتوانن یارمەتیمان بدەن پاش ئەوەی دەگەڕێینەوە بۆ وڵاتی خۆمانو بۆ کاری خۆمان.

یەکێك لەو هۆیانەی کە لە رێگەیانەوە دەتوانیت زانیاریی نوێ بەدەست بهێنیت لە بواری راهێنانی رۆژنامەوانیدا، گفتوگۆکردنە لەگەڵ هاوکارەکانت لە بواری راگەیاندندا، چونکە زۆر رێی تێدەچێ کە هەندێك لەوانە خولی راهێنانیان بینیبێت لە پەیمانگەیەکی گەورەدا لە وڵاتەکەی خۆت، یاخود رەنگە بەشدارییان کردبێت لەو خولی راهێنانەدا کە رێکخراوەکان یا حکومەتە بیانییەکان سازی دەکەن. ئەو هاوکارانەی تۆ دەتوانن زانیاریت بدەنێ لەسەر چۆنیەتیی پەیوەندیکردن بەو لایەنانەوەو زانیاریی زیاتریان لێوەربگری، هەروەها زۆرجار دەتوانن پێت بڵێن کە کام رێگە باشترە بۆ پێشکەشکردنی داواکاری بۆ بەشداریکردن لە خولی راهێناندا، چونکە ئەوان بە سەرکەوتوویی ئەم قۆناغەیان پێشتر بڕیوە.

چەند رێگەیەکی تریش هەن بۆ دەسکەوتنی زانیاری دەربارەی فێربوونو راهێنانی رۆژنامەگەری، یەکێك لەوانە ئەوەیە بچیتە نزیکترین پەیمانگەی راهێنانو قسە لەگەڵ خوێندکارەکاندا بکەی، هەروەها لەگەڵ ئەو مامۆستایانەدا کە لەوێ کار دەکەن، دەتوانی لەوانەوە زانیاریی تەواو وەربگری لەسەر بەرنامەی راهێنان، دیارە چەند زانیاریی تریشیان لایە لەسەر چالاکییەکانی تر لە بواری راهێناندا.

لە هەمان کاتدا باڵیۆزخانەو کونسولگەرییە بیانییەکان بە سەرچاوەیەکی تری باش دادەنرێن بۆ وەرگرتنی زانیاری لەسەر بەرنامەکانی راهێنانی رۆژنامەوانی، لەنێو ئەو باڵیۆزخانانەی بە چاکی دەتوانن ئەو زانیارییانەت بۆ دەستەبەر بکەن، باڵیۆزخانەکانی فەرەنسا، یەکیەتیی سۆڤێت، چین، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، یۆگوسلافیا، بەریتانیا، کەنەدا. هەندێك لەم باڵیۆزخانانە، ناوەندی رۆشنبیریو خوێندنیان تێدایە لەم بوارەدا.

هەندێ لە حکومەتەکان راستەوخۆ سەرپەرشتیی خولەکانی راهێنان دەکەن، یا بە دووقۆڵی لەگەڵ حکومەتی وڵاتەکەتدا کە خولەکە دەکرێتەوە بۆ خوێندکارەکانی. لەو هەوڵە زیاد لە رادەیەی دەدرێ لەم بوارەدا، ئەو هەوڵەیە کە (پەیمانگەی پەیوەندیی نێوان رۆژهەڵاتو رۆژئاوا) دەیدا لە (ناوەندی رۆژهەڵاتو رۆژاوا) لە هۆنۆلولو — هاوای — ئەمریکا. ئەم سەنتەرە بە شێوەیەکی سەرەکی لەلایەن ئەمریکاوە بودجەی بۆ دابین دەکرێو دەوڵەتانی (باسیفیك)یش هاوکاریی ئەمریکا دەکەن لەو بارەیەوە، هەموو ساڵێك چەندەها رۆژنامەنووس لەو ناوچەیەدا خولی راهێنان دەبینن لە سەنتەرەکەدا. ئەمەش لە رێگەی بەخشینی مۆڵەتی خوێندن بەو خوێندکارانەوە.

دەبێ ئەو بەرنامانەی فێربوونو راهێنانە لەیاد نەکەین کە کۆلێژو زانکۆ جیاجیاکانی هەموو گۆشەیەکی جیهان دەیکەنەوە. هەندێ لەم خولو بەرنامانە پەیمانگە دەوڵەتییەکان دەیکەنەوەو هەندێکی تریشیان چەند دەزگا تایبەتەکان. زۆربەی ئەم بەرنامانە بوار دەڕەخسێنن بۆ خوێندکارەکانیان بەردەوام بن لە خوێندندا تا پلەو بڕوانەمە وەردەگرن، ئەمەش چەند ساڵێك دەخایەنێ. لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی زۆر هەن لەو دەزگایانەی تایبەتمەندن لە رێکخستنی چەند بەرنامەیەکی



راهێنانی کورتخایەن کە لە چەند خولی خوێندنەوە دەست پێدەکا تا وەرگرتنی دەرسی تایبەت. هەندێ جار ئەو دەزگایەی سەرپەرشتیی بەرنامەکان دەکا، رێگەی ئەوەت بۆ ئاسان دەکا کە مۆڵەتی خوێندن وەربگری لە پلەیەکی باڵادا. هەروەها دەتوانی ئەو مۆڵەتی خوێندنە بەدەست بێنی بەهۆی ئەو دەزگایەوە کە کار دەکەیت لای، یا لە رێی حکومەتی وڵاتەکەتەوە. زۆرێك لەم بەخشینی مۆڵەتی خوێندنە کرێی هاتوچۆو خەرجیی بژێوی دەگرێتەوە لەگەڵ کرێی خوێندندا ئەگەر بە رێکوپێکی خەریکی خوێندنەکە بی. لە کۆتاییدا وەزارەتی راگەیاندنی وڵاتەکەی خۆت رەنگە زانیاریی هەبێ لەسەر بەرنامەی ئەو راهێنانەی لە دەرەوەی وڵاتدا هەیە.

## ناوی هەندێ لە پەیانگەکانی راهێنانی رۆژنامەوانی لە جیهاندا:

Short-Term Emphasis Programs

These are usually not offered for academic credit and emphasize practical work to improve reporting or other journalistic skills.

The Institute of Culture and Communication, East-West Center, 1777 East-West Road, Honolulu, Hawaii, USA 96848. (Note: Workshops and seminars sponsored by the Culture and Communication Institute emphasize participation by persons from Asian or Pacific area countries. In a few cases, participants come from other areas).

The Center for Foreign Journalists, 11690-A Sunrise Valley Dr., Reston, Va., 22091, USA.

Centro Internacional de Estudios Superiores de Comunicacion para America Latina (CIESPAL), Almagro y mainly for journalists in the Americas).

Centre Africain de Perfectionnement des Journalistes et des Communicateurs, 9, Rue Hooker Doolittle, 1002 Tunis, Belvedere, Tunisia. (Note: This is a relatively new advanced training center connected with the Tunisian Ministry of Information. Some training programs are offered in French and Arabic and occasionally in English).

John S. Knight Fellowships, Department of Communication, Stanford University, Stanford, California, USA 94305. (Note:



Fellowships are offered for a summer program for practicing journalists. Journalists from throughout the world are eligible).

Henry W. Grady School of Jurnalism and Mass Communication, the University of Georgia, Athens, Georgia, USA 30602. (Note: Both short-term, non-credit, individual tutorials and training programs are offered to foreign journalists as well as rigular master’s degree and undergraduate work. Contact Dr. Al Hester). No scholarships are available for these programs. Contracts are worked out with indiveduals or their institutions or agencies.

International Journalists’ Training Course, Thomson Foundation Editorial Study Centre, Cardiff, Wales, England.

Transnational Communications Center, the Media Institute, 3017 M Street N. W., Washington, D.C. 20007 (Note: Conducts education programs for foreign journalists and communication specialists).

International Organization of Journalists, Parizska 9, 11001 Prague 1, Cxechoslovakia. (Note: Sponsors a number of training programs and is also a source of information about training programs in Eastern European countries).

The Indian Institute of Mass Communication, D-13 South Extension Part II, New Delhi, India.

Long-Term Emphasis Programs

Many of these programs carry academic credit and last for a year or more. Sometimes scholarships are available. Some of these schools may also offer shorter-term programs.

School of Journalism, University of Missouri, Columbia, Missouri, USA 65205. Undergraduate and graduate work.

School of Journalism and Mass Communication, University of Wisconsin, Madison, USA 53706. Undergraduate and graduate work.

School of Communication, University of Washington, Seattle, Washington, USA 98195. Undergraduate and graduate work.

Department of Journalism, University of Texas at Austin, Austin, Texas, USA 78712. Undergraduate and graduate work.

School of Journalism and Mass Communication, University of Minnesota, Minneapolis, Minnesota, USA 55455. graduate and Undergraduate work.

Graduate School of Journalism, Columgia University, New York, New York, USA 1027. graduate work only.

The American University, Journalism Department, Cairo, Egypt.

Institute of communication, Cairo University, Cario, Egypt.

Kenya Institute of Mass Communication, Ministry of Information and Broadcasting, P.O. Box 42422, Nairobi, Kenya.

Hong Kong Baptist College, Department of Commun-ication, 224 Waterloo Road, Kowloon, Hong Kong.

Osmania University, Department of Journalism, Osmania University Campus, Hyderabad 500007, India.



Sophia University, Faculty of Letters, Department of Communication, 7 Kioicho, Chiyoda-ku, Tokyo, Japan.

Australian Association for Tertiary Education in Journalism, Mitchell College of Advanced Education, Bathurst, New South Wales, Australia. (Note: Can furnish information on individual schools offering journalism programs).

The journalism Faculty, Moscow University, Prospekt Marxa 20, Moscow, USSR.

Department of Mass Communications, University of Salzburg, Sigmund Haffner Gasse 183, A-5020 Salzburg, Austria.

Latin American Institute for Transnationl Studies, Apartado 85-025, Mexico 20, D.F., Mexico. (Advanced Training).

# کۆتایی

## چۆنیەتیی هەواڵ وەرگرتن

هەندێ لە رۆژنامەنووسە گەنجەکان حەز دەکەن بزانن چۆن دەتوانن هەواڵ وەربگرن، لە خوارەوە هەندێ ئامۆژگاریو رێنومایی چەند رۆژنامەنووسێکی خاوەن ئەزموونی چەندەها ساڵتان پێشکەش دەکەین:

١) خۆت حەز بکە بگەڕێیت بە دوای هەواڵو رووداودا، چونکە ئەگەر ئەو (خولیا)یەت نەبوو هیچ کاتێك نابی بە رۆژنامەنووسێکی سەرکەوتوو. ئەگەر هەموو کاتێك نەپرسی لە هۆی روودانی هەر هەواڵێك ئەوە هیچ خێرت تیا نییە. نەك هەر ئەوە بەڵکو شێوازی نووسینو دارشتنی جوان بە پلەی دووهەم دێت لە دوای ئارەزووی تێگەیشتن لە ناوەرۆکی رووداوەکان.

٢) لە نووسینگەکەت زۆر دامەنیشەو بچۆرە دەرەوە. هەواڵەکان خۆیان نەشاردووەتەوە لە پشتی ئامێری ئاو ساردکەرەوەی ژوورەکەتدا، برێکی زۆرکەم نەبێت هەواڵت دەست ناکەوێت ئەگەر هەر لە ژوورەکەی خۆت دانیشیو رۆژنامە بخوێنیتەوەو وشە تێهەڵکێشکراوەکان هەڵبێنی.

٣) لە سەرچاوەی هەواڵەکەت مەپرسە (چ شتێکی تازە هەیە؟)، چونکە بۆ ئەوان هەواڵی تازە نییە بەهۆی کارە روتینییەکانیانەوە. ئەوانە ئاگایان لە هیچ هەواڵێکی تازە نییە ئەگەر داباریێ بەسەریشیاندا (زۆربەیان لەو بابەتەن)، خۆت وا دابنێ کە (راوچییەکی هەواڵی راهێنراویت).

٤) گفتوگۆ بکە لەگەڵ خەڵکێکی زۆری جۆراوجۆردا، باش گوێ راگرە بۆ ئەو قسانەی دەکرێن لە چاخانەو کۆڕو کۆبوونەوەکاندا.

٥) ئەو بڵاوکراوانە بخوێنەرەوە کە تایبەتن بە بەدواداچوونی هەواڵ ئەگەر دەستت بکەوێت، ئەگەر تواناشت هەبوو، یەکێك یا دوان لەو بڵاوکراوانە بکڕە، ئەگەر لەسەر دەسەڵاتداری ناوخۆشت بنووسیت — بۆ نموونە — لەوانەدا بنووسە کە سەر بەوانن چونکە بەرپرسانی حکومەت ئەوانە دەخوێننەوە.

٦) بەردەوام ئامادەبە لە ئاهەنگی دیبلۆماتەکانو پێشوازیکردندا، چونکە لەو جۆرە بۆنانەدا شتی زۆر دەبیستی.



٧) ئەو رۆژنامەیە بخوێنەرەوە کە کاری تێدا دەکەیت، چونکە زۆر رۆژنامەنووس حەز لە خوێندنەوەی ئەو بابەتانە ناکەن کە خەڵکی تر دەیاننووسن. تەمەڵو تەوەزەل مەبە، هەموو کاتێك ئاگاداری رووداوەکان بە لە رۆژنامەکەتدا. هەموو رۆژنامەنووسێك دەبێ ئەو رۆژنامەیە بخوێنێتەوە کە کار دەکا تیایدا. ئەگەر بۆی کرا رۆژنامەکانی تریش بخوێنێتەوە.

٨) هیچ دوودڵ مەبە لە (دزینی) بیرۆکەو هەواڵ لەو رۆژنامانەوە کە لە وڵاتانی تر دەردەچن، یا ئەو رۆژنامانەی تر کە لە وڵاتەکەی خۆتدا دەردەچن چونکە ئەوەی پێی دەگوترێ مافی بڵاوکردنەوە بیرۆکە ناگرێتەوە، ئەو مافە تەنیا پەیوەندیی هەیە بە شێوازی دەربڕینو گوزارشکردنەوە. تۆ هەموو کاتێك دەتوانی (بەرگێکی ناوخۆییانە) بکەیتە بەر چیرۆکە هەواڵێك ئەگەر بزانی گونجاوە لەگەڵ ئەو ناوچەیەدا کە تیایدا دەژیت.

٩) بەیانو بڵاوکراوەکانی حکومەت بخوێنەرەوە، هەرچەند بێزاریش بیت لێیان، چونکە هەندێ بابەتیان تێدایە بەکەڵکی ئەوە دێن بکرێن بە چیرۆکە هەواڵ.

١٠) بەردەوام سەیری تەلەفزیۆن بکەو گوێ لە رادیۆ بگرە، چونکە هۆکانی راگەیاندن ناوبەناو چیرۆکە هەواڵی باش بڵاو دەکەنەوەو دەتوانی بە هەندێ دەستکارییەوە بڵاویان بکەیتەوە.

١١) گوێ رابگرە لە هەواڵو بەرنامە بیانییەکان لەسەر شەپۆلی کورت چونکە ئەو هەواڵو بەرنامانە رۆشنبیریت زیاد دەکەنو مەودای زانیاریت زۆرجار زیاد دەکەن.

١٢) فایلێك هەڵبگرە بۆ زانیارییەکانت، چونکە ئەو فایلە دەبێتە هۆی چالاککردنی مێشکتو پاڵت پێوە دەنێ بۆ بیرکردنەوە لە هەندێ رووداو کە پێویستیان بە بەسەرکردنەوە هەیەو دەبێتە مایەی رەزامەندیی سەرنووسەرو وەك رۆژنامەنووسێکی رێکوپێك سەیرت دەکرێ ئەگەر فایلێکت هەبێ، ئەوەی لە داهاتوودا دەیکەیت تیایدا نووسرابێ.

١٣) بەردەوام پەیوەندیت هەبێ لەگەڵ سەرچاوەکانی هەواڵەکانتدا، ئەوان متمانەیان زیاتر دەبێ پێت ئەگەر زۆر چاوت پێیان بکەوێت (مەگەر خۆت لەو جۆرە کەسانە بیت کە جێگەی بڕوا نین، لەم حاڵەتەشدا چەندە بچیتە لایان ئەوەندە بڕوایان پێت نامێنێ).

١٤) بەردەوام هاتوچۆی باڵیۆزخانە بیانییەکان بکە بە تایبەت ئەو بەرپرسانەیان کە پەیوەندییان هەیە بە راگەیاندنو بواری رۆژنامەوە، هەوڵی ئەوە بدە راستەوخۆ قسەیان لەگەڵدا بکەیت ئەگەر پەیوەندیی بە کارەکەتەوە هەبوو.

١٥) خاوەنکارو سەرمایەدارەکانیش مەخەرە پشتگوێ، چونکە ئەوانە ئیشەکانیان وا دەخوازێ کە ئاگاداری هەموو رووداوەکان بن ئەگەر بیانەوێ بەردەوام بن لە کارەکانیاندا.

١٦) با سەرچاوەیەکی هەواڵت هەبێ لە فڕۆکەخانەو بەندەرەکاندا، چونکە ئەوانەی لەو جۆرە شوێنانەدا کار دەکەن، ئاگاداری هاتوچۆی کەسانی گەورەو گرنگن. با پەیوەندیت لەگەڵ کۆمپانیاکانی فڕۆکەوانیو بەندەرە دەریاییەکاندا پەیوەندییەکی دۆستانە بێ.

١٧) هەندێ کاتی خۆت لەناو بازاڕدا ببەرەسەر، چونکە ئەوە پێویستە بۆ شارەزابوونو ئاگاداربوون لە قسەو بیروبۆچوونە جیاجیاکانی خەڵك، ئەو شارەزاییەت دەست ناکەوێت بە تەنیا قسەکردن لەگەڵ لێپرسراوێکی بیرۆکراتی یا دانیشتن لە شوێن دانیشتنی رۆژنامەنووساندا.

١٨) هەوڵ بدە گەلێك زمانو زاراوە فێر ببیت، ئەگەر دانیشتوانی وڵاتەکەت بە چەند زمانو زاراوە قسەیان دەکرد، چونکە ئیتر ناچار نابیت ئەگەر ویستت زانیارییەکت دەست بکەوێت پەنا بەریتەبەر کەسانی تر.

١٩) لەگەڵ هاوکارەکانتدا گفتگۆ بکە، چونکە تۆ بەهۆیەوە دەتوانی ناوبەناو بیرۆکەیەك بەدەست بهێنی بەکەڵکی چیرۆکە هەواڵێك بێت.

٢٠) ناسراوی پەیدا بکە لەگەڵ هەندێ لە مامۆستایانی زانکۆو پیاوانی کاربەدەستو هاتوچۆیان بکە، بۆ ئەوەی بزانی چی روو دەداو چی دەڵێن، چونکە ئەوانە جاروبار هەواڵی باشیان لایە.

٢١) ئەوە بزانە کە چاوت دەکەوێ بە سەرچاوەی هەواڵ وەنەبێ هەموو جارێك هەواڵێکت چنگ بکەوێ. باشتر ئەوەیە هەندێ کاتی خۆت بەسەربەری لەگەڵیاندا بۆ ئەوەی بزانی چی گرنگە بەلایانەوەو چی دەیانهێنێتە قسەکردن، چونکە ئەوە دەبێتە هۆی هەواڵ دەستکەوتن لێیانەوە لە داهاتوودا.

٢٢) بکەوەرە چەنەبازیو قسەکردن لەگەڵ سیاسییو بەرپرسەکاندا، چونکە زۆربەی ئەوانە حەز دەکەن بیروڕای خەڵك ببیستن لەسەر خۆیان، هەروەها بڕێکی باش زانیارییان لێوەردەگریت.

٢٣) هەندێ کات تەرخان بکە بۆ پیاسەو سووڕانەوە بەناو شارو ئەو ناوچەیەدا کە تێیدا دەژیت، بە وردی سەیری ئەو شتانە بکە کە روو دەدەن. گەڕان بە ئوتومبێل بەکەڵکی ئەو مەبەستە نایەت. هەوڵ بدە باش شارەزا ببیت لەو کۆمەڵگەیەی تێیدا دەژیتو خۆت گۆشەگیر مەکە لێی.

٢٤) هەوڵی ئەوە بدە ناوبەناو بە تەنیا خۆت دانیشی بۆ (بیرکردنەوە)و هەندێ کاغەزت لە بەردەستابێ بۆ نووسینی ئەو شتانەی دێن بە خەیاڵتدا، رێی تێدەچێ لەو بیرۆکانە چیرۆکە هەواڵێك پێکبهێنیت، ئەو



کاتەی کە لەو تەنیاییەدا دەیبەیتە سەر وەك ئەو کاتە نییە کە بە داڵغەلێدان دەیبەیتە سەر، چونکە هەندێ بیرۆکەی باشت لا دروست دەکات.

٢٥) ئەوەت لەیاد بێ کە سەرنووسەرەکان رۆژنامەنووسێکیان خۆش دەوێت، توانای ئەوەی هەبێت بێئەوەی پێی بگوترێ خۆی بجوولێو بابەتو بیرۆکەی پێببێت، ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە خۆیان بە زەحمەت دەتوانن بگەڕێن بە دوای ئەو مەبەستەداو ئەگەر تۆ ئەو کارئاسانییەت بۆ کردن باوەشت بۆ دەگرنەوە.

# سەرچاوەکان

NOTE: The following reaings have been selected with an eye to what might be of help to practicing journalists. These books should help you to improve your skills and understanding of journalism and mass communications. All were in print at the time of compilation. Prices are not included, since these are subject to frequent change.

Agee, Warren, Philip H. Ault and Edwin Emery, Introduction to Mass Communications (Silver Anniversary ed.) (New York: Harper and Row, 1985). The oldest and one of the best books to give you an overview on the whole field. Available in English, French, Spanish and Portuguese.

Callihan, E.L., Grammar for Journalists (Philadelphia, Pa., USA: Chilton, 1980). An excellent overview of English grammar for those who need extra help.

Dominick, Joseph R., and Roger D. Wimmer, Mass Media Research (Belmont, Calif., USA: Wadsworth, Inc., 1983). A good review on how to use research in the mass media. Handy for journalists who need to know more in this area.

Izard, Ralph S., Hugh M. Culbertson and Donald A. Lambert, Fundamentals of News Reporting, (4th ed.) (Dubuque, Iowa, USA: Kendall-Hunt, 1983). One of the most practical and easy to understand of the American reporting texts.

Jendoiubi, Mehdi, Journalisme de'Agence: Journalisme de Base (Tunis, Tunisia: Institut de Presse et des Sciences de 1'Information, 1984). An excellent book on news agency reporting and editing. In French.

Kivikuru, Ullamaija, and Tapio Varis, eds., Approaches to international Communication (Helsinki, Finnich National Commission for UNESCO 1986).

Metzler, Ken, Creative Interviewing (Englewood Cliffs, N. J., USA: Prentice-Hall, 1977). The best book on interviewing techniques available. Easy to understand and use.

Nelson, Roy Paul, Articles and Features (Boston, Mass., USA: Houghton-Mifflin, 1978). A good book on magazine and feature writing, but emphasizing free-lance in US applications.

Reintjes, J. Frances, Copy-Processing Systems for Small Newspapers (Canbridge, Mass., USA: Massachusetts Institute of Technology, 1979).

Rivadeneira Prada, Raul, Periodismo (Mexico City, Mex.: Editorial Trillas, 1977). Gives both practical and theoretical understanding of journalism. In Spanish.

Rivers, William L., Magazine Editing in the `80s (Belmont, Calif., USA: Wadsworth Publishing, 1983). One of the best in its field.

Rosen, Marvin J., Introduction to Photography: a Self-Directing Approach (Boston: Houghton-Mifflin, 1976). An excellent, practical guide to being a photographer.

White, Ted, et al., Groadcast News Writing, Reporting, and Production (New York: Macmillan, 1984).



د. وارين ك. آجي: أستاذ الصحافة بجامعة جورجيا الأمريكية، ويتمتع بخبرة مهنية امتدت لسنوات طويلة.

جاك لول: مدرس مساعد للاتصال بجامعة تولسا، بتولسا – أوكلاهوما. ويقوم حالياً باستكمال دراسته لنيل درجة الدكتوراه.

محمود عبدالعزيز: صحفي مهتم بالبيئة والعلوم بجريدة الأهرام، القاهرة – مصر، ومعروف بتحقيقاته المتعمقة.

إديث إنكوازيما: كاتبة بوكالة أنباء نيجيريا، ولديها خبرة عملية واسعة في مجال التغطية الإخبارية.

د. جيم ريتشستاد: أستاذ للصحافة بجامعة أوكلاهوما، نورمان، أوكلاهوما، وله خبرة واسعة في تدريب الصحفيين القادمين من دول آسيا والباسفيك والشرق الأوسط.

د. فيرنون أ. ستون: أستاذ الصحافة بجامعة ميسوري الأمريكية – كولومبيا، ولديه خبرة واسعة في الإذاعة.